# مێژوو ٧

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە.
کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی
کوردستان دەریدەکات



ناوی نوێنەرانی لیوای هەولێر لەئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی لەسەردەمی شایەتی (١٩٢٥ — ١٩٥٨)
نازدار جلیل
سوپای ئینکیشاری و کاریگەری لەسەر بەهێزبوون و لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی
کەنار مستەفا ، زەمەند مەحمود
ئەزمونی دیموکراسی لە کوێت لەماوەی ساڵانی ١٩٦١ ـ ١٩٧٥
م. شوان محمد امین خۆشناو
الاستشراق والمستشرقون فی کتابات محمد کرد علي
د.دلێر فرحان اسماعیل
الشريف حسين بن علي و الثورة العربية الكبرى ١٩١٦ ـ ١٩١٨
شهاب احمد رحمن

ژماره 20
ساڵی پێنجەم
پایزی 2011

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات



ژمارە (٢٠) سالی پێنجەم پایزی ٢٠١١



KURDISTAN HISTORICAL CULTURAL ASSOCIATION

جمعية الثقافية التاريخية لكردستان



**هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بلاودەبنەوە نوسەرەکانیان لێیان بەرپرسیارن تەنیا سەروتار نەبێت کە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە**


گۆڤار : مێژوو

ژمارە : (٢٠)

تیراژ : (٥٠٠) دانە

چاپخانە : رۆژهەلات



کوردستان / هەولێر   کۆلانی بەرامبەر بەرێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست


◂ سەروتار

دوای (٩٠)ساڵ

◂ توێژینەوە

| ئەزمونی دیموکراسی لە کوێت لەماوەی ساڵانی ١٩٦١ — ١٩٧٥ | م. شوان محمد امین خۆشناو | ٩ |
|---|---|---|
| پەیوەندی نێوان ئەمریکا ـ میسر ١٩٥٢ - ١٩٥٦ | هیوا حەمید شریف | ٣١ |
| سوپای ئینکیشاری و کاریگەری لەسەر بەهێزبوون و لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی | کەنار مستەفا رسول | ٥٣ |
| کورتیەکا مێژوویی ل سەر مالباتا بەدرخانیان | بێوار ئدریس دەحلێنەوی | ١٢٣ |
| سەرەتاکانی شەڕی سارد | فهمی جلال کریم | ١٣٣ |
| ئەلقاسب میرزای سەقەوی و سورخاب بەگی ئەردلان | ناوێستا رەوەند | ١٦٩ |

◂ وەرگێڕان

| محمود شوکت | وەرگێڕانی د. محمد عبدالله کاکەسوور | ١٩١ |
|---|---|---|
| قاهیرە | وەرگێڕانی د. محمد عبدالله کاکەسوور | ١٩٧ |

◂ القسم العربي

| الاستشراق والمستشرقون في كتابات محمد كرد علي | د.دلير فرحان اسماعيل | ٢٠٣ |
|---|---|---|
| أصول تسميات القرى في ديالى | د. عماد عبد السلام رؤوف | ٢٢٩ |
| لقاء مع المؤرخ ا. م. د. احمد عبدالعزيز محمود | اجرى اللقاء : د. محمد عبدالله كاكه سوور | ٢٤٧ |
| الشريف حسين بن علي و الثورة العربية الكبرى ١٩١٦ ـ ١٩١٨ | شهاب احمد رحمن | ٢٥٣ |

## ◀ کەشکۆڵی گۆڤار


| | | |
|---|---|---|
| چەند لاپەرەیەك لە مێژووی شاری مەخمور | نووسینی: م. قادر عمر علی | ٢٨١ |
| لایەنە باش و خراپەکانی مێژوومان | د. محمد عبدالله کاکەسوور | ٢٨٩ |
| بەهەشتی شوکور مستەفا لەچەند نامەیەکدا (بەشی سێیەم) | د. حسن جاف | ٢٩١ |
| چاوپێکەوتن لەگەڵ مێژوو نووس م. کامەران محمد حاجی | ئامادەکردنی : د. محمد عبدالله کاکەسوور | ٣٠٧ |
| بامەرنێ و کەڤنترین بنەماڵ(مالا محێ) | کارزان محمد حسین بامەرنی | ٣١١ |
| پرسیار و وەڵام | ئامادەکردنی : د. محمد عبدالله کاکەسوور | ٣٢٩ |
| میرنشینی سۆران | بەیار نادر | ٣٣٥ |
| ناوی نوێنەرانی لیوای هەولێر لەئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی لەسەردەمی شایەتی (١٩٢٥ — ١٩٥٨) | ئا: نازدار جلیل | ٣٤٥ |
| ئینسایکلۆپیدیای کوردستان .. ئاواتێکە | پ.د. وریاعومەر ئەمین | ٣٤٧ |
| چالاکییەکان | | ٣٥٤ |
| کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان ٢٠١١/٧/٢٧ | | ٣٥٦ |
| م. قادر عمر علی لە سەردانێکی بۆ شوێنەوارەکانی وڵاتی ئوردن | | ٣٦٧ |

# دوای ( ٩٠ ) ساڵ

سەرنووسەر

دەوڵەتی عێراق لەساڵی ١٩٢١ دامەزرا. واتەئێستا لەساڵی ٢٠١١ دا (٩٠) ساڵ بەسەر دامەزراندنی دەوڵەتەکە داتێ پەریوە چوارسەدە لەژێر دەسەلاتی عوسمانییەکان بوو، ماوەی ئینتیدابی بریتانی لەسەر عێراقیش ١٩٢٠ – ١٩٣٢ بوو. ئێستا بارودۆخی عێراق و ئایندەکەی زۆر روون نییە، مەترسی هەیە لەسەر یەکێتی خاکی ولاتەکە وەکو دەوڵەتێکی یەکگرتوو. لەسەرەتای سییەکان دا شا فیصل ی یەکەم بێ ئومێدی خۆی پیشان دابوو کەنەتوانراوە شتێك بەناوی گەلی عێراق دروست بکرێت، ئێستاش بارودۆخەکە زۆر لەسەرەتای سییەکان باشترنییە و لەوانەیە لەهەندێك لایەنەوە خراپتریش بێ.

لەسالآنی ١٩٢١ – ١٩٥٨ سێ شا فەرمانرەوایی عێراقیان کرد فیصل ی یەکەم و غازی و فیصل ی دووەم دیارە سێیەمیان کوژراوە و یەکەم و دووەمیشیان گومان هەیە لەوەی یەکەمیان دەرمان خوارد کرابێ و دووەمیان رووداوی ئوتومبێلی بۆ دروست کرابێت.

سالآنی ١٩٥٨ – ٢٠٠٣ دەکەوێتەماوەی سەردەمی کۆماری لەعێراق لە ١٩٥٨ – ١٩٦٣ عبدالکریم قاسم سەرۆك وەزیرانی عێراق بوو لە ١٩٦٣ کوژرا عبدالسلام عارف لەناوبردرا احمد حسن بکر گومان هەیە لەوەی بەشێوەیەك لەشێوەکان کوژرابێ و صدام حسێن لەسێدارە درا.

واتە دەبینین لەماوەی ئەو (٩٠) ساڵە زۆربەی شاو سەرۆك كۆمارەكانی عێراق یان كوژراون یان گومان لەوە هەیە كوژرابن، دیارە وڵاتێك ئەمە چارەنووسی سەركردەكانی بێت دەبێت دانیشتوانەكەی ئەوەندە خۆش نەژیابن.

سەبارەت بە بارودۆخی كورد لەعێراق دا، لەیەكەم كابینەی حكومەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٢٠ دا وەزیری بەرگری عێراق كوردێك بوو بەناوی جعفر عسكری لەساڵی ١٩٥٨ پێش كودەتای ١٤ی تەموز سەرۆك وەزیرانی عێراق احمد مختار بابان كورد بوو وەزیری ناوخۆ سعید قزاز خەڵكی سلێمانی بوو، بەڵام ئێستا لە ٢٠١١ كورد گەورەترین پۆستی لەعێراق سەرۆك كۆمارە وەزارەتە ئەمنیەكانی نەدراوەتێ و لەگەڵ ئەوەش هەندێك عەرەب لەوە دەترسن كەكورد بەرەو جیابوونەوە بچن و یاخودهەنگاو بەهەنگاو بەرەو سەربەخۆیی بنێن، لەراستیدا ئەمەش بوختانە بەكورد دەكرێت، لەهەموو قۆناغەكانی دروست بوونی دەوڵەتی عێراقی لەوماوەیەی ئاماژەی پێكرا كورد بەشداربووە لەدروست كردن و پاراستن و بەهێزكردنی دەوڵەتی عێراقیدا.

دەبێ ئەمەش بڵێین ئەگەر چی كورد لەعێراق نەهامەتی و ناخۆشی فرەی بینیوە، بەڵام لەهەمان كاتیشدا بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری كورد لەعێراق دا لە بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری كورد لەهەموو پارچەكانی تری كوردستان بەهێزترە.

# ئەزمونی دیموکراسی لە کوێت لەماوەی سالآنی ١٩٦١ – ١٩٧٥

م. شوان محمد امین خۆشناو
قوتابی دکتۆرا

پێشەکی

ئەزموونی دیموکراسی لە کوێت لەماوەی سالآنی ١٩٦١ – ١٩٧٥ ناونیشانی ئەم کورتە باسەیە، دیارە لەولآتێکی کەنداوی عەرەبیدا، ئاسان نیە میللەت بەشداری لەکایە سیاسیەکانی بەڕێوەبردنی ولآت بکات و بەهۆی دەستگیرۆیی شێخانی فەرمانرەوای لە مێژووی کەنداوی عەرەبیدا ئەوبابەتە بەشی ئەوە هەڵدەگرێ توێژینەوەی زیاتری لەسەر بکرێ، بەتایبەتی ئەوناوچەیە لەرووی زاڵدەستی هۆزگەرایی و پابەندی عورف و داب و نەریتی کۆمەلآیەتی و داخراوی یەوە لەپێش ولآتانی دیکەی عەرەبی دایە، بۆیە دەکرێ توێژینەوەی زۆری لەسەر بنوسرێ.

باسەکەم بەسەر دوو تەوەردا دابەش کردووە، بەشی یەکەمی باس لە جوگرافیا و مێژووی پەرەسەندنە کارگێری و دیموکراسیەکان و داخوازی میللەت بۆ پێکهێنانی ئەنجومەن و بەشداری کردنیان، هەر لەسەرەتای وەرگرتنی حوکمرانی

خێلایـەتی رەهـای بنەماڵـەی سـەباح تاسـەربەخۆیی كوێـت ئامـاژە بـە وێـستگە گرنگەكانی هەوڵی دیموكراسیبوون كردووە.

لەبەشـی دووەم دا باسـی راگەیانـدنی سـەربەخۆیی و دامەزرانـدنی ئەنجومـەنی دامەزراندن وەكو سەرەتایەك بۆ قۆناغی گۆرانكاریەكان و هاتنە كایەی دەستوری نوێ بۆ وڵات و هەندێ لە مادەو برگەكانی تایبەت بەباسەكە و پاشان ئەنجومەنی گـەل و ئـەو قۆناغـەی كـە ئەنجومەنەكـە لـەماوەی هەڵبژاردنەكانـدا بـەخۆوەی بینیوە.

بەشی یەكەم

ئامارژەیەكی خێرای جوگرافیا و مێژووی پەرەسەندنە دیموكراسیەكانی كارگێری و دەسـەلأتداری كوێـت لـەپێش راگەیانـدنی سـەربەخۆییدا و وشـیار بوونـەوەی نیشتمانی.

جوگرافیای كوێت و سیستمی بەرێوەبردن و وشیاربوونەوەی :

پێگەی جوگرافیای كوێـت و شـوێنی سـتراتیژی و دەوڵەمەنـدی لـەبواری سـامانی سروشتی بەتایبەتی نەوت، كاریگـەری خـۆی هـەبووە لەسـەر شـێوازی سیـستمی بەرێوەبردنی وڵاتەكە.

كوێت دەكەوێتـە گۆشـەی بـاكوری رۆژئـاوای كەنـداوی عـەرەبی و لەسـەر شـێوە سێگۆشـەیەكەدا هەڵكـەوتووە، عێـراق دەكەوێتـە بـاكوری و شانـشینی عـەرەبی سعودیش دەكەوێتە باشوری وڵاتەكە و رۆژهەڵاتیشی لەسەر كەنارەكانی كەنداوی عەرەبیە، درێژیەكەی لەباكورەوە بۆ باشور ٢٨٠كم ە، پانیەكەی لەرۆژهـەڵات بـۆ رۆژئاوا ٣٨كم ە و رووبەرەكەی ١٥٠٠٠ كم٢ یە، ئاووهەواكەی بیابانی كیشوەریە و هاوینـان پلـەی گەرمیەكـەی دەگاتـە ٤٨ پلـەی سـەدی، بەدرێـژای كـەنارەكانی

ژمارەیەك دوورگە هەیە، گرینگترینیان دوورگەی(بۆبیان) و(نیلکا) یە کەرێژەیەك دانیشتوان تێدا دەژی(١)

ئەو ولآتە لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا، لەلایەن چەندسەرۆك هۆزێکەوە بەرێوەبراوە، سەرچاوەی شەریعەتی بەرێوەبردنەکە لەداب و نەریتی هۆزایەتی وەرگیراوە پاشان لەناوەراستی سەدەی هەژدەم لەئەنجامی رێککەوتنێك لەنێوان ٣ هۆزەکە، خانەوادەی سەباح(آل صباح) توانیان دەسەلآتی ناوچەکە بگرنە دەست، لەگەڵ ئەوەی دەسەلآتی هۆزگەرایی لەدوورگەی عەرەبیدا تائاستێکی زۆر رەهابوو بەلآم لەکوێت دا تا ئاستێك راوێژکاری هەبووە بەلآم لەسنورێکی بەرتەسك دا بەتایبەتی لەبواری بازرگانیدا(٢)

ئیتر ساڵی ١٧٥٦ بەسەرەتای دامەزراندنی رژێمی کارگێری لەکوێت دادەنرێت و دوای ئەوە پەیوەندیە بازرگانیەکانی نێوان شێخ زادەکانی سەباح و بەریتانیا بۆساڵی ١٧٧٥ دەگەرێتەوە، بەلآم پەیوەندیە سیاسیەکان پێش کۆتای سەدەی نۆزدەم رێك لەساڵی ١٨٨٩ دەست پێ دەکات، کاتێك حکومەتی بریتانی لەرێگەی حکومەتی هیندی ئەوکاتە رێککەوتنێکی نهێنی(٣) بەست لەگەڵ شێخ مبارەك صباح(١٨٩٦-١٩١٥)ی دەسەلآتداری ئەوسای کوێت دا واژۆکرا(٤).

دیارە رێککەوتنەکە بۆچەند هۆکارێك دەگەرایەوە، بەلآم لەسەروویان رەوشی خراپی پەیوەندیەکانی سوو لەگەڵ عوسمانیەکان، ئیدی کوێت لەسیاسەتی دەرەوەیدا بەجۆرێك وابەستەی بریتانیا بوو کەوائەوەی دواییان چەندین جیاوکی جۆراوجۆری بەدست هێنا لەوانە : قەدەغەکردنی هاوردە و هەناردەی چەك بۆ کوێت و کردنەوەی نوسینگەی پۆستەی ئینگلیزی و دامەزراندنی بێتەل و رێککەوتنێك دەربارەی نەوت و باروودۆخەکە بەم شێوەیە مایەوە تاساڵی ١٩١٢ عوسمانیەکان تائاستێك دەستبەرداری کوێت بوون و دانیان بەزاڵدەستی بریتانیا

تا لەناوچەکە و بریتانیاش بەلێنی دا لـەژێر پارێزگـاری خـۆی دان بەسـەربەخۆیی دابنیّ(٥).

لەسەردەمی فەرمانرەوایی شێخ احمد جابر صباح(١٩٢١-١٩٥٠)دا، لەسـەرەتادا بوژانەوەیەکی وێژەیی سەری هەڵدا کەچەندین یانەی ئەدەبی و کتێبخانەی ئەهلی کەپاشان بـووە مـەعاریفی گشتی، هـەروەها قوتابخانـەی ئەحمـەدی دامەزراند، کەدرێژەپێدەری قوتابخانەی موبـارەکی(المدرسـە المبارکیـە) بـوو دامـەزرا جگـە لەدامەزرانـدنی فەرمانگـەی شـارەوانی و پەرەسـەندنەکان لـەبواری رێککـەوتنی کۆمپانیای نەوتی کوێت(٦) و نەوتی ناوچە بێلایەنـەکان و چـەندین پـەرەسـەندنی تـر(٧) لـەبواری سـەرەتاکانی دامـەزراوە کـارگێری و راوێژکاریەکانـدا، یەکـەم دامەزراوی راوێژکاری لەشێوەی ئەنجومەنێك لەساڵی ١٩٢١ لەدوای چەند هـەوڵێك لەلایەن ژمارەیەك کەسایەتی دوای ئەوەی شێخ ئەحمەد جـابر سـەباح یـان بـینی بۆمەبەستی رێکخستنی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن، رەزامەندی نیشاندا و یەکەم ئەنجومەنی راوێژکاری پێکهـات، هەڵبـژاردنی ئەنجومـەن لەسـەر بنـەمای جـوگرافی کـرا و لـە١٢ دوانـزدە کـەس پێکهـاتبوو کـە کەسـانی سـەر بەبنەماڵـەی فەرمانرەوا نەبوون، دوابەدوای ئەویش ئەنجومەنی شارەوانی پێك هـات و پاشـان لەساڵی ١٩٣١ یاسای شارەوانی دەرچـوو کەئـەویش لـە١٢ کـەس پێـك دەهـات و لەساڵی ١٩٣٢ هەڵبژاردن کرا، هەروەها ئەنجومەنی مـەعاریف لەسـاڵی ١٩٣٦ بـۆ فێربوون دامەزرا و لەپرۆسـەیەك دا کـەژمارەی ئەوانـەی مـافی دەنگدانیان هـەبوو لە٥٠ کەس پێك هاتبوو، ئەوانەی دەنگی خۆیان بۆ١٢ دوانزدە پاڵێوراو دا(٨).

دیارە ئەو ئەنجومەنە راوێژکاریە لەچوارچێوەی داخوازیە کـان بۆچاکسازی هاتـە دامەزرانـدن لەسـاڵی ١٩٢١ کەبەیەکـەم داواکـاری چاکسـازی ناوزەنـد دەکـریّ، ئـەزموونی دووەم داخـوازی چاکسـازی لـەماوەی سـاڵانی ١٩٢٧-١٩٢٨ هاتـە

ئاراوە، کاتێك ئەنجامی گۆرانکاریەکانی جەنگی دووەمی جیهانی لەگەڵ خۆی هێنای و رەنگدانەوەی لەسەر کەنداوی عەرەب هەبوو، لەگەڵ بوونی مزگێنیەکانی نەوت(بشائر النفط) و کەلەکەبوونی دارایی، لەبەرامبەر بەگوربوونی بەرگری دژی داگیرکاری بەریتانی بەتایبەت لەعێراق و بوژانەوەی بەرگری فەلەستینی و رووداوەکانی سوریا و میسر دەنگدانەوەی لەکەنداو بەگشتی و لەکوێت بەتایبەتی هەبوو(٩).

لەچوارچێوەی جۆرێك لەوریابوونەوە وشیاری کۆمەڵگەی کوێتی یەکەم ئەنجومەنی هەڵبژاردراوی یاسادانان لەساڵی ١٩٣٨ لەکوێت دامەزرا(١٠). بەگوێرەی بەڵگەنامەکە لەمادەی(١)ی دا هاتبوو لەگەڵ سەرچاوەی دەسەلاّتەکان کەدەستی نوێنەرانی هەڵبژێرێ هەروەها لەمادەی(٥)ی هاتبوو سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان نوێنەری دەسەلاّتی جێبەجێکردنە لەولاّتدا(١١).

هەروەهالەمادەی(٣)ی دا هاتبوو ئەنجومەن سەرچاوەی هەموو رێککەوتنەکان و جیاوکەکانی ناوخۆ و ئەوپەیمانە دەبێ کەکوێت لەگەڵ ولاّتانی تر ببەستێ ئەوەبوو لە٢ی یولیۆی ١٩٣٨ شێخ احمد جابر رەزامەندی خۆی لەسەر نیشاندا، بەلاّم تەمەنی ئەنجومەنەکە لەشەش مانگ زیاتر نەبوو بەهۆی رازی نەبوونی لەسەر رێککەوتنێکی نەوتی(١٢).

لەدوای ئەوەی خەڵکی کوێت وەکو هەموو گەلانی جیهان بەرووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانی سەرقاڵ دەبن، کوێت لەماوەی ساڵانی ١٩٤٠–١٩٥٠ لەبواری نەوتی پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی و ئابوریەکەی بەرەو پێشکەوتن بوو بەمەش پێداویستی نوێ بۆکۆمەڵگە هاتە کایەوە، خوێندەواری و فێربوون زیاتر بەرەوبلاّوبوونەوە بوو هاوکات هۆزەکانی رۆشنبیربوونی دەرەکی هاندەر بوون و کۆمەڵگەی گەنجان و یانەکان بەشێوەیەکی نوێ وشیاری خۆیان دەربری،

رۆژنامەی ناوخۆ زیاتر بەدەردەکەوتن، هێدی هێدی داخوازیەکانی چاکسازی ئابووری و کۆمەلآیەتی و سیاسی لەبرەو دابوو(١٣).

لەماوەی دواتردا ژمارەیەك رێکخراو و رێکخستنی وا دامەزران کەوا ئاراستەیەکی لیبرالیان هەبوو لەوانە، لەساڵی ١٩٥٤(لێژنەی نیشتمانی ئاشتیخوازان) ئەوانە نەیاری هەژموونی بێگانە بوون و لەگەڵ هاواری رزگاریخوازی نشتیمانی عەرەبی هەماهەنگ بوون، هەروەها(یەکگرتووی دیموکراسی) دامەزرا بۆ مەبەستی دروست کردنی ئەنجومەنی دامەزراندن و دەستوری نوێ، جگە لەمەش بزوتنەوەی نەتەوایەتی لەکوێت بەهۆی رەنگدانەوەی رووداوەکانی شۆرشی میسری گەشەی کردبوو(١٤).

ئەوفاکتەرانە پاڵنەربوون تاوەکو دەسەلآت لێژنەیەکی جێبەجێکردنی بالآ لە١٩ی تەموزی ١٩٥٤ پێك بێنی، کەشێوەی دەزگایەکی حکومی کاری چاکسازی گشتی لەدەوڵەتدا بخاتە ئەستۆی خۆی، بەلآم ئەوە بووە جێگەی رەخنەی دیوانەکان و یانە و کۆمەڵەکان و دەستە بژێری کۆمەڵگە سوربوون لەسەر هەڵبژاردنی ئازاد و فراوانکردنی بنکەی بەشداریکردنی میللی و دامەزراندنی رژێمێکی نوێی کارگێری و کەمکردنەوەی دەسەلآتی سەرۆك فەرمانگەکانی حکومەت(١٥).

ئەوبارودۆخە بەردەوامی هەبوو، لەساڵی ١٩٥٦ لەکاتی شەری سوێس لەکوێت خۆنیشاندانێکی گەورەکرا، بەلآم سەرکوت کرایەوە، لە ١٩٥٩/٢/٣دا شێخ عەبدوللا سالم(١٩٥٠-١٩٦٥) یانە و رۆژنامەو گۆڤارەکانی داخست و لە بەیاننامەیەکدا رایگەیاند کەوا مەسەلەی دیموکراسی بەرادەیەك قۆزراوەتەوە وەتەنانەت دەست درێژی دەکرێتە سەر خودی میری ولآتیش. لەسەرووبەندی ئەو قەیرانەدا دەستەی رێکخستنی ئەنجومەنی بالآ، جگە لەبنەماڵەی فەرمانرەوا ٦شەش گەورە بازرگانی بۆزیادکرا، پاشان دووبارە لەسەرەتای ساڵی ١٩٦١دا ٣

سێ بازرگانی دیکەش زیاد کران و ئەندامانی ئەنجومەنەکە گەیشتنە ١٦شازدە کەس، ئیتر رەوشەکە بەردەوام بوو تاراگەیاندنی سەربەخۆیی یانەئەوکاتەی عێراق لە ١٩٦١/٦/٢٥ هەرەشەی لە کوێت کرد و بەوەی کەبەشێکە لەعێراق ئەوهۆکارە لەپاڵ هۆکارەکانی دیکە، پاڵی نا بەمیری کوێت(ئەنجومەنێکی دامەزراندن بۆ دەستووری نوێ) دابمەزرێنێ وەکو چارەسەرێك بۆ رازی کردنی هەموو لایەنەکان و رزگاربوون لەوقەیرانە سیاسیە قۆناغێکی تر دەست پێ دەکات لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ بەکۆمەڵێك قۆناغ تێپەریوە تاگەیشتۆتە ئەوئاستەی دوای سەربەخۆیی دەوڵەت کەلەسەروویان وشیاربوونەوەی نیشتمانی بوو لەئەنجامی پەرەسەندنی خوێندەواری و پاشان چاکتربوونی گوزەران و لایەنی ئابوری و هۆکارەکانی دەرەکی بەتایبەتی ئەوانەی کاریگەریان لەسەر هەستی نەتەوایەتی هەبوو.

بەشی دووەم

راگەیاندنی سەربەخۆیی و دامەزراندنی ئەنجومەنی دامەزراندن و دانانی دەستوری نوێ بۆ وڵات و ئەزمونی دیموکراسی ١٩٦١–١٩٧٥.

لەچوارچێوەی دیاردەکانی نوێ بوونەوە و بڵاوبوونەوەی هۆزی نوێ لەنیشتمانی عەرەبی کاریگەری لەسەرکوێت هەبوو، لەگەڵ دەرکەوتنی چینی ناوەراست داخوازی دروست بوونی پارتەسیاسیەکان لەجیاتی وابەستەوپەیوەندیەکانی هۆزگەرایی و خانەوادەوە هاتەئاراوە، ئیترئەو توێژە داخوازی تەکنۆراتی لە کایەوفەرمانگەکانی حکومەت لەجیاتی پێوەری باو و بۆماوەیی(التقليدية و الاريثة)داواکرد، ئەودەستە بژێرەی کۆمەڵگە لەپەنجاکانەوە جموجۆڵەکانی

دەستی پێکرد و تاگەیشتە داخوازی بەشداری سیاسی و چاکسازی سیاسی ناخۆی کرد(١٦).

لە١٩ی کانونی دووەمی ١٩٦١ کوێت رایگەیاند کەوا دەوڵەتێکی سەربەخۆیە و خاوەنی سەروەری خۆیەتی، دوای رەتکردنەوەی رێککەوتنامەی ١٨٩٩ کەلەژێر پارێزگاری بەریتانیا دابوو(١٧).

دوا بەدوای ئەوە پێویستی ئەوقۆناغەبوو کەوابنەما و کۆمەڵگە سەرەکیەکانی دەوڵەتی نوێ دابمەزرێنێ و رژێمی کۆنی فەرمانرەوایی وەلاوەبنرێ و هەنگاو بەرەو دەوڵەتی دامەزراوەیی بنێ(١٨).

بۆ ئەومەبەستەش بۆئەوەی داخوازی نوێ و گونجان لەگەڵ هاتنەکایەی سەردەمی نوێ چەندین فەرمان و مەرسومی میری دەرچوون و لەرۆژنامەکان بلاوکرانەوە لەوچوارچێوەیەدا مەرسومی میری ژمارە(١٢) بۆ ساڵی ١٩٦١ دەرچوو بۆئەنجام دانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزراندن(١٩).

ئیتر هەڵبژاردنی ئەندامان بۆنوێنەرایەتی لە ١٩٦١/١/٣٠ ئەنجام دراو ئەنجومەن لە٣٤ سیو چوار ئەندام پێکهات، کە٢٠بیست ئەندام بەهەڵبژاردن دەرچوون و ١٤ چواردە ئەندامیش بەدامەزراندن بوون، کەوادەست بەرداری دەنگدان بوون، سەرلەبەیانی ١٩٦٢/١/٢٠ میری کوێت یەکەم ئەنجومەنی دامەزراندنی کردەوە(٢٠).

بۆرێکخستنی کاروبارەکانی ئەنجومەن یاسای ژمارە(١) یەکی ساڵی ١٩٦٢ دەرچوو بۆرژێمی بنەرەتی حوکمرانی لەماوەی گواستنەوەدا(ئەوماوەیە لە مێژووی کارکردن بەم یاسایە لە ١٩٦٢/١/٧ تا مێژووی کارکردن بەدەستور ١٩٦٣/١/٢٩ دەگرتەوە) یاساکە لە٣٢ مادە پێکهاتبوو، مادەی(١)یەکەمی کەبۆ ئامادەکردنی دەستور راسپێردرابوو، تێیداهاتبوو رژێمی فەرمانرەوایی لەسەر

بنچینەی بنەماکانی دیموکراسی دەبێت و لەگەڵ ئامانجەکانی کوێت یەکانگیر دەبێت هاوکات لەدوای کردنەوەی ئەنجومەن و پاشان لە ١٩٦٢/٣/٣ لیژنەیەکی دەستوری لە(٥)پێنج کەس پێکهات و لەدوای ٢٣ دانیشتن لیژنەکە دەستورێکی ئامادەکراوی پێشکەشی ئەنجومەنی دامەزراندن کرد، ئەنجومەنیش لە ٧ دانیشتن دا لەماوەی دوومانگ گفتوگۆی لەسەر پرۆژەکە کرد و میری کوێت لە ١٩٦٢/١١/٩ بەبێ هەموارکردنی رەزامەندی خۆی لەسەر دەستوری نوێ نیشاندا، ئیتر لە ١٩٦٢/١١/١٢ دەستورەکە لەژمارەی تایبەتی رۆژنامەی فەرمی بلاوکرایەوە(٢١).

دیارە دەستوری نوێی ولات بەرهەمی خەباتی کۆمەڵگەی کوێت و هێزە نیشتمانیەکان بوو سەرەرای باروذۆخی نێودەولەتی و هەرێمایەتی و ناوخۆ کەزەمینەیەکی لەباری رەخساند بۆگۆرانکاری لەگەڵ پێداویستیەکانی قۆناغی نوێ و گۆرانی سیتەمی فەرمانرەوایی لەدەسەلاتی بنەماڵەی فەرمانرەواوە بەسەر هەموو جومگەکانی حوکم بۆ دەولەتێکی خاوەن دەستور و دامەزراوەیی.

دیارە بایەخی ئەنجومەن تەنها لەبواری دارشتنەوەی دەستوردا نەبوو، کەدەستکەوتێکی گەورەبوو، بەلکورۆلی هەبوو لەوێناکردنەوەی کاروانی سیاسی و کۆمەلایەتی کوێت لەداهاتودا، ئەنجومەن لەوماوەیەدا کۆمەلێك پرۆژەیاسای پێشکەش کرد، لەوانە : یاسای هەلبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی گەل و یاسای رێکخستنی شارەوانی کوێت و یاسای هاوکاریە گشتی یەکان و یاسای کۆمەلەهەرەوەزیەکان و یاسای یانە و کۆمەلەکانی سودی گشتی و چەندانی تر(٢٢).

_دەستوری کویتی و هەندێ لەبرگەومادەکانی :

دەستوری کویت یەکەم ئەزمونی دیموکراسی پیشەنگ بوو لەمێژووی ولاتانی کەنداوی عەرەبی، کەئەوەش دواتر کاریگەری ئەرێنی دەبێ لەسەر ولاتانی دیکەی کەنداو بۆ بەدیهاتنی بەشداری پێکردنی میللەت لەکایەکانی دەسەلات و ولات بەرێوەبردنـدا(٢٣) دەستوری کویت لـە(١٨٣) مـادە پێـك هـات کەبۆسەر(٥)دەروازە(باب) دابەش کرابوو ئەوانیش بریتی بوون لە :

١- دەولەت و رژێمی فەرمانرەوایی ٢- بنەما سەرەکیەکانی کۆمەلگەی کویتی ٣- ئەرك و مافە گشتی یەکان ٤ - دەسەلاتەکان ٥ - حوکمە گشتی یەکان حوکمە کۆتاییەکان، سەبارەت بەدەروازەی چوارەم کەدەسەلاتەکان بوو پێنج بەشی لەخۆوە گرتبوو ئەوانیش. أ - حوکمەکانی گشتی ب - سەرۆکی دەولەت ج - دەسەلاتی یاسادانان ء- دەسەلاتی جێبەجێکردن هـ - دەسەلاتی دادوەری بوو، کەوا هەریەکێك لەوبرگانە ئەرك و مافەکانیان دیاریکرابوو(٢٣).

دەستوری کویت ماف ئازادی دامەزراوەیی لە چوارچێوەی برگەو مادەکانی دەستبەر کردبوو، تەنهارێگەی بەدامەزراندنی پارت و کۆمەلەوگروپی سیاسی نەدابوو، بەلام هیچ دەقێکی تێدانەبوو کەرێگری بکات لەدامەزراندنی، لەمادەی ٤٣دا هاتبوو : ئازادی دروست کردنی کۆمەلە و سەندیکاکان هەیە لەسەر بنەمای نیشتمانی و بەرێگەی ئاشتی و بەگوێرەی مەرجەکان و ئەورەوشەی کەیاسا دیاری دەکات، نابێت کەس ناچار بکرێت بچێتە ناو هەر کۆمەلەو سەندیکایەك(٢٤).

لەدەروازەی دووەم و سێیەمی دەستورەکە ئەرك و مافەکانی تێدا دیاری کرابوو مافەسیاسیەکان : رەگەزنامە و یەکسانی و ئازادی کەسی و ئازادی بیرکردنەوە و بیروباوەری ئاینی و رۆژنامەگەری دەگرتە خۆ، مافەکانیش : مافی ئابووری و

کۆمەلایەتی و کارو فێربوونی دەگرتەوە، لەمەر ئەرکە گشتی یەکانیش : پارێزگاری لەنیشتمان و دانی باج و رەچاوکردنی داب و نەریت و رژێمی گشتی کۆمەلگە بکرێ.

سەبارەت بەدەسەلاتەکان، دەستور بنەمای دیموکراسی نوێنەرایەتی دووپات کردبۆوە لەسەر بنچینەی گەل سەرچاوەی دەسەلاتەکانە، هەروەها دەسەلاتە گشتی یەکانی دەولەت لەژێرچاودێری میری دەولەت و دەسەلاتی دادوەری سەربەخۆیی هەبوو، هەروەها لەمادەی ٥٠ بنەمای جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان هەبوو کەتێیدا هاتبوو : رژێمی فەرمانرەوایی لەسەر بناغەی جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان و هاوکاریکردنیان بەگوێرەی حوکمەکانی دەستور دادەمەزرێ، نابێ هیچ دەسەلاتێك دەستبەرداری پسپۆریەتی خۆی بێت وەکو لەدەستور هاتووە(٢٥) بۆیە دەبینین لەدوای راگەیاندنی دەستور کۆمەلگەی کوێتی دوای ئەوەی ئەرك و مافەکانی خۆی لەچوارچێوەی دەستور دەزانێ بەتایبەت نوێنەرە نیشتمانیەکان زیاتر لەهەولی کارکردنی پرۆسەی سیاسی دەبن و هەولەکانیان چردەکەنەوە، تەنانەت هەندێ توێژەر هۆکاری سەرەکی ململانێی نێو ئەنجومەنی گەل بەدرێژایی ماوەی دوای دەستور بەکەم و کوریەکانی دەستور دەبەستنەوە.

لەم روانگەیەوە دەستوری جیاوکی گەورەی بە بنەمالەی فەرمانرەوا بەخشی بوو، هەروەها سەرۆك دەولەت ماف رەخنە و نارەزایی هەبوو لەسەر یاساکان، هەموارکردنی دەستوریش بەرەزامەندی سەرۆك دەولەت بوو، هەروەها دوای دامەزرانی ئەنجومەن گەلیش هەندێ ئەندام بەدامەزراندن لەلایەن سەرۆك دەولەت دادەنران کەوەزیرەکان چارەکی ئەنجومەنیان پێك دەهێنا، بەمەش حکومەت پالپشتی بەندێکی گەورەی لەناو ئەنجومەن دەستەبەرکرد(٢٦).

سەرەرای ئەمانە دەکرێ لەکات و ساتی دارشتنی دەستور و بارودۆخی هۆزایەتی ناوچەی کەنداو بەچاوێکی بایەخەوە سەیری دەستور و پرۆسەی دامەزراوی سیاسی کوێتی بکرێت لەو سەردەمەدا.

_ئەنجومەنی گەل و ئەزمونی دیموکراسی لەناو ئەنجومەن دا ١٩٦٣–١٩٧٥

دوابەدوای دەرچوونی دەستور میری کوێت یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گەل(مجلس الامە)ی لە ١٩٦٢/١١/١٢ دەرکرد و هەڵبژاردن لە ١٩٦٣/١/٢٣ ئەنجام دراو بەپێی دەقەکانی دەستور وەزارەت دەستی لەکارکێشایەوە لە ١٩٦٣/١/٢٨ وەزارەت یاحکومەتێکی نوێ پێکهات و بەگوێرەی دەستور ئەنجومەنی گەل مافەکانی دەرکردنی یاساکان و لێپرسینەوە و بەدواداچوونی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی گرتە ئەستۆی خۆی(٢٧).

دیارە بوونی ئەنجومەنی گەل بنەمای بوونی دیموکراسیە و تێیدا نوێنەرانی هەڵبژاردوی دەگرێتە خۆ لەرێگەی دەنگدانی راستەوخۆ، رادەی کاریگەری ئەنجومەن لەژیانی دیموکراسی دەگەرێتەوە سەر پێشکەوتنی کۆمەڵگە و وشیاری خەڵك لەهەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان(٢٨).

هەڵوێستی هێزەنیشتمانیەکانی وڵات پاڵپشتی ئەو هەنگاوانە بوو هەر لەدوای سەربەخۆیی کوێتەوە، ئەو هێزە نیشتمانیانە بەشداریان لە ئەنجومەنی نوێنەران کرد وەکو فراکسیۆنێکی ئۆپۆزسیۆنی چالاك کە لەهەموو روێکەوە خاوەنی بەرنامەیەکی دیاری کراوبوون و لەپێشتردا هەموو لەسەری کۆك بوون ئەوەش هۆکارێك بوو کەوا رەگەزەنیشتمانیەکان هێزیان زیاتر بێت(٢٩). هەروەها رۆڵێکی دیاریان بینی و هاوپەیمانی یەکتربوون لەژیانی سیاسی(٣٠).

هەرلەسەرەتادا نوێنەرە نیشتمانیەکان لەگەڵ کەم ئەزموونی و توانای سنورداردا بەڵام کەسانی وایان تێدا هەڵکەوت لەشێوەی زەنگێك لەدەرگاکانی حکومەت بدات هەرکاتێك حکومەت بکەوێتە هەڵەکردنەوە وشیاری بکاتەوە(٣١).

دوای ئەوەی ئەنجومەن لە ١٩٦٣/١/٢٩ دانیشتنی خۆی سازدا کەیەکەم دانیشتنی بوو، میری پێشو سوێندی یاسایی خوارد و کەرێز لەدەستور و یاساکانی دەوڵەت بگرێت سەربەخۆیی خاك و نیشتمانی بپارێزێ، سەرۆکایەتی دانیشتنەکە لەلایەن بەتەمەنترین ئەندام کە(سعود العبدالرزاق)بوو بەرێوە چوو، ئەندامان سوێندی دەستوریان خوارد و بۆسەرۆکایەتی ئەنجومەن(عبدالعزیز حمد الصقر) بەسەرۆك و(سعود العبدالرزاق) بە جێگری سەرۆك هەڵبژێردران(٣٢).

خولی یەکەمی ئەنجومەن بێ کێشە و ناکۆکی نەبوو لەنێوان هەندێ لەهێزە کۆمەڵایەتی و سیاسی و حکومیەکان، کاتێك ١٢ ئەندام(زۆربەیان عەرەبە نەتەوەییەکان بوون) گەلا لەنامەیەکی واژۆکراویان پێشکەشی حکومەت کرد لە ١٩٦٤/٩/٤ کەوا دوو بابەتی گرنگی دەربارەی چاوخشاندنەوە بە سیاسەتی دەرەوەی کوێتی گرتبووە خۆی : یەکەمیان مەسەلەی هاوکاری سەربازی لەگەڵ بەریتانیا، دووەمیان مەسەلەی عەرەب و چوونە پاڵ ململانێ نێوان دووجەمسەرەکە، ولایەتەیەکگرتوەکان و یەکێتی سۆڤیەت لەچوارچێوەی جەنگی سارددا، حکومەت وەڵامی دایەوە کەوا بریاری داوە راستەوخۆ لەپەیماننامەکە لەگەڵ بەریتانیا، لەوکاتەدا سوریا و عێراق و میسر داوایان لەکوێت کرد گفتوگۆ بکەن لەسەر دامەزرانی دەوڵەتێکی عەرەبی فیدراڵ.

هێزە عەرەبە نەتەوەییەکان سەرکەوتووبوون لەبەدەست هێنانی زۆربەی دەنگەکان لەدەرکردنی بریارێکی ئەنجومەن بۆسەرکۆنەکردنی پێشیلکاریەکانی فەرەنسا لەجەزائیر و داواکردن لەحکومەتی کوێتی بۆناردنی یارمەتی خێرا بۆ

گەلی جەزائیر و هاوکاری کردنی بۆ رزگاربوونی لەکۆت و بەندی سەربازی فەرەنسی(٣٣).

لەدوای دامەزرانی یەکەم حکومەت لەشوباتی ١٩٦٣ دوای ساڵێك و هەشت مانگ بەهۆی پێشکەش کردنی وازنامە لەلایەن ژمارەیەك وەزیر لە ١٩٦٤/١٢/٦ سێیەم حکومەت پێکهات، لێرەدا قەیرانێکی دەستوری لەنێوان ئەنجومەن و حکومەت سەری هەڵدا چونکە ژمارەیەك لەئەندامە نەتەوەییەکانی ناو ئەنجومەنی گەل نەیاری پێکهێنانی ئەو حکومەتە بوون و سوێندی دەستوریان نەخوارد چونکە زۆربەی وەزیرەکان بازرگانان بوون و ئەوەش لەگەڵ روحی دەستور گونجاو نەبوو کەهاتبوو وابەستە بوونی بازرگانی و کاری حکومی، لێرەدا سەرۆك ئەنجومەن دەستی لەکار کێشایەوە بەهۆی ئەوەی نوێنەرەکان دەنگیان بۆ داواکەی نەداوە لەگەل خۆی لەدوای ئەو ٩ نۆ نوێنەرە وازنامەیان پێشکەش کرد بەهۆی ئەوەی کەوا ئەنجومەن ناتوانێ رووبەروی ئەو یاسایانە ببێتەوە کە کۆت و بەندن لەبەردەم ئازادیەکان وەکو دەرکردنی فەرمانبەران و قەدەغەکردنی باسی سیاسی و داخستنی رۆژنامەدا(٣٤).

لەگەڵ کەمی ئۆپۆزیسۆن لەناو ئەنجومەن دا بەشێوەیەکی گشتی دیموکراسی کرانەوە لەناو کۆمەڵگادا، وای لەدەستە بژێری کۆمەلأیەتی کردبوو بەهۆی دیوان و یانە و کۆمەڵەکان، ئەوهێزە سیاسیە هەڵوێستی ئۆپۆزیسیۆن بەرامبەر حکومەت وەربگرێ، تەنانەت گفتوگۆکانی ناو ئەنجومەن لەرۆژنامەکانی ناوخۆ بڵاوکرایەوە، لەگەڵ نارەزاییەکانی کە نوێنەرە نیشتمانیەکان لەبەرامبەر سیاسەتی دەرەوەی کوێت دا پێشکەشیان دەکرد و داخوازی هێزی نەتەوەیی بۆ پتەوکردنی پەیوەندیەکان لەگەڵ وڵاتی عەرەبی(٣٥).

لەساڵی ١٩٦٥ ئەوکۆمەڵە نوێنەرە نیشتمانیە توانیان رێگەی سوێند خواردن بگرن، لەوە نارازی بوون کەئەندامەکان لەبازرگانەکان بوون، حکومەت ناچار بوو کەدووبارە حکومەتێکی تر پێك بێنی(٣٦).

حکومەتی چوارەم لە ١٩٦٥/١/٣ پێك هات بۆئەوەی بتوانێ نوێنەرایەتییکی نیمچە یەکسان لەنێوان سێ هێزە سەرەکیەکەی کۆمەڵگەی کوێتی بکات کەبنەماڵەی فەرمانرەوا، گەورەبازرگانەکان و چینی ناوەراست کە زۆرینەی گەل بوو لەچینی یەکەم و دووەم نەبوون، لەسیماکانی ئەوپێکهاتەیە وەزارەتەکانی دەرەوە و ناوخۆ و راگەیاندن بەدەست تاکەکانی بنەماڵەی فەرمانرەواوە بوون(٣٧).

لەدوای ٤ رۆژ لە ١٩٦٥/١/٥ دوای وتاری میرانەی عبدالله سالح صباح قەیرانەکە تەقیەوە کاتێك لەبەرامبەر ئەنجومەن بەزمانێکی توند و زبر رایگەیاند حکومەت رەتی هەموو ئەو پەیمانامەنە بکاتەوە کەلەئەنجومەن تێپەریوە سەبارەت بە ئازادیە گشتی یەکان و چاوخشاندنەوە بەسیاسەتی دەرەوەی لەگەڵ بەریتانیا و هەرێمە عەرەبیەکان، لێرەدا هێزە نەیارەکان دەرگایان بۆ ولآکرا بۆئەوەی مەسەلەی تر بوروژێنن لەوانە : پاڵپشتی حکومەت بۆرۆژنامەگەری بەبەراورد لەگەڵ رۆژئاوادا و پتەوکردنی پەیوەندیەکانی کوێت لەگەڵ ولآتانی عەرەبی و پرەپاگەندەی حکومەت بەرامبەر چینی میللی کەوا ولآتێکی کۆمۆنیزمە و نابێ مامەلەی لەگەڵ بکرێ، هەروەها دۆسیەی تر کەپەیوەندی بەبەرگری و هێزی چەکداری و سەربازی بەزۆرە ملێ هەبوو ئەوانە هەموو کێشەی نوێ بوون لەلایەن دەسەلآتەوە رێگریان لێکرابوو باسیان بکرێت(٣٨).

لەئەنجامی ئەم رەوشە وەزارەتی پێنجەم لە ١٩٦٥/١٢/٤ دامەزرا لەوکاتە حکومەت پرۆژەی رێککەوتنامەی نەوتی لەگەڵ کۆمپانیا نەوتیەکان لەبەر

دەستدا بوو(٣٩) کاتێك پرۆژەکە خرایە بەردەم ئەنجومەن نارەزایی لێکەوتەوە(٤٠) نوێنەرە نەتەوەییەکانی ناو ئەنجومەن سەرکەوتوبوون لەوەی پاڵ بنێتە زۆرینەی ئەنجومەن و حکومەت ریسوا بکەن(٤١).

لەئەنجامی ئەوە سعودیەی عەرەبی هێرشی کردە سەر ئەنجومەن و ئەوهەڵوێستەی بەبانگەوازەکانی ناسری لەکوێت تۆمەتبارکرد، حکومەت بۆرزگاربوون لەم قەیرانە بەیاسایەك رێگەی دا کەرۆژنامەکان بۆماوەی ساڵێك زیاتر بوەستێنرێ، چونکە رۆژنامەکان و رای گشتی لەگەڵ ئەنجومەن بوون، هەروەها حکومەت چالاکی یانە و کۆمەڵەکانی سنوردارکرد و ژمارەیەك لەوعەرەبانەی دەستگیرکرد کە بۆکوێت هاتبوون، کۆمەکی هاندانی ئاژاوە و پشێوی نانەوەی خستنە پاڵ(٤٢).

لەئەنجامی ئەوفشارەی ئەنجومەن، حکومەت مکور بوو لەسەر تێپەرینی ئەو رێککەوتنامەیە، هێشتا ئەنجومەنی گەل ماوەی یاسایی خۆی تەواو نەکردبوو لە ١٩٦٧/١/٣ حکومەت دەستی خستە ناو هەڵبژاردنەکانی دووەمی ئەنجومەنی گەل لە ١٩٦٧/١/٢٥ بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی بۆ بەرژەوەندی خۆی مسۆگەرکرد، لە ١٩٦٧/١/٢٧دا ٣٨ پاڵێوراو کە لەنێویاندا ٦ پاڵێوراوی سەرکەوتوو لەهەڵبژاردنەکان بەیانیکیان دەرکرد حکومەتیان شەرمەزارکرد کەوا یاری بەدەنگەکان کردووە، یەکێك لەوەزیرەکان و زۆربەی کۆمەڵەی پیشەیەکان یانە و سەندیکاکان پشگیری ئەوان بوون(٤٣).

بەهەرشێوەیەك بێت لە ١٩٦٧/٢/٧ یەکەم دانیشتنی دەست پێکرد و حکومەت توانی هێزە ئۆپۆزیسۆنەکان دووربخاتەوە و لە پەنجا کورسی تەنها ٤ کورسیان بەدەست هێنا، حکومەت رێککەوتنامە نەوتیەکەی لە ١٩٦٧/٥/٢٢ بە ئەنجومەن تێپەراند(٤٤) و دەستکاری دیاری کردنی حکومەت بەدەنگەکان بەردەوام بوو، لە

سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوو کاتێك هەڵبژاردنی خولی سێیەم کرایەوە، حکومەت هەڵمەتیکی رەگەزنامە بەخشینی بەهەوەسی خۆی دەست پێکرد بۆئەوەی کرداری دەنگدانەکە لەهەندێ لەناوچەکان بشێوێنێ(٤٥) کاتێك هەڵبژاردن لە ١٩٧١/١/٢٣ کرا لەکەشێك دابوو کەخەڵك دەستکاری و تەزویری حکومەتیان لەپشودا لەبەر چاو بوو(٤٦).

دواتر لەساڵی ١٩٧٥ هەڵبژاردنی تر ئەنجام درا، کەوا سەرەتای پەرەسەندنی و دەرکەوتنی هێزە هۆزگەراییەکان بوو(القوی القبیلە) لەناو هۆڵی ئەنجومەندا، چونکە حکومەت لەبارودۆخێکی نالەباردابوو، بەرامبەر زۆرینەیەکی گەشەسەندوو کەوا نەیارودژی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەکی بوون، بۆیە پێویستی بە هاوپەیمانێك بوو بۆئەوەی لەئەنجومەندا پاڵپشتی زۆربێتەوە و جڵەوی هێزەنیشتمانیەکانی پێبکا، لەبەرامبەر ئەوەدا هەرچەندە تاکەکانی هۆزەکان زۆر بوون، بەلآم لەبارودۆخێکی کۆمەلآیەتی دواکەوتوو دەژیان بەڵکو وشیاریان لەکاری سیاسی و شێوازەکانی کاریگەری لەسەر دروست کردنی بریار نەبوو بەلآم پابەند و دڵسۆزی تەواویان بۆ خانەوادەی سەباح هەبوو(٤٧).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ لەگەڵ ئەوەی لەماوەی ساڵانی ١٩٦٣-١٩٧٥ نوێنەری هێزەنیشتمانیەکان کەمینە بوون، بەلآم کاراو چالاك بوون و هەمیشە دەنگی خۆیان لەبەرامبەر سیاسەتە چەوتەکانی حکومەت و بنەماڵەی حوکمران هەڵبریوە، هەروەها ئەزمونی دیموکراسی لەو ماوەیەدا لەلایەن توێژی رۆسنبیران کەکەسانی لیبراڵ و ئازادیخواز هەوڵی بۆ دراوە بەلآم حکومەت بەربەستی بۆ دروست کردووە.

ئەنجام

* کوێت نمونەیەکی باشی دیموکراسی بوون بوو لەچوارچێوەی ئەو هەل و مەرجەی ولأتانی کەنداو و جیهانی عەرەبی تێیدا دەژیان.

* لەدوای چەندهەولێکی جەماوەری بۆداخوازی و چاکسازی سیاسی و بەشداری کردنی خەلك لەکایەسیاسیەکان، توانیان حوکمرانی هۆزگەرایی و رەها بەرەو مەدەنی بوون بگۆرن و دامەزراوەکانی سیاسی و پیشەیی و رۆشنبیری و کۆمەلأیەتی و ئابووری دابمەزرێنن لەچوارچێوەی دەستورو یاساکانی ولأتدا.

* لەدوای دەرچوونی دەستور ئەو ولأتە بەرەو دامەزراوەیی چوو بەلأم ماف بنەماڵەی فەرمانرەوایی لەچوارچێوەی دەستوردا زیاتر لەسنوری خۆی درابوو.

* بەدرێژایی قۆناغی یەکەم تاساڵی ١٩٦٧ هێز و نوێنەرە نیشتمانیەکان بەگروتینەوە لەئەنجومەنی نوێنەرایەتی گەل دا لەگەڵ کەمی لەژمارەیان و توانیان بەرامبەر زۆرینە، بەلأم چالاك و ئەکتیف بوون.

* لەقۆناغی ١٩٦٧ – ١٩٧٥ دا، بەهۆی کارابیەکانی حکومەت و چەواشەکاری لەپرۆسەی دەنگدان، توانیان ئامانجەکانیان بپێکن و دەنگی نارازی بووی ئۆپۆزیسۆن کپ بکەن.

* پێراگەیشتنی چینی رۆشنبیری لەئەنجامی پرۆسەیەکی درێژخایەن بووە کە بنەماکەی دەگەرێتەوە بۆساڵی ١٩٣٨ و پاشان رووداوە عەرەبیەکان لەپەنجاکانی سەدەی رابردوو کاریگەریان لەسەر پێگەیشتنی ئەم توێژە هەبوو، هەروەها نەوت کاریگەری لەسەر باری ئابووری کۆمەڵگەی کوێتی هەبووە لەرووی ئابووریەوە، بەلأم لەرووی بونیادی هزریەوە ئەو کاریگەریەی نەبووە.

سەرچاوەکان

١ – اسماعيل احمد ياغي(الدكتور) تاريخ العالم العربي المعاصر، ط / ١، الرياض ٢٠٠٠، ص ٩٣.

٢ – صبري فالح الحمدي(الدكتور)، الكويت نشوؤها و تطورها ١٧٥٠ – ١٨٧١، دار الحكمة، لندن ٢٠٠٥، ص١٥٣ –١٥٤.

٣ – بۆدەقی ڕێککەوتنامەکە بڕوانە : عبدالله بن خالد الحاتم، من هنا بدأت الكويت، مطبعة العمومية دمشق صص ١١٣ – ١١٤.

٤ – بۆزانیاری پتر بوانە : فتوح الخترش(الدكتورة)، التاريخ السياسي لكويت في عهد مبارك، ط /١، ١٩٨٥، ص٢٩ وما بعدها.

٥ – حسين محمد(الدكتور)، دول الخليج العربي الحديثة، بيروت ١٩٧٣، ١٧ – ١٨. اسماعيل احمد ياغي، م، س، ص ٩٧–٩٨.

٦ – بۆزانیاری زیاتر لەمەر ڕێککەوتنەکانی ئەو ماوەیە بڕوانە : صبري محمد، الستراتيجية الغربية النفطية في الخليج العربي، منشورات دار الكتاب الجديد ومكتبة المنار، بغداد ١٩٧٤، ص٢٥ – ٢٦.

٧ – حسن سليمان محمود(الدكتور)، الكويت ماضيها، من منشورات المكتبة الاهلية، بغداد ١٩٦٨، ص ١٧٢ – ١٧٣.

٨ – بۆزانیاری زیاتر بڕوانە سایتی ئەلیکترۆنی(مؤتمرنيت) مقال بعنوان سيرة الديموقراطية في الكويت.

٩ – ثناء فؤادعبدالله(الدتور)، اليات التغير الديموقراطي في الوطن العربي، ط /١، مركز الوحدة العربية، بيروت ١٩٩٧، ص ١٣٥.

١٠ – حسن سليمان محمود، م. س، ص ١٧٢.

١١ – ثناء فؤدا عبدالله، م. س، ص ١٣٥.

١٢ – محمد الحسين عبدالعزيز، حضارة الكويت و دول الخليج العربي، دار القبس للسعافة والطباعة، كويت ١٩٧٥، ص ٨٨.

١٣ – عبدالعزيز حسين، المجتمع العربي بالكويت، ط /٢، دار قرطاس للنشر و التوزيع، كويت ١٩٩٤، ص ١١١.

١٤ – ثناء فؤاد عبدالله، م. س، ص ١٣٥.

١٥ – مفيد الزيدي(الدكتور)، التيارات العسكرية في الخليج العربي ١٩٣٨ – ١٩٧١، بيوت ٢٠٠٠، ص ١٣١.

١٦ – محمد حسن العيدروس(الدكتور)، تاريخ الكويت الحديث و المعاصر، دار اكتب الحديث، ٢٠٠٢، ص ٢٠٥ – ٢٠٦.

* بۆزانیاری پتر دەربارەی هەرەشەکانی عێراق لە کوێت بروانە :

محمد الحسين عبدالعزيز، حضارة الكويت و دول الخليج العربي، دار القبس للطباعة والنشر، كويت ١٩٧٥، ص ٤٢ – ٤٨.

١٧ – ثناء فؤاد عبدالله، م. س، ص ١٣٦.

١٨ – صبري فارس الهيتي(الدكتور)، الخليج العربي، دار الطباعة الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٨، ص ٦٥. حسين محمد البحارنة، م. س، ص ٩٠.

١٩ – عبدالله الحاتم، من هنا بدأت الكويت، مطبعة العمومية دمشق، ص ٣٧٩، حسن سليمان محمود، م. س، ص٣٦٧.

٢٠ – جريدة الكويت اليوم، الاحد، ١٩٤٤ أغسطس ١٩٦١.

٢١ – حسن سليمان محمود، م. س، ص٣٦٦.

٢٢ – حسين محمود الجارنة، م. س، ص ٩٢، محمد الحسنيني عبدلعزيز، م. س، ص ٦٤.

٢٣ – محمد حسن الحيدروس، م. س، ص ٢٠٦.

٢٤ – محمد الحيني عبدالعزيز، م. س، ص ٩٣.

٢٥ – بۆزانیاری زیاتر بروانە : يحيى الحجل(الدكتور)، النظام الدستوري في الكويت، كويت ١٩٧١، ص ١٣٤، حسين محمد الجارنة م. س.ص٩٣.

٢٦ – عبدالمالك خلف التهيمي، ابعاث تاريخ الكويت، ط /١، دار القرطاس للنشر، الكويت ١٩٩٨، ص ١٢١.

٢٧ – حسين محمد الجارنة، م. س، ص ٩٤ – ٩٥.

٢٨ – بۆزانیاری زیاتر بروانە : ثناء فؤاد عبدالله، م. س، ص ١٣٧ – ١٣٨.

٢٩ – محمد الحسيني عبدالعزيز، م. س، ص ٦٣.

٣٠ – عبدالمالك خلف الهميمي، م. س، ص ١٢١.

٣١ – مصطفى النجار(الدكتور)، واخرون، تاريخ الخليج العربي الحديث والمعاصر، ط /١، مطبعة جامعة البصرة، البصرة ١٩٨٤، ص ١٨٩.

٣٢ – خلدون حسن النقيب، المجتمع والدولة في الخليج و الجزيرة العربية، مركز الدراسات الوحدة العربية، بيروت ١٩٨٩، ص ١٤١.

٣٣ – حسن سليمان محمود، م. س، ص ٣٦٧.

٣٤ – بۆزانیاری زیاتر سەبارەت بەناونیشانی ئەندامی دەرچوو بروانە سایتی ئەلیکترۆنی WWW.ALMOTAMAR.NET

٣٥ – مفيد الزيدی، م. س، ص ١٢٣.

٣٦ – محمد حسن الحيدروس، م. س، ص ٢٠٦ – ٢٠٧.

٣٧ – مفيد الزيدى، م. س، ص ١٣٣ – ١٣٤.

٣٨ – خلدون حسن النقيب، م. س، ص ١٤١

٣٩ – محمد حسن العيدروس، م. س، ص ٢٩٧.

٤٠ – مفيد الزيدى – م. س، ص ١٣٤.

٤١ – ڕێککەوتنامە بەناوی(الثقافية تنفيق العائدات) بوو. دواتر لەمایسی ١٩٦٧ ئەنجومەن پەسەندی کرد، بۆزیاتر زانیاری بروانە : محمد الحسيني عبدالعزيز، م. س، ص ١٤٠.

٤٢ – محمد حسن العيدروس، م. س، ص ٢٠٧.

٤٣ – خلدون حسن النقيب، م. س، ص ١٤١.

٤٤ – مفيد الزيدي، م. س، ص ١٣٤.

٤٥ – محمد حسن العيدروس، م. س، ص ٢٠٧.

٤٦ – مفيد الزيدي، م. س، ص ١٣٥.

٤٧ – ثناء فؤاد عبدالله، م. س، ص ١٣٦.

٤٨ – مفيد الزيدي، م. س، ص ١٣٥.

٤٩ – محمد حسن العيدروس، م. س، ص ٢١٥.

# پەیوەندی نێوان ئەمریکا ـ میسر
# ١٩٥٢ - ١٩٥٦

هیوا حەمید شریف
قوتابی دکتۆرا

پێشەکی

توێژیەنەوە لەپەیوەندیەکانی نێوان میسر – ئەمریکا لەماوەی نێوان شۆرشی یولیو١٩٥٢ لەمیسر و هێرشی سێ قۆلی بۆسەر میسر ١٩٥٦ گرینگیەکی تایبەتی هەیە، چونکە جگە لەوەی سەرەتاوکۆتایی ئەم توێژینەوە بەدوو روداوی زۆر گرنگ دەست پێدەکات کەکاریگەری نەك هەر لەسەر میسر و ناوچەکە، بەڵکو لەسەر جیهانی ئەوکاتەش هەبوو، چوار ساڵەکەی نێوان دوو روداوەکەش پرە لەململانێ ی ئابووری و سیاسی و سەربازی کەجگە لەمیسر و ئەمریکا چەندین هێزی تری ناوچەکە و جیهان تێدا بەشداربوون، هەروەها بەشێکی گەورەی ململانێیەکان جەنگی ساردن لەناوچەکە بەگشتی و میسر بەتایبەتی ئەنجامدەدرا.

سەرەتای پلانەکانی ئەمریکا بۆدەستگرتن بەسەر ناوچەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست لەم سەردەمە دەست پێدەکات، بۆئەمەش پێیوابوو میسر دەرگایەکە لەوێوە دەتوانێ هەموو ئامانجەکانی بێنێتەدی، لەبەرامبەر میسر لەو سەردەمەدا کە دەسەلاتێکی شۆرشگێرانە حوکمرانی دەکرد، مەسەلەی ناسیونالیزمی عەرەبی تێدا گەیشتبووە لوتکە بۆیە نەك هەرخۆی پاشکۆیەتی ولاتانی زلهێزی رەتدەکردەوە، بەڵکو هەوڵیدەدا ولاتانی تری عەرەبیش لەم پاشکۆیە تیە رزگار بکات.

دەروازە :

پەیوەندی نێوان ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و میسر پێش شۆرشی ١٩٥٢
ولاَتە یەکرتووەکانی ئەمریکا تا جەنگی دووەمی جیهانی بایەخێکی گەورەی بۆ رۆژهەلاَتی ناوەراست بەگشتی و میسر بەتایبەتی نەبوو، رەنگە ئەمەش بگەرێتەوە بۆ ئەوەی ئەمریکا تائەوکاتەش لەژێرکاریگەری ئامۆژگاریەکەی سەرۆك (جورج واشنطن ١٧٨٩-١٧٩٧) مابێتەوە، کاتێ لەدوا وتاری ساڵی (١٧٩٦) ئامـاژەی بـۆ ئـەوەکردبوو کەپێویـستە ئـەمریکا بـەهیچ شـێوەیەك نەچێتەناوکێشەتایبەتیەکانی ئەوروپا، بەوپێیەمیسریش بەشێك بوو لەکێشەکانی ئەوروپاو بەهۆی نزیکی لەرووی جوگرافیاوە لەکیشوەری ئەوروپا، بۆیە هەمیشە خۆی بەدوور دەگرت لەکاروباری سیاسی میسر (١).
پەیوەندییـە – ناسیاسـیەکان – ولاَتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بەمیـسر، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەست پێدەکات و خۆی لەچەند چالاکیەکی مرۆڤانـە دەدۆزێتـەوە و مـۆرکێکی خزمـەتگوزاری پێوەدیـارە، وەك بوارەکـانی تەندروستی و خوێندن و ئایین، کەرێژەیەکی زۆری ئەم خزمەتانـە لەرێگـە نێـردە موژدەدەرەکاَنـەوە ئـەنجام دەدرا (٢)، دوای پێـشکەشکردنی چـەند خزمـەتێك لەساڵی ١٨١٩، یەکەم قونسلخانەی ئـەمریکی بەشـێوەیەکی فـەرمی بەمەبەسـتی فراوانکردنی چالاکیەکان لەساڵی ١٨٣٢ لەمیسر کرایەوە (٣).
موژدەدەرەکان پاش ماوەیەکی کەم توانیـان خزمـەتی جۆراوجـۆر بەشـێوەیەکی رێکخراوپێـشکەش بەدانیـشتوانی میـسر بکـەن، بەتایبـەتی لەدروسـتکردنی قوتابخانـە و نەخۆشـخانە کەئەمانـە کاریگـەری باشـیان هـەبوو لەراکێـشانی سەرەنجی میسریەکان، چونکە ئەوان لەسایەی حوکمرانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر بێبـەش بـوون لـەم خزمەتگوزاریانـە، لـەم چوارچێوەیەشـدا یەکـەم قوتابخانـەی

ئەمریکی لەهەموو جیهانی عەرەب لەناوچەی (صعید) لەساڵی ١٨٦٥ دامەزرا، بەناوی (کۆلێژی ئەسیوتی ئەمریکی) (٤).

یەکێکی تر لەوبوارانەی ئەمریکیەکان لەمیسر چالاکی تێدا ئەنجامدا، پشکنینی شوێنەوارە کۆنەکان بوو، بۆئەمەش لەکۆتایەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، ژمارەیەك زانای شوێنەواری ئەمریکی دەستیان بەپشکنینی شوێنەوارەکانی میسر کرد، بەلاَم دیارە ئینگلیزیەکان رێگریان لێکردوون، ئەمەش لەم سکالاَنامەیە دەردەکەوێ کەسەرۆکی ئەم گروپە بۆسەرۆکی ئەمریکا (ووردو ویلسن ١٩١٣-١٩٢١) ناردوویەتی (٥).

لەبواری بازرگانیش، چالاکی بازرگانە ئەمریکیەکان لەگەڵ هاتنی سەدەی بیستەم لەزیاد بووندابوو، پێش جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨)، ئەمریکیەکان لقێکی کۆمپانیای (سوکونی) یان بۆ نەوت و چەند لقێکی هاوشێوەی لەکۆمپانیای (فاکۆم) یان لەمیسر دامەزراند، ئەمە جگەلەوەی ساڵی١٩١١ لقێکی ژووری بازرگانی ئەمریکیەکان لەمیسر دامەزراند، کەکاری رێکخستنی هێڵی گواستنەوەی دەریایی بوو لەنێوان ئەمریکا و وڵاتانی رۆژهەلاَتی ناوەراست (٦).

هەروەها ژمارەیەك لەئەفسەر و دادوەریش لەسەردەمی (خدێوی ئیسماعیل ١٨٦٣-١٨٧٩) لەسوپاودادگاکانی میسر کاریان دەکرد، رەنگە هۆکاری کارکردنی ئەمانە لەدام و دەزگاکانی میسر بۆ ویستی حکومەتەکەی بگەرێتەوە، کەهەوڵیدەدا مامەڵەی لەگەڵ ئەو هێزە گەورانەی جیهان بکات، کەچاوتێبرینی سیاسیان بۆ میسر نییە، ئەمەش زیاتر بۆ رووبەرووبوونەوەی فشار و دەستێوەردانەکانی ئینگلیز و فەرەنسیەکان بوو لەکاروباری میسر (٧).

بەپێ ی راگەیاندنی ٢٨ی شوباتی ١٩٢٢ وڵاتی میسر سەربەخۆیی - ناتەواوی - پێبەخشرا، حکومەتی ئەمریکی دانینا بەم سەربەخۆییە، بەلاَم سەرەرای ئەمەش

پەیوەندیەکانی نێوانیان لەهەردوو دەیەی (بیستەکان و سییەکان) زۆر بەخاوی دەرۆیی، لەماوەی دیاریکراو هیچ بابەتێکی گرنگ یان رووداوێکی بەرچاو هەستی پێناکرێ جگە لەمۆرکردنی چەند پەیمانێکی بازرگانی، وەك پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ کەتایبەت بوو بەمەسەلەی گومرگ، کەچی ساڵی ١٩٣٧ بەدواوە پەیوەندیەکانی نێوانیان گەشەسەندنێکی باشی بەخۆوە بینی، ئەمەش دەرئەنجامی ئەوپشتگیریەی ئەمریکا بوو لەمیسر لەکۆنگرەی (مونترو ١٩٣٧) بۆ رەتکردنەوەی جیاوکی بیانی لەمیسر (٨).

لەماوەی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩-١٩٤٥) ئەمریکا یارمەتیەکی زۆری میسریدا لەبواری ئابووری و هونەری، ئەمەش لەبەرامبەر ئەوئاسانکاریانە بوو کەمیسر بۆهێزەکانی ئەمریکی و بەریتانی لەشەرەکانیان دژی هێزەکانی ئەڵمانیا بۆی دابین دەکردن، هەروەها بۆئاسان تێپەربوونی کەشتیە بازرگانیەکانیان بوو لەنۆکەندی سوێس و ئاوەکانی میسر (٩).

دوای جەنگی دووەمی جیهانیش، کاتێ جەنگی سارد (١٩٤٦-١٩٩١) دەستیپێکرد و جیهان بەسەر دوو سەربازگەی رکابەر دابەشبوو، ولآتەیەککگرتووەکانی ئەمریکا وەك زلهێزێك سەرکردایەتی سەربازگەی رۆژئاوای دەکرد، سیاسەتی گۆشەگیری پشتگوێ خست و بایەخی ناوچەکانی رۆژهەلآتی ناوەراستی بەهەند وەرگرت و گرنگی تایبەتی پێدا، بەتایبەتی کاتێ ئەوناوچەیە بەهۆی ئەوسامانە نەوتیە گەورە و شوێنە جوگرافیەکەی بووە ستراتیژترین ناوچەی جیهان لەم سۆنگەیەوە ئەمریکا هەوڵیدەدا دەسەلآتی خۆی لەم ناوچەیە جێگیربکات و هەستیشی بە وەدەکرد ئەوئامانجەی لەرێگای پتەوکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ میسر مسۆگەر دەبێت، چونکە پێی وابوو میسر دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەمریکایە بۆناوچەکە (١٠).

بەشی یەکەم / شۆرشی ١٩٥٢ و هەڵوێستی ئەمریکا :

لەسەرەتای پەیوەندیەکان :

سەرەتای پەیوەندی حکومەتی ئەمریکا و سەرکردەکانی شۆرسی یولیوی ١٩٥٢. دەگەرێتەوە بۆماوەیەك پێش ئەنجامدانی شۆرشەکە، ئەمەش بەواتای پەیوەندی نێوان دبلۆماسییە ئەمریکیەکان و ئەفسەرە ئازادەکان.

ئەفسەرە ئازادەکان یەکەم کۆبونەوەی خۆیان لەساڵی ١٩٤٧ ئەنجامداوە، ساڵی ١٩٤٩ (نۆ) لەم ئەفسەرانە خۆیان لەچوارچێوەی رێکخراوێك بەناوی (بزوتنەوەی ئەفسەرانی ئازاد) رێکخست، بۆساڵی دواتر (جەمال عەبدولناسر) یان بەسەرۆکی ئەم رێکخراوە هەڵبژارد، بەهەمان شێوە بۆساڵانی ١٩٥١ و ١٩٥٢ بەسەرۆکی رێکخراوەکە هەڵیانبژارد ئامانجی سەرەکی ئەم رێکخراوە دەرکردنی بەریتانیا لەمیسر و لابردنی شا (فاروق)لە دەسەلأت بوو (١١).

پسپۆرانی کاروباری رۆژهەلأتی ناوەراست پێیان وایە دبلۆماسە ئەمریکیەکان پێش شۆرش پەیوەندیان بەرێکخراوی بەئەفسەرە ئازادەکان هەبووە، بۆئەمەش ئەندامێکی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی ئەوکات (میلز کوبلاند) ئاماژە بۆئەوە دەکات، کەپەیوەندی و چاوپێکەوتن لەنێوان (کرمیت روزلفت) و هەندێ لەئەندامە نهێنیەکانی ئەو رێکخراوە هەر لەمارسی ١٩٥٢ هەبووە (١٢).

هەندێ سەرچاوەش ئاماژە بۆئەوە دەکەن، ئەفسەرە ئازادەکان کاتێ دەسەلأتیان گرتە دەست لەمیسر، پەیوەندیان بەبالوێزخانەی ئەمریکا کردووە لەقاهیرە، پێیان راگەیاندون کە ئامادەییان تێدایە بۆهاوکاریکردنیان دژی پەرەسەندنی شوعیەت، لە بەرامبەردا ئەمریکا یارمەتی دارایی و کەل و پەلی سەربازیان پێبدا، تەنانەت ئەمادەیی خۆیان بۆ بەشداریکردن لەرێکخراوی بەرگری لەرۆژهەلأتی ناوەراستیش دەربریووە (١٣).

جێگـای ئامـاژە پێکردنـە پەیوەنـدی ئـەمریکا بەسـەرکردەکانی شـۆرش، پـێش شۆرشەکە بووبێـت یـان لـەرۆژانی یەکـەم، یـاخود هەرنـەبووبێ، هـیچ لەوبایەخـە نـــاگۆڕێ کەئـــەمریکا بۆرووداوەکـــانی نـــاوخۆی میـــسر هـــەیبووە، ئەمـــەش لەچوارچێوەی ئەو ململانێ سیاسـیە لـەنێوان زلهێزەکـان هـەبوو بـۆجێگیرکردنی بەرژوەندیەکانیان و سەپاندنی دەسەلاتیان بەسەرناوچەکە.

(هاوپەیمانی و چەك) کاریگەری بەسەر پەیوەندیەکانی ئەمریکا و میسر :.

ئامـانجی سیاسـەتی ئـەمریکا لەرۆژهـەلاتی ناوەراسـت، بـریتی بـوو لـەرێگرتن لەبلاوبوونەوەی شوعیەت بـەبێ ئـەوەی پێکـەوتنی سـەربازی لەگـەڵ زلهێزەکـان روویدات، هەروەها پاراستنی بەرژەوەندییە ئابووریـەکانی بەتایبـەتی دەسـتگرتن بەسـەر نـەوتی یـەدەگی ناوچـەکە و بـەکراوەیی هێـشتنەوەی رێگـا دەریایـەکانی نێوان هیند و رۆژهەلات (١٤). بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە ئەمریکا دوو رێگەی گرتە بەر :.

١- سیستەمی بەرگری لەرۆژهەلاتی ناوەراست دابمەزرێنێ، ناوەندەکەی قـاهیرە بێت.

٢- یارمەتیـدانی ولاتـانی ناوچـەکە لـەرووی داراییـەوە بەمەبەسـتی پێشخـستنی ناوچەکە لەرووی ئابووریەوە (١٥).

بۆئەمەش ئەمریکا بـەوردی چـاودێری روداوەکـانی ناوچـەکەی دەکـرد، هـەروەها کاری دەکرد بۆگەمارۆدانی دەسەلاتدارانی میسر، تابەشێوەیەك ئاراستەیان بکات کەلەگەڵ ئامانج و پلانەکانی یەکبگرنـەوە، چـونکە سیاسـەتمەدارە ئەمریکیـەکان مەترسیان هەبوو لەونیزامە نوێیەی میسر بەوپێیەی ئاراستەیەکی شۆرشگێرانەی هەیە، بەرەو هاوپەیمانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بروات، ئەوبێ متمانەییە وایکرد

پەیوەنـدی نێـوان ئـەمریکا و میـسر لەچـەند مـانگی سـەرەتای شۆرشـەکە ناجێگیربێت (١٦).

بۆدڵنیـابوون لەیـەکتری، چـەند چـاوپێکەوتنێك لـەنێوان لێپرسـراوانی هـەردوولا سـازکرا، یەکـەم یـەکتر بینـین لـە١٢ی ئـابی ١٩٥٢ لـەماڵی (عەبـدولنعیم ئـەمین) لێپرسـراوێکی میـسر و دۆسـتێکی نزیکـی ئەمریکیـەکان بـوو ئەنجامـدرا، لایـەنی ئـەمریکی هەریـەك لەراوێـژکاری باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا لـە میـسر و (روبـرت مالکلینتون) وەزیری مفەوەز لەباڵیۆزخانە و (ویلیام لیکلاند) ئامـادەبوون لایـەنی میسریش (جەمال عەبدولناسر) و (عەبـدوالحکیم) و ( سـەلاح سـالم) بەشـداربوون ئـەم دانیـشتنە نزیکـەی چـوار کاتـژمێری خایانـد، تێـدا هەوڵـدرا لەسیاسـەت و بەرنامەی یەکتری بگەن (١٧).

بۆبـەدیهێنای ئامانجـەکانی ئـەمریکا هەوڵیـدەدا سـەرنجی دەسـەڵاتدارانی میـسر رابکێشێت ئەوەتا لەیەکێك لەدانیـشتنەکانی تـری نێوانیـان، کـەباڵیۆزی ئـەمریکا لەمیـــسر (جیفرســـون کـــافری) تێـــدا بەشـــدارە، بـــەڵێنی ئاســـایکردنەوەی پەیوەندیەکانی میسر لەگەڵ بەریتانیان پێدەدا، هەرلەم چوارچێوە باڵیۆزخانـەی ئەمریکا لە١٩ی ئـابی ١٩٥٢ لەراگەیاندنێکدا ئـەوەی خـستە روو، ئـەمریکا خـۆی بەلایەنگری حکومەتی میسر دادەنێت، ئەمەش زیاتر بەمەبەستی دەربـڕینی نیـاز پاکی بـوو بـۆ دروسـتکردنی پەیوەندیـەکی راسـتەوخۆ لـەنێوانیان، لێپرسـراوانی میـسر بـەم هەڵوێـستە دڵخـۆش بـوون لەبەرامبـەردا بـەریتانیا نـارەزایی خـۆی دەربری(١٨).

ئـەوەی ئامـاژەمـان پێـدا، هـەمووی دەستپێـشخەری بـوون بۆدانپێنـانی ئـەمریکا بەشێوەیەکی فەرمی بەدەسەڵاتی نویێ ی میسر، کەئەمـەش لـە٢ ئـەیلولی ١٩٥٢ لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (دین ئیشزو) راگەیەنرا(١٩). هەروەك پێـشوتر

ئاماژەمان بۆکردووە ئەمریکا لەم شێوە مامەڵەکردنە ئامانجی خۆیان هەبوو، ئەمەش لەبەڵگەنامەیەکدا بەروونی ئامـاژەی بـۆکراوە : (ئێمەرازین لەسەر پشتگیریکردنی یارمەتیدانی ئەم دەسەلاتە نوێیەی میسر، تائامانجەکانمان بێتەدی لەنزیك بوونەوەی بەرژەوەندیەکانی میسر و رۆژئاوا، بەتایبەتی بەشداریکردنی میسر لەپرۆژەکانی بەرگری هاوبەش و یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکانی میسر – ئینگلیز، هەروەها ئاشتی نێوان میسر – ئیسرائیل) (٢٠).

لێرەدا دەتوانین بڵێین پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولا لەچەند مانگی سەرەتای شۆرش سەرەرای دڵنیانەبوون لەیەکتر، پەیوەندیەکی دۆستانەبوو، و هەریەك لەم دوو ولاتە هەوڵی راکێشانی بەرامبەری دەدا بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی خۆی، بەتایبەت ئەمریکا ئەوکات هەوڵی گەورەی راکێشانی میسر بوو بۆناو پلانە بەرگریەکانی دژی یەکێتی سۆڤیەتی لە رۆژهەلاتی ناوەراست.

یەکێکی تر لەوخالانەی کەرۆڵی کاریگەری هەبوو لەئالۆزکردنی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و میسر، و بوو بەسەرچاوەی سەرهەڵدانی زۆر لەکێشەکانی تر، مەسەلەی داواکردنی چەند لایەنی میسر، بۆئەمەش دەسەلاتدارانی میسر ئەمریکایان بەباشترین سەرچاوە دادەنا لەبەرامبەردا ئەمریکا هەوڵی خۆشاردنەوە و بەفیرۆدانی کاتی دەدا، ئەمەش پەیوەندی هەر بەهەریەك لەبەریتانیا و ئیسرائیل هەبوو، چونکە ئەمریکا وایدەبینی ئەم چەکانە دژی ئەوان بەکاردێت (٢١).

لەراستیدا تێروانینی ئەمریکا بۆ مەسەلەی چەك بەمیسر تەواوبوو، چونکە گەورەترین ئامانجی دەسەلاتدارانی نوێ ی میسر دوای لەناوبردنی سیستەمی پاشایەتی، دەرکردنی هێزەکانی بەریتانیا بوو لەمیسر، ئەمەش بەروونی لەوتارێکی (جەمال عەبدولناسر) دەردەکەوێ کەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٥٢

پێشکەشی کرد، کەتێداهاتبوو (پێویستە داگیرکەر وڵاتەکە جێبهێڵێت و بڕوا ).
بۆیە ئەم داوایەشیان لەئەمریکا دەکرد، چونکە لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا پەیوەندیان خراپ بوو، یەکێتی سۆڤیەتیش ئەوکات سەرقاڵبوو بەبەهێزکردنی دەسەڵات و پێگەی خۆی لەئەوروپا، بۆیە دەسەڵاتدارانی نوێ ی میسر وایاندەبینی ئەمریکا باشترین سەرچاوەیە بۆدابینکردنی چەك، بەتایبەتی ئەمریکا لەسەرەتای شۆرشەکە نیازپاکی خۆی بۆ میسر نیشاندابوو (٢٢).
لەسەر ئەم بنەمایە میسریەکان هەر لەسەرەتای دروستبوونی پەیوەندیان بەئەمریکا لەهەموو دانیشتن و چاوپێکەوتنێکیان داوای چەکیان دەکرد، تاگەیشتە رادەیەك بەریتانیا هەستیان پێکرد، بۆئەمەش داوایان لەئەمریکیەکان کرد ئامۆژگاری میسریەکان بکەن بۆ پەیداکردنی چەك روو لەبەریتانیا بکەن، بەلآم ئەمریکیەکان ئەم هەڵوێستەیان وەرنەگرت (٢٣).
ئەمریکیەکان لەسەر یاریبە سیاسیەکانی خۆیان بۆ پێدانی چەك بەمیسر بەردەوام بوون، ئەوەتا (ویلیام فوستر) ی یاریدەدەری وەزیری بەرگری ئەمریکا لەوسەردانەی کە لە٢ی تشرینی دووەمی ١٩٥٢ بۆمیسر ئەنجامدا، دوای کۆبوونەوەکان داوای لیستێکی لەمیسریەکان کرد کەتێدا ناوی ئەوچەکانە بنوسرێ کەمیسر پێویستیەتی (٢٤). جگەلەمەش داوایان لەمیسر کرد نێردراوێك بنێرێ بۆ (واشنطن) تالەگەڵ وەزارەتی بەرگری گفتوگۆ بەکەن بۆئەمەش حکومەتی میسر (عەلی سەبری) بەرێوەبەری نوسینگەی عەبدولناسر و ژمارەیەك ئەفسەری رەوانکرد، بەلآم ئەم سەردانە هیچ بەرهەمێکی نەبوو، بەبیانوی ئەوەی ئەمەش سەرقاڵی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیە و چاوەرێ ی ئەنجامەکان دەکەین، چونکە لێپرسراوەتی پێدانی چەك لەئەستۆی سەرۆکی نوێیە (٢٥). لەمەوە سەرەتای سیاسەتی ئەمریکا بۆ میسریەکان دەرکەوت، بەتایبەتی دوای

سەردانێکی تری لێپرسراوێکی میسری ( محمد حسن هیكل) بۆ ئەمریکا، ئەمەش کاتێ (ژەنرال ئولمستید) سەرپەرشتیاری بەرنامەی یارمەتی سەربازیەکانی دەرەوە، بەئاشکرا پێیوتبوو : پێدانی چەك بەرامبەرهاتنی میسر بۆ ناوهاوپەیمانەتیەکانی ئەمریکا لەرۆژهەلأتی ناوەراست (٢٦).

ئەم سیاسەتە راشکاوانەی ئەمریکا بەتەواوەتی لەسەردانەکەی (جون فوستەر دالاس) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە١١ی ئایاری ١٩٥٣ بۆمیسر کردی بەدیارکەوت، ئەمە دوای ئەورووبەروبوونەوە توندە لەنێوان ناوبراو و عەبدولناسر روویدا، کاتێ عەبدولناسر رەتیکردەوە بچێتە ناو هاوپەیمانەتیەك لەناوچەکە دژی سۆڤیەت (٢٧).

لەگەڵ هەموو ئەورووداوانەش، پەیوەندیەکانی نێوانیان بەبنبەست نەگەیشت، بەتایبەتی سوپا ئەوکاتە پەیوەندیەکی دۆستانەی لەگەڵ لێپرسراوە ئەمریکیەکان هەبوو ئەمەش لەسەردانی ئەو (٦٠) ئەفسەرەی کۆلێژی ئەرکان کەدەرچووی خولی (١٣) بوون بۆ ئەمریکا بەدیاردەکەوێ، کەلەسەر داوای وەزارەتی جەنگی ئەمریکا ئەم سەردانەیان ئەنجامدا.

دوای رێککەوتنی نێوان میسر و بریتانیا لەتەموزی ١٩٥٤، کەرێککەوتن لەسەر هێزەکانی بەریتانیا میسر جێبهێڵێ، لەمانگی ئابی هەمان ساڵ بەریتانیا یاسای رێگرتنی هێزی چەکی لەسەر میسر هەڵگرت، دوای ئەم بریارە حکومەتی میسر مانگی دواتر شاندێکی سەربازی بەسەرۆکایەتی لیوا ( مەحەمەد ئیبراهیم ) سەرۆکی ئەرکانی سوپا نارد بۆ ئەمریکا بەمەبەستی بەدەستهێنانی چەك، بەلأم چوونی ئەم شاندەش ئەنجامێکی باشتری لەشاندی یەکەم بەدەست نەهێنا، ئەمەش بەهۆی کات بەفیرۆدان و خۆدزینەوەی ئەمریکا لەم بابەتە (٢٨).

بەشی دووەم / ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکان ئەمریکا – میسر :.

١ – کرینی چەك لەسۆڤیەت :

لەراستیدا نەگەیشتنەیەکی ئەمریکا و میسر لەدوو ساڵی یەکەمی دوای شۆرشی ١٩٥٢، بۆجیاوازی سیاسەت و بەرژەوەندی نێوانیان دەگەڕێتەوە، هەوڵەکانی ئەمریکا لەراکێشانی میسر بۆ پرۆژە بەرگریەکانی لەناوچەکە، لەکاتێك دابوو کەدەسەلاتدارانی میسر لەلوتکەی بیری ناسیونالیزمی و دژایەتی دەسەلاتی داگیرکەران بوو، لەلایەکی تر لایەنی ئەمریکا بۆ ئیسرائیل هۆکارێکی تری ئەم پێکنەگەیشتنە بوو، چونکە ئەمریکا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ رێگری دەکرد لەبەدستهێنانی چەك لەلایەن ولاتانی عەرەبی بەتایبەتی ولاتانی دەوروبەری ئیسرائیل کەمیسر یەکێك بوو لەوان.

دوای ئەوەی لێپرسراوانی میسر بێ ئومێد بوون لەبەدەستهێنانی چەك لەئەمریکا سەرەتای بیرۆکەی دابینکردنی چەك لەیەکێتی سۆڤیەت سەریهەلدا، بۆئەمەش میسر بریاری ناردنی یەکەم شاندی بۆ ولاتانی سوشیالیستی دا، رۆژنامەیەکی میسری هەواڵی ئەم سەردانەی بەمانشێتێکی گەورە نوسیبوو – کەبۆ ئەوکات زۆر سەرەنج راکێش بوو بەم شێوەیە سەرۆك دەڵێ : ولاتانی سوشیالیستی لەتواناياندایە پێویستیەکانی میسر لەچەك پر بکەنەوە : ئەمە سەرەرای ئەوەی وەك فشارێك بوو بۆ سەر ئەمریکا، سەرەتای بیرکرنەوەش بوو لای میسریەکان بەم ئاراستەیە (٢٩).

پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکا و میسر بەتێپەربوونی کات ئالۆزتردەبوو، وەهەریەك لەم دوولایەنە فشاری دەخستە سەرلایەنی بەرامبەر بۆهێنانەدی ئامانجەکانی، بەلام رووداوەکەی (٢٢ شوباتی ١٩٥٥) بارودۆخەکەی تەواو گۆری ئەمەش کاتێ هێزەکانی ئیسرائیل لە (غزە) هێرشیان کردە سەرهێزەکانی میسر

و ژمارەیەك لەسەرباز و ئەفسەریان لێكوشتن، ئیتر میسریەكان دوای ئەم رووداوە پێیان وابوو مەسەلەی بەدستهێنانی چەك پێویستیەكی ژیانیە و بەهەرنرخێك بێت دەبێت بەدەستی بێنن (٣٠).

لەگەڵ هەموو ئەمانەش، میسر دواهەوڵی خۆی لەگەڵ ئەمریكا دەدات، ئەمەش لەئەنجامی ئەوچاوپێكەوتنەی لەحوزەیرانی ١٩٥٥ لەنێوان (عەبدولناسر) و (هنری بایرۆج) بالوێزی ئەمریكا رێكخرابوو، كە تێدا (عەبدولناسر) ئەوەی خستەروو كەمیسر زۆر پێویستی بەچەكە و بۆئەمەش روو لەئێوەدەكەین، هەرچەندە بالوێزی ناوبراو ئەم داوایەی گەیاندە حكومەتی ئەمریكا، بەلأم هیچ هەلوێستێكی تازە پێشان نەدرا بۆیە بوارێك بۆ دەسەلأتدارانی میسر نەمایەوە جگە لەپەنابردن بۆ یەكێتی سۆڤیەت (٣١).

لەم بارودۆخە ئالۆزەدا (عەبدولناسر) بریاریدا بەشداری بكات لەكۆنگرەی (بانكۆك) كەتایبەت بوو بەكۆبونەوەی ( بزوتنەوەی ولأتانی بێلایەن ) كە ١٧نیسانی ١٩٥٥ دەستی بەكاركردن كرد، میسر لەكاتی كۆبوونەوەكانی ئەم كۆنگرەیە لەرێگای ولأتە دۆستەكانی توانی بەلێنی یارمەتی سەربازی لەیەكێتی سۆڤیەت وەرگرێت، بەلأم میسر زۆر بەئاگادارییەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەم هەنگاوە دەكرد، چونكە دەیزانی ئەمە دەبێتە هۆكاری رووبەرووبوونەوەیەكی راستەوخۆ لەگەڵ هەریەك لە ئەمریكا و بەریتانیا (٣٢).

لە ٣١ی ئابی ١٩٥٥ ئەم هەنگاوەی میسر بوو بەكردار، كاتێ شاندێكی رەوانەی ولأتی چیكوسلوڤاكیا كرد بۆ مۆركردن لەسەر ئەم سەفقیەی چەك، كۆبونەوەكان بەسەركەوتن تەواو بوو، سەبارەت بەهەڵبژاردنی چیكوسلوڤاكیا بۆ بەستنی ئەم سەفقیە، دیارە ئەمە لەسەر پێشنیاری سۆڤیەت بوو، تاپەیوەندیەكانی لەگەڵ ئەمریكا و ئیسرائیل بەرەو ئالۆزكردن زیاد نەچێ. هەرچەندە هەوڵدرا ئەم كارە

بەنەهێنی ئەنجام بدرێ، بەلاَم دەزگای هەواڵگیریەتی ئەمریکا بەمەیانزانی و لایەنە پەیوەندارەکانی خۆیان ئاگادار کردەوە (٣٣).

وەك ئاماژەمان پێدا، ئەمریکیەکان زانیاریان لەسەر ئەم رێککەوتنە نهێنیە هەبوو بۆیە ئەم کارەیان بۆچەند دەزگایەکی میسر درکاندبوو، ئەمەش شتێکی لەبەردەم میسر نەهێشت جگە لەئاشکراکردنی رێککەوتنەکە، بۆئەمەش (عەبدولناسر) کردنەوەی پێشنگایەکی وێنەی فۆتۆگراف کەلەلایەن کاروباری گشتی هێزە چەکدارەکانەوە رێکخرابوو بەدەرفەت زانی و لە٢٧ی ئەیلولی ١٩٥٥ رێککەوتنەکەی بۆهەموو جیهان راگەیاند (٣٤).

راگەیاندنی رێککەوتنەکە کەبەشێوەیەکی ئاشکرا، جگەلەوەی هەنگاوێکی سیاسی گەورەبوو ئەوەشی نیشاندا کەمیسر ولاَتێکە توانای هەیە نەخشەی ستراتیژی خۆی لەگۆرەپانی نێودەوڵەتی بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەبێ هێزە گەورەکانی رۆژئاوا بکێشێ، کەئەمەش بۆ ئەمریکیەکان نیگەرانیەکی گەورە بوو، بۆیە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (ئایزەنهاوەر) کەلەنەخۆشخانە کەوتبوو فەرمانێکی دەرکرد کەبریتی بوو لەراگرتنی بەندەکانی رێککەوتنی دابینکردنی چەك بۆمیسر(٣٥).

سەرەرای ئەوەی ئەمریکیەکان ئەم رێککەوتنەیان بەکارێکی مەترسیدار لەقەڵەم دا، بەجدی هەوڵیشیاندا جێبەجێکردنەکە رابگرن بۆئەمەش (کیرمیت رۆزفلت) یان رەوانەی قاهیرە کرد و پەیامەکەی لە ٨ ئەیلولی ١٩٥٥ بەدەسەلاَتدارانی میسر راگەیاند، کەبریتی بوو لەوەی ئەمریکا هەڵوێستی توند وەردەگرێت لەکاتی جێبەجێکردنی ئەم رێککەوتنە، وەك : راگرتنی هەموو یارمەتیەك بۆ میسر، برینی پەیوەندیە ئابووری و کلتوریەکان، لەوانە پەیوەندیە دبلۆماسیەکانیش

بڕن و گەمارۆی هەموو بەندەرەکانی میسر دەدەن بۆ رێگرتن لەگەیشتنی ئەم چەکانە (٣٦).

هەرەشەو فشارەکانی ئەمریکا نەیانتوانی میسر پەشیمان بکەنەوە، ئەمریکا بەردەوام بوو لەهەوڵەکانی ئەمجارە جێگری وەزارەتی دەرەوە (جۆرج ئالین) ی بەنوسراوێکی پرهەرەشەوە نارد بەڵام لەترسی تێکچونی تەواوی پەیوەندیەکان، نوسراوەکەیان نەدا بە (عەبدولناسر)، لەجیاتی ئەوە پێشنیاری پێدانی چەکیان بۆکرد لەرێککەوتنەکەی لەگەڵ سۆڤیەت پەشیمان ببێتەوە بەڵام سەرۆکی میسر بەنێردراوەکەی ئەمریکای راگەیاند، کات بەسەر چووە بۆئەم پێشنیارە لەراستیدا وەك دەرکەوت ئەمریکا بەهیچ شێوەیەك نیازی بەکارهێنانی هێزی نەبوو؛ بەڵکو فشارەکانی تەنها بۆدوورخستنەوەی میسر بوو لەسۆڤیەت، بۆیە کاتێ میسر چەکەکان وەردەگرێت رووبەرووی هیچ پەرچەکردارێکی ئەمریکا نابێتەوە (٣٧).

دوای ئەوەی ئەمریکا هەوڵدەدا رەوشەکە ئارام بکاتەوە، بۆئەمەش حکومەتی ئەمریکا لەکۆتایی مانگی ١٩٥٥ (رۆبرت ئەندرسون) ی بەپەیامێکی ئاشتیانە رەوانەی قاهیرە کرد، ناوبراو چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین و کۆتایهێنان بەگرژی پەیوەندی نێوان میسر و ئیسرائیل خستە روو، بەڵام حکومەتی میسر ئەم پرۆژەیەی بەناتەواو لەقەڵەم دا و رەتیشیکردەوە، شایەنی باسە دەسەڵاتدارانی میسر لەبەرامبەر سیاسەتە نەرمەکانی ئەمریکا، سیاسەتی دژەئاراستەی ئەمریکایان پەیرەو کرد، بۆیە لەم بارودۆخە ئاڵۆزەی نێوان میسر دانینا بەوڵاتی چینی میللی، کەئەمەش نارەزاییەکی زۆری لەلایەن ئەمریکاوە لێکەوتەوە (٣٨).

٢ — پرۆژەی بەنداوی ئەسوان و کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانی ئەمریکا — میسر :

پرۆژەی بەنداوی ئەسوان بەیەکێك لەپرۆژە گرنگ و ستراتیژیەکانی ئابووری میسر دادەنرێت، چونکە جگەلەوەی دەکرا بەسەرچاوەیەك بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا، زەویەکی یەکجار فراوانیشی ئامادە دەکرد بۆ کشتوکاڵ، حکومەتی میسر کاتێ پلانی دانا بۆجێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە، ئومێدێکی زۆری بەیارمەتیە داراییەکانی ئەمریکا بوو، دوای چەند هەوڵێك لەلایەن حکومەتی میسر بۆ ئەم مەبەستە ئەنجامدرا، لە٢٣ی تەموزی ١٩٥٢ (ئایزەنهاوەر) ی سەرۆکی ئەمریکا رایگەیاند : یارمەتی ئەمریکا بۆبەنداوی ئەسوان مسۆگەرە بەومەرجەی میسر هاوکاری سیاسەتی رۆژئاوابێت لەرۆژهەلاتی ناوەراست هەرلەم چوارچێوەیەدا حکومەتی ئەمریکا لە١٧ کانونی یەکەمی ١٩٥٥ بەفەرمی رازی بوو لەسەر بەشداریکردن لەپرۆژەی بەنداوی ئەسوان (٣٩).

وەك دەردەکەوێت یارمەتیدانی ئەمریکا بۆپرۆژەی بەنداوی ئەسوان ئامانجی سیاسی لەپشتەوەبووە، چونکە مەبەستی بوو لەم رێگایەوە چارەسەری کێشەکانی ناوچەکە بکات، ئەمەش لەراگەیاندنێکی جێگری وەزیری دەرەوەی (هربرت هۆفر) دەردەکەوێت کەتێدا ئامارەی بەوەدابوو (بەنداوی ئەسوان لەبەرامبەر ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل) (٤٠).

بەڵام لەوکات و ساتانەدا سیاسەتەکانی میسر بەئاراستەیەك بوو دژی ئەمەریکا. و داننانی بەوڵاتی چینی میللی، کەئەمریکیەکان پێیان وابوو ئەمە دەستوەردانە لەکاروباری نێودەوڵەتی جیهان، هەروەها رانەگرتنی هێنانی چەك لەسۆڤیەت (٤١)، ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆری جوتیارانی باشوری ئەمریکا بەتایبەتی

جوتیارانی لۆکە دژی ئەم یارمەتیانە بوون، چونکە میسر لەبەرهەمهێنانی لۆکە بەناوبانگە (٤٢).

لەبەرامبەر هەموو ئەوهۆکارانە ئەمریکا لە ١٩ تەموزی ١٩٥٦ بریاریدا پێشیان بۆیارمەتیدانی بەنداوی ئەسوان رابگرێ (٤٣). بۆپرکردنەوەی شوێنی ئەمریکا، میسر هەوڵیدا بۆوڵاتێکی تری پێشکەوتو بدۆزێتەوە، تایارمەتی دارایی پێشکەش بکات بۆتەواوکردنی پرۆژەکە. بۆئەمەش روویکردە ئەڵمانیای رۆژئاوا، هەرچەندە ئەڵمانیای رۆژئاوا بایەخی بۆ پرۆژەکە هەبوو، کەسودی بۆکۆمپانیاکانی وڵاتەکەی لێدەکەوێتەوە، بەڵام رەتیکردەوە بەشداربێت لەم پرۆژەیە و یارمەتی دارایی میسر بدات، رەنگە ئەم هەڵوێستەشی بۆ ترسی لەئەمریکا بگەرێتەوە (٤٤).

٣ – هێرشی سێ لایەنە و هەڵوێستی ئەمریکا :.

دوای ئەوەی هەریەك لە ئەمریکا و بەریتانیا یارمەتیە داراییەکانیان بۆپرۆژە بەنداوی ئەسوان راگرت و هیچ وڵاتێکی پێشکەوتوش ئامادەنەبوو شوێنی وڵاتانی ناوبراو بگرێتەوە بۆتەواوکردنی پرۆژەکە. بۆیە حکومەتی میسر وەك پەرچەکردارێك دژی ئەمریکا و رۆژئاوا، لە ٢٦ تەموزی ١٩٥٦ بریاری خۆماڵیکردنی نۆکەندی سوێسی دا، تابەداهاتەکەی پرۆژەی بەنداوی ئەسوان تەواوبکات (٤٥).

لەراستیدا ئەم بریارە بەمەترسیدارترین بریار دادەنرێت کەلەلایەن حکومەتی میسر دەرچووبێت دوای شۆرش، ئەمەش بەهەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت بەرەو سەربەخۆیی تەواوی سیاسی و ئابووری، لەبەرامبەرداهەڵوێستی هەریەك لەبەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا لێکەوتەوە ئەمریکا ئەوکاتە لەسەروبەندی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بوو، بۆیە حکومەتەکەی نەیدەتوانی سیاسەتێکی روونی بەرامبەر بریاری خۆماڵیکردنی نۆکەندی سوێس هەبێت، بۆیە لەبواری ئابووری

فشاریان خستە سەرمیسر و لەم چوارچێوەیەشدا (٦٠) ملیۆن دۆلاری ولاتی میسری راگرت (٤٦). وەکو پێشوتر ئاماژەمان بۆکرد ئەم بەهۆی بارودۆخی ولاتەکەی کەخەریکی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بوون؛ هەڵوێستێکی ئاشکرای بەرامبەر بەم قەیرانە نەبوو، سەرتا هەڵوێستەکانی بەهەمان ئاراستەی سیاسەتەکانی بەریتانیا و فەرەنسا بوو، ئەوەتا لە ١ ئابی ١٩٥٦ هاوار لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا بەتوندی دژی ئەمە بریارەی میسر راوەستا هەروەها لە ١٦ ئابی هەمان ساڵ کۆنگرەیەك کە بۆ (١٨) ولاتی دەریایی بەسترا، هەموو ولاتانی بەشداربوو بەیەك هەڵوێست بوون لەوەی نابێت میسر بەتەنها نۆکەندی سوێس بەرێوەببات، کەلەدواجار ئەم هەڵوێستە بوو بەبریار و ئاراستەی حکومەتی میسر کرد (٤٧).

(ئایزەنهاوەر) لە ٩ تشرینی دووەمی ١٩٥٦ بۆجاری دووەم وەك سەرۆك کۆماری ئەمریکا هەڵبژێردرایەوە، لەکاتی کۆبونەوەیەکدا لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی نەتەوەیی ئەمریکا، پێیانی راگەیاند پرۆژەیەکی هەیە بۆدامەزراندنی رۆژهەلاتی ناوەراستی تازە، وە یەکێك لەگرنگترین کارەکانی ئەم پرۆژەیە لابردنی (جەمال عەبدولناسر)ی سەرۆکی میسرە، ئاشکراشیکرد کەئەم هەنگاوە بەشێوازی توندوتیژی ئەنجام نادرێت بەڵکو لەرێگای گەمارۆیەکی سەختی ئابووری، ئەوەشی درکاند دەبێت ئەمریکا ئەوبۆشایە سیاسیەی بەریتانیا جێهێشتوە پربکاتەوە (٤٨).

بەتێپەربوونی کات هەڵوێستەکانی ئەمریکا بەرامبەر بەم قەیرانە ئاراستەیەکی تری وەرگرت جیا لەهەڵوێستەکانی بەریتانیا و فەرەنسا، بۆنمونە کاتێ بەریتانیا پێشنیاری بۆ ولاتانی (پەیمانی ئەتلەنتی) کرد، لەکاتی تێپەربوونی کەشتیەکانیان بۆنۆکەندی سوێس گومرگ نەدەن، ئەمریکا تاکە ولات بوو ئەم پێشنیارەی رەتکردەوە، ئەمە جگەلەوەی کاتێ هەریەك لە بەریتانیا و فەرەنسا

راپۆرتێکیان لەسەر ئەم قەیرانە پێشکەش بەنەتەوە یەکگرتوەکان کرد، ئـەمریکا لەلایەنی خۆیەوە مۆری نەکرد (٤٩).

کاتێ قەیرانەکە هیچ چارەسەرێکی بۆنەدۆزرایەوە، ئەگەری هەڵیسانی شـەر رۆژ بە رۆژ نزیك دەبوەوە، تا لە ٢٩ تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ ئیسرائیل لەرێگای نیمار دورگەی سینا هێرشی کردە سەر میسر، بۆ رۆژی دواتـر هەریـەك لەبـەریتانیا و فەرەنسا لەگەمەیەکی تـاکتیکی ئاگادار کردنـەوە یـەکیان ئاراسـتەی میـسر و ئیسرائیل کرد کەتێدا هـاتبوو شـەر رابگـرن و هێزەکانیـان (١٠) میـل لەنۆکەنـدی سوێس دووربخەنەوە شایەنی باسە بەریتانیا و فەرەنسا لەئاراستەکردنی ئـەم ئاگادارییـە پرسـیان بەئەمـەریکا نـەکردبوو، کـاتێکیش لەلایـەن هـەردوو وڵاتـی شـەرکەرەوە وەڵامـی ئاگاریەکـە نەدرایـەوە لـە رێککـەوتی ٣١ تـشرینی یەکـەمی هـەمان سـاڵ هەریـەك لەفەرەنـسا و بـەریتانیا هێرشـیان کـردە سـەر وڵاتـە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەر لەسەرەتاوە پشتگیری هێرشە سێ قۆڵیەکەی نـەکرد ئەمـەش چـەند هۆکـارێکی لـەدواوەبوو، ئـەوانیش : بـەریتانیا و فەرەنـسا بـەبێ ئاگـاداری ئـەمریکا ئـەم شـەرەیان دەسـت پێکـرد، هـەروەها ئـەمریکا لەگـەڵ بەکارهێنانی توند و تیژی نەبوو، چونکە پێیان وابوو بەکارهێنانی هێز مەسـەلەی بەرهەمهێنان و کرینی نەوت بۆرۆژئاوا دەخاتە مەترسی و دەسـەڵاتی جـەماوەری (عەبدولناسر) لەناوچەکە زیاد دەکات (٥٠).

هـەر لـەم چوارچـێوەدا، ئـەمریکا لـە ٣٠ تـشرینی یەکـەمی ١٩٥٦ کێـشەکەی بـۆ ئەنجومـەنی ئاسـایش بـەرزکردەوە، بـەڵام هەریـەك لەبـەریتانیا و فەرەنـسا مـافی رەتکردنەوەیان بەکارهێنا چـونکە بریارەکـە داوای راگـرتنی راسـتەوخۆی شـەر و کشانەوی هێزەکانی ئیسرائیلی دەکرد جگەلەمە ئەمریکا دژی جەنگەکە وەستا و فشارێکی گەورەشی خستە سەربەریتانیاوە و لە٢١ تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ

سزای ئابووری و سەربازی خستە سەر ئیسرائیل تەنانەت چەکی ئابووری دژی بەریتانیا و فەرەنساش بەکارهێنا، بەتایبەتی پێدانی نەوت (٥١).

ئینجا ئەمریکا کێشەکەی بردە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان، لە ١ تشرینی دووەمی ١٩٥٦ کۆمەڵە بریارێکی ئەمریکیان پەسەند کرد: کەبریتی بوو لەراگرتنی راستەوخۆی جەنگ و کشانەوەی هێزەکان لەمیسر، لەئەنجامی ئەوفشارە زۆرەی ئەمریکا، هەریەك لە بەریتانیا و فەرەنسا لە ٦ تشرینی دووەمی هەمان ساڵ بەناچاری خۆیان بەدەستەوە دا و بریارەکەیان پەسەندکرد لە ٨ تشرینی دووەمیش ئیسرائیلیش لەچەند شوێنێك هێزەکانی کشاندەوە (٥٢).

شایەنی باسە سەرنەگرتنی پیلانە سێ قۆڵیەکەو پاشەکشەکرنیان تەنها بۆفشارەکانی ئەمریکا نەدەگەراوە، بەڵکو یەکێتی سۆڤیەتیش رۆڵی کاریگەری هەبوو، تەنانەت هەرەشەی هەڵگیرسانی جەنگی سێ یەمی جیهانی کرد (٥٣).

## ئەنجام

لەمیانەی توێژنەوەی ئەم بابەتە گەیشتین بەچەند ئەنجامێك.

١ – ئامانجە سیاسیەکانی میسر و ئەمریکا تەواو پێچەوانەی یەکتر بوون بۆیە بەدرێژایی ماوەی ساڵانی ١٩٥٢ – ١٩٥٦، هەرچەندە هەندێ ماوە پەیوەندی دۆستانەش لەنێوانیان هەبوو، نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك.

٢ – ئەمریکا هەوڵیدەدا ئامانجەکانی لەرێگای فشاری سیاسی و ئابووری بێنێتەدی نەوەك توندوتیژی و بەکارهێنانی چەك.

٣ – میسر هەوڵیدەدا چەکی ئایدیولوژیا و جەماوەر دژی ئەمریکا بەکاربهێنێ لەمەشدا تارادەیەك سەرکەوتوبوو نەك هەر لەمیسر بەڵکو لە وڵاتانی عەرەبیش.

٤ – ئەمریکا لەپەیوەندیەکانی بە میسر، هەردەم بەرژەوەندی ئیسرائیلی لەبەرچاو دەگرت، پارسەنگی هێز لەناوچەکە لەبەرژەوەندی ئیسرائیل بێت.

سەرچاوەکان :.

١ – د. صالح مصطفى المزيني: تأثير العلاقات الامريكية الصهيونية على العلاقات الامريكية المصرية ١٩٤٨ – ١٩٥٦، طبرق، ٢٠٠٢، ص ١١.

٢ – د. رأفت غنيني الشيخ، امريكا و العالم في التاريخ الحديث و المعاصر، مطبعة صحوة، الدوحة، ٢٠٠٦، ص ١٢٩.

٣ – فارس تركي محمود، العلاقات المصرية الامريكية ١٩٩١ – ٢٠٠١، مجلة (دراسات اقليمية) العدد الموصل، ٢٠٠٨، ص ٢١١.

٤ – رأفت، م. س، ص ١٣٠.

٥– م. س، ص ١٣٠.

٦– د. عبدالعظيم رمضان : اوراق من تاريخ مصر، القاهرة، ١٩٩٥، ص ٢٧١.

٧ – رأفت. م. س، ص ١٣١.

٨ – رأفت، م. س، ص ١٧٨.

٩ – المزيني، م. س، ص ١٣.

١٠ – تركي، م. س، ص ٢٦١ – ٢٦٢.

١١ – المزيني : م. س، ص ٩٦ – ٩٧.

١٢ – المزيني : م. س، ص ٩٨.

١٣ – د. فواز جرجس، النظام الاقليمي العربي والقوى الكبرى، مركز دراسات الوحدة العربية بيروت، ١٩٩٧، ص ٥٦.

١٤ – د. عبدالعزيز سليمان نوار و محمود محمد جمال الدين : تاريخ الولايات المتحدة الامريكية في القرن السادس عشر حتى القرن العشرين، ٢٠٠٥، ص ٢٣٤.

١٥ – المزيني : م. س، ص ٨١.

١٦– تركي، م. س، ص ٢٦٢.

١٧ – هيكل، م. س، ص ١٦٥.

١٨ – م. س، ص ١٦٨.

١٩ – المزيني، م. س، ص ١٠١.

٢٠ – هيكل، م.س، ص ١٧٠.

٢١ – فؤاد مطر، بصراحة عن عبدالناصر ( حوار على مدى ٢٠ ساعة مع محمد حسين هيكل ) بغداد، ١٩٨٩.

٢٢ – مطر، م. س، ص ٦٤.

٢٣ -- هيكل، م.س، ص ١٧٧.

٢٤ – أحمد حروش، قصة ثورة ٢٣ يوليو(مجتمع جمال عبدالناصر) ج٢، بيروت، ١٩٧٨. ص٦٢.

٢٥– هيكل، م.س، ص ٦٨. جرجس، م. س، ص ٤٧ – ٤٨.

٢٦ – مطر، م.س، ص ٦٥.

٢٧ – حروش، م. س، ص ٦٣.

٢٨ – ن. م، ص ٦٤.

٢٩ – جمال الشليبي : محمد حسين هيكل، استمرارية، أم تحول، ت، حياة الحوك عطية، بيروت ١٩٩٧، ص ١٣٦.

٣٠ – الشلبي، م. س، ص ٦٤.

٣١ – جميل مطر و د. علي الدين هلال، النظام الاقليمي العربي، دراسة في العلاقات السياسية العربية ط٦، بيروت، ١٩٩٩، ص ٨٢.

٣٢ – الشلبي : م. س، ص ١٣٩، جرجس : م. س، ص٦٢ – ٦٢.

٣٣ – حروش، م. س، ص ٦٩.

٣٤ – الشلبي، م. س، ص ١٤، م. س، ص ٧٦.

٣٥ – حروش، م. س، ص ٧٢.

٣٦ – الشلبي، م. س، ص ١٤١.

٣٧ – مطر، م. س، ص ٧٢.

٣٨ – مطر، م. س، ص ٧٢.

٣٩ – حروش، م. س، ص ٧٨–٧٩، العدول و الاخرون، م. س، ص ٣٨٥.

٤٠ – المزيني، م. س، ص ١٤٤–١٤٥.

٤١ – حروش، م. س، ص ٨٢.

٤٢ – جرجس، م. س، ص ٨٦.

٤٣ – المزيني، م.س، ص ١٤٨.

٤٤ – العدول، م. س، ص ٣٨٥.

٤٥ – حروش، م. س، ص ٨٣.

٤٦ – جرجس، م. س، ص ٨٨، الشلبي، م. س، ص ١٤٦.

٤٧ – العدول، م. س، ص ٣٨٦، حروش، م. س، ص ٩٥.

٤٨ — حروش، م. س، ص ٩٧.

٤٩ — نوار، م. س، ص ٢٣٦.

٥٠ — حروش، م. س. ص ٩٧.

٥١ — المزيني، م. س، ص ١٥١.

٥٢ — حروش، م. س، ص ١١٢.

٥٣ — جرجس، م. س، ص ٩٤—٩٥.

٥٤ — م. س، ص ١٠٦.

٥٥ — حروش، م. س، ص ١١٤ ؟

### توێژینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی

# سوپای ئینکیشاری و کاریگەری لەسەر بەهێزبوون و لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی

کەنار مستەفا رسول
زەمەند مەحمود مامەند

## پێشەکی

عوسمانیەکان لە سەرەتا میرنشینێکی بچووك بوون لە باکوری رۆژئاوای ئەنادۆڵ ,یەکێك بوون لەو هۆزە تورکمانانەی کە لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی دەریای مەڕمەڕە لە باشوری قوستەنتنیەی پایتەختی بێزەنتی دەژیان، توانیان سود لە لاوازی بێزەنتیەکان وەربگرن و بە ناوی ئیسلام و جیهادەوە جەنگیان ڕاگەیاند و سەرکەوتووبوون لە پلانەکەیاندا بەمەش سنوری دەسەلاتیان بەرەو گەشەسەندن هەنگاوی دەناو پەیتاپەیتا بەرەو فراوان بوون و پەلهاویشتن رۆیشتووە و تا بووەتە ئیمپراتۆریەتێکی مەزن.

سوپا رۆڵی سەرەکی وکاریگەری هەبوو لە کاتی هێرش و پەلاماردانەکانی عوسمانی دا، کە لە سەرەتادا سوپای عوسمانی لە تورکە دەرەبەگەکان پێك هاتبوو بە سوپای پیادە یان یایا ناسرابوون، بەلام لە دوایدا سوڵتانەکانی عوسمانی بیریان لە دامەزراندنی لەشکرێکی نوێ کردەوە بە ناوی لەشکری

ئینکیشاری، ئەم لەشکرە لە سەرەتادا خزمەتێکی بەرچاوی بە دەوڵەتی عوسمانی کرد، بەڵام دوای ئەو گەندەڵییەی کەوتە نێوانیان بەرەو لاوازی ڕۆیشتن ، بۆیە سوڵتانەکانی عوسمانی لەسەردەمی چاکسازیدا بڕیاریان لە دامەزراندنی سوپایەکی نوێ کردەوە لە شێوازی ئەورووپی ئەوە بوو لە ڕێگای ئەم سوپایەوە جارێکی تر دەوڵەتی عوسمانی بۆماوەیەك بەرەو بوژانەوە ڕۆیشت.

**لەپێناو** شارەزا بونمان لە گۆشەیەکی مێژووی جیهانی ئیسلامی بەو پێیەی ,کە مێژووی ئیسلام هەڵگری کۆمەڵێ ڕووداو گۆرانکاری گەورە و گرنگە لە هەموو کایەکانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ....هتد، کە سەردەمی حوکمی ئیمپراتۆری عوسمانیش یەکێ بووە لەو گۆرانکاریانە و کاری کردە سەر تەواوی کایەکانی ژیان و توێژینەوە کردن لە بارەیەوە جێگەی بایەخە.

هەروەها ئاشنا بوون بە مێژووی عوسمانی بە تایبەت سوپاکەی، بە پشت بەستن بەسەرچاوە زانستییەکان و لێکدانەوەی وردو ئەکادیمیانە بۆ عوسمانیەکان و ڕۆڵی سوپا لە ناو ئەم ئیمپراتۆریەتەدا هەوڵی ئەم توێژینوەیە بۆ نیشاندانی ڕۆڵی سوپا لە دەوڵەتی عوسمانی بە شێوەیەکی زانستیانە.

بەو پێیەی کە پەیوەندی بە یەکچوون و ئاڵۆز لە نێوان میتۆدە جیاجیاکانی لێکۆڵینەوەدا هەیە، بۆیە هەوڵدراوە بۆ گەیشتن بە ئامانجی لێکۆلینەوەکە پشت بە تاکە میتۆدی زانستی نەبەسترێت,بەڵکو بەگوێرەی پێداویستی شوێنی لێکۆڵینەوەکە هەندێ جار پشت بەستراوە بە بەکارهێنانی میتۆدی (شیکاری)، بەڵام لەهەمان کاتدا بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان هەوڵی پەیڕەوکردنی میتۆدی (گێرانەوە)ش دراوە . هەندێ جاریش پەنا براوە بۆ بواری هەڵێنجان.

**پێکهاتەی توێژینەوەکە** : ئەم توێژینەوەیە لە پێشەکی و سێ بەش و دەرئەنجام و پەراویزەکان پێك هاتووە،کە بەم شێوەیە دابەش کراوە:

**بەشی یەکەم:** ئەم بەشە دابەشی سێ باس کراوە لە باسی یەکەمدا گرنگی دراوە بەرەچەڵەك و دەرکەوتن و فراوانبوونی عوسمانییەکان، باسی دووەم سوپای سوارە و دەربەگەیەتیەکانی دەوڵەتی عوسمانی پێش دامەزراندنی سوپای ئینکشاری لە خۆی دەگرێ، وە لە باسی سێیەمدا ئاماژە بە چۆنیەتی دامەزراندنی سوپای دەریای کەشتی گەلی دراوە.

**بەشی دووەم:** لەم بەشەدا ئاماژە بە هۆکار و بایەخ پێدانی عوسمانیەکان بە سوپای ئینکشاری دراوە کە دابەشی سەر دوو باس کراوە، باسی یەکەم لە دوو تەوەرە پێکدێت تەوەرەی یەکەم باس لە گرنگترین پاڵنەرەکانی دروست بوونی سوپای ئینکشاریئەکات، وە تەوەرەی دووەم باس لە دروست بوونی سیستەمی دێفشرمە ئەکات، لە باسی دووەم ئاماژە بە چۆنیەتی لاواز بوون و گەندەڵ بوونی سوپای ئینکشاری کراوە.

**بەشی سێیەم:** لەم بەشەشدا ئاماژەمان بە ڕووخانی سوپای ئینکشاری کردووەکە کاریگەری هەبوو لەسەر لاواز بوونی دەوڵەتی عوسمانی و دواتر ڕووخاندنی ، کە دابەشمان کردووە بۆ سەر دوو باس، لە باسی یەکەمدا گرنگی دراوە بە کاریگەری چاکسازی عوسمانیەکان لەسەر ڕووخانی سوپای ئینکشاری، لە باسی دووەمدا چۆنیەتی ڕووخانی سوپای ئینکشاری و کاریگەری لەسەر دەوڵەتی عوسمانی ڕوونکراوەتەوە.

لەم لێکۆڵینەوەیەماندا سوودلە چەندین سەرچاوە بینراوە ئەمە جگە لە گۆڤار و سەرچاوە ئەلکترۆنیەکان، کە بەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و کوردی نوسراون، وە هەوڵمانداوە نوسینی دروست و نزیکی مێژوو نوسانی شارەزا لەو بوارەدا بەکار بهێنین.

یەکێك لەو سەرچاوە گرنگانەی کە ئێمە سودێکی باشمان لێوەر گرتـوە ( د. ابراهیم خلیل أحمد) ، ( تاریخ الوگن العربی ف العهد العیمانی ١٥١٦_١٩١٦) کـە بـەوردی باسـی روداوەکـانی کـردوە لـەو ماوەیـەدا، هـەروەها یـەکێکی تـر لـەو سەرچاوانە (د. سونیا محمد سعید البنـا) ، (فرقـە الانکـشاریە نـشأتها ودورهـا ف الدولە العیمانیە) لەم کتێبەدا رۆڵـی ئینکـشاریەکان خراوەتـە روو لـە ناودەوڵـەتی عوسمانیدا. یەکێکی تر لەو کتێبانەی کە بۆ توێژینەوەکـەی ئێمـە جێگـای بایـەخ بوو کە بەزمانی فارسی نوسراوە لەلایەن (راس ئی .دان ودیگران) ، ( تاریخ تمدن و فرهنگ جهان)، هەروەها سەرچاوەیەکی تـر (د.علـی وەردی) کەلەلایـەن (دلێـر میرزا)وە وەرگێردراوە بە ناوی (چەردەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نویّ عێراق)، هەروەها گۆڤاری مێژووی ژمارە دوو و چەندین کتێـب و سەرچـاوەی ئێنتـەرنێتی تر کە  بەکارهاتوون.

## بەشی یەکەم : سوپای عوسمانی

### باسی یەکەم / ڕەچەڵەك و دەرکەوتن و فراوانبوونی عوسمانیەکان.

عوسمانیەکان دەگەڕێنەوە بۆ هۆزێکی تورکی بە ناوی (قایی) کە یەکێکە لە خێڵە کۆنەکانی تورك و لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو بەرزایەکانی جزیرەی سەر ڕووباری فورات هاتوون و لە لەوەڕگاکانی نزیك (خەلات) جێگیر بوون، پاشان بەسەرۆکایەتی (تغرل) بەرەو ئەرزنجان لە ئاسیای بچوك کۆچیان کرد.(تغرل) لە ساڵی (١٢١٩_١٢٣٧) پشتوانی لە سوڵتانی سەلجوقی (سوڵتان علاء الدین)کرد و لە بەرامبەر ئەوەدا سوڵتان زەوی یە بە پیت ولەوەرگاکانی نزیك ئەنقەرەی پیّ بەخشیووە، بەمەش (تغرل) وەك هاوپەیمانی سەلجوقیەکان مایەوە، دوای ئەوە ئەم هۆزە بەکاروباری ئابوری و چەسپاندنی پێگەی سیاسی

خۆیان خەریك بوون، تا ئەوەی (عوسمان کوڕی تغرل) بە هۆی چالاکیە فیداکاریەکانی لە بەرامبەر بێزەنتیەکان پلەی فەرمانڕەوای وەرگرت و ناوبانگی دەرکرد تا ئەو هۆزە بە ناوی ئەوەوە ناسرا[1].

هەروەها دەربارەی ڕەگ و ریشەی عوسمانیەکان بە گەلێك شێوە باسکراوە، لەم باسەدا هەوڵدەدەین کورتەی بۆ چوونی هەندێکیان بخەینە ڕوو. بیردۆزی (پۆل ویتك) دەربارەی ڕەگ و ریشەی عوسمانیەکان لە لێکۆڵینەوەکەیدا وا ئاماژەی کردووە کە لە ماوەی وتنەوەی چەند وانەیەکی لە زانکۆی لەندەن لە ساڵی ١٩٢٧ پێشکەش کراون، هەروەها لە بڵاوکراوەی کۆمەڵەی پاشایاتی ئاسیا لە ساڵی ١٩٣٨ بەناونیشانی (هەستانەوەی دەوڵەتی عوسمانی) واتە ئەم ناونیشانە بیرۆکەی (پۆل وەیتکە)، هەروەها ویتك دەڵێ : ((کە عوسمانیەکان لە تیرەی(قایی) نین و لە سەرەتای دامەزراندنیاندا یەکێك بوو لەو میرنیشنە تورکانەی لە چوار چێوەی میرنیشنە تورکەکانی تر، بەلام میرنیشنی عوسمانی لەو پەڕی باکوری خۆرئاوای ئەنەدۆڵ لەسەر سنوری دەوڵەتی بێزەنتی هەڵکەوتبوو، کاریان بریتی بوو لە هێرشکردن بۆ سەر دەوڵەتی بێزەنتی بە ناوی جیهاد و بڵاوکردنەوەی ئیسلام ))[2].

تیرەکانی(ئوون) کە سەر بەڕەگەزی تورکن توانیان بچنە ناو جۆرجیاو ئەرمینیاو ئەنەدۆڵ و دەوڵەتی سەلجوقی لەسەر شێوازی عێراق و ئێران دامەزرێنن[3].

بیردۆزی محمد فواد کۆپەرلۆ کە لە ساڵی ١٩٣٤ لە زانکۆی ئەنقەرە پێشکەشی کردووە، دەڵێ: عوسمانیەکان لە تیرەی (غورو) عەشیرەتی(قایین)، هاتنە ئەنادۆڵ لە باکوری خۆرئاوای ئەنەدۆڵ لەسەر سنوری بێزەنتە نیشتەجێ بوون، سەرەتا سەر بە سەلجوقیەکان بوون، دواتر توانیان سەربەخۆی خۆیان تۆمار بکەن، هەروەها هەر دەربارەی ڕەگەزی عوسمانی کە عوسمانیەکان

بەرەگەز دەچنەوە سەر ئەو تیرەی کە لە دەشتەکانی (قای)دا بوون، کە تورکەکانی غوزیشی تێدا بووە و ڕوویان کردۆتە ئاسیای بچوك و لەسەدەی ١٣دا کە مەغۆلەکانیان لە ئاسیای بچوك دەرکرد بوو[٤].

دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتاوە بریتی بوو لە هۆزێکی تورکمان کە لەکەناری ڕۆژهەلاتی دەریای مەرمەرە، لە باشوری قوستەنتینەی پایتەختی دەوڵەتی بێزەنتی دەژیان، ئەو هۆزە هەلی لاوازی بێزەنتیەکانی قۆستەوە بە ناوی ئیسلام و جیهاد و جەنگ دژی بێزنتی لە ڕێگەی خواوە پەلاماریان دەدا[٥].

میرنیشنی عوسمانی یەکێك بووە لەو میرنیشنانەی کەلە ئەنەدۆڵ لەسەر سنوری دەوڵەتی بێزەنتە سەری هەڵداوە، لەسەدەی (١٣)ە لە پاڵ چەند میرنشینی تری وەکو(ساروخان، قەرمان، گەرمیان، منتشا، قەرەسین، تەککە، الحمید، قزل و ئەحمەدلی،چەندی تر) کە بەمیرنیشنەکانی هێرشبەر ناسراون، کە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر حسابی دەوڵەتی بێزەنتی فراوان دەبوو و کاریان دەکرد لەسەر بلأوکردنەوەی ئایینی ئیسلام، هەروەها جوگرافیای میرنیشنی عوسمانی یارمەتی دەربووە بۆ بەرفراوانبونی دەسەلأتیان، چونکە کەوتبوە باکوری خۆرئاوای ئەنەدۆڵ لەسەر سنوری بێزەنتەوخەریك بوونی بێزەنتیەکان بە شەڕی ناوخۆ، سەرەرای دوربوونیان لە کێشە و پێك دادان لەگەڵ میرنیشنە ئیسلامیەکانی تر[٦].

پێشتر ئاسیای بچوك لە سەدەی (١٣) چەند دەوڵەتێکی بچووکی لێبوو کە میرە تورکەکان بە ڕێوەیان دەبرد، عوسمانی کوری ئورتوغروڵ کە لە ساڵی ١٢٥٨ لە دایك بووە هێزێکی لەم دەوڵەتانەی باشوری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك دروست کردو سەرۆکایەتی سوپای کرد دواتر پەلاماری زۆربەی شارە بێزەنتیەکان دەدات هەندێ ناوچەی لێ داگیر کردن، عوسمان یەکەمین سوڵتانی بنەماڵەکەی بوو،

ئەم ئیمپراتۆریەی عوسمانی بە ناوی عوسمانەوە ناوی دەرکرد، تا ساڵی ١٩٢٤ درێژەی هەبووە[٧].

هەروەها عوسمانی کوڕی ئورتوغرل لە (١٢٨٨_١٣٢٦) کە یەکەم سوڵتانی عوسمانی بوو لەگەڵ ئەو هۆزە تورکمانانەی کە دەهاتنە ئەنەدۆڵ هاوپەیمانی دەبەست و ئەوانیش هەمیشە ئامادە دەبوون بۆ بەرگری کردن و جەنگ دژی دەوڵەتی بیزەنتی، چونکە ئەو تورکمانانە لە تورکەنیشتەجێ یەکانی ناو شارەکانی ناوەراستی ئاسیا بوونە تورکمانەکان جەنگاوەری لێهاتوو بەجەرگ بوون بە تاسەوە بەرەو پیری جیهاد دەچوون، ئەمەش دەرفەتی بۆ میرنیشنی عوسمانی ڕەخساند تاکو لەسەر گۆرەپانی سیاسیدا دەربکەوێ[٨].

هەموو فەتح کردنێك لە فەتح کردنەکاندا لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی هەر لە سەرەتاوە لە ناو دەوڵەتی بیزەنتی ( لە وڵاتی کافران) بە گوێرەی باسی ئەو سەردەمە، دەبووە هۆی بەرزکردنەوەی پایەیان لە چاوی موسوڵمانەکان و شەپۆلی خۆبەختکەرانی بە خزمەتی ئەوان بە هێز دەکرد، هەر بۆیە دەوڵەتی عوسمانی بەهێز بوو لەسەرەتاوە[٩].

هەروەها سوڵتانە عوسمانیەکان سودیان لە ڕێکخستنەکانی سەلجوقی و ڕۆمەکان وەرگرتووە، دامەزراوەکانی دەوڵەت و شارستانیە کۆنەکانیان پێ نوێ کردۆتەوە، بۆیە لە دەسەلاتەکاندا کار بۆ ڕێکخستنی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی لە دەوڵەتی عوسمانی یەکەم ئامانجیان بووە،فەرمانگەی دانانی باج و پارە و یاسا بۆ پۆشینی جل و بەرگ کە تیایدا خەڵکان بەپێ ی چینەکان لێك جیا دەکرانەوە[١٠].

**باسی دووەم/سوپای سوارە و دەربەگایەتیەکانی دەوڵەتی عوسمانی پێش دامەزراندنی سوپای ئینکشاری.**

لە دەوڵەتی عوسمانی دا سوپا گرنگی زۆری بینیوە لەبە هێزکردن و فراوانکردنی ئەو دەوڵەتە،کە لە سەرەتادا پشتی بە سوارەکانی تورك بەستبوو[11].

عوسمانیەکان هەر لەسەرەتاوە پشتیان بە پیادە و هێزی (سپاهی) کە بەمانای سوارە دێت بەستبوو، کە سوپای باب عالین و دووجۆر لە خۆ دەگرێ (سوپای دەرەبەگایەتی وسوارەی نیزامی عوسمانی) کە پیّ ی دەوترا(سلاح دار) ئەمانە بەبەردەوامی لە لە شکر دابوون، کە فرقەی پیادە دابەش دە بوو بۆ چەند یەکەیەکی بچوکی دە کەسی ، هەروەها لە سەد کەسی پاشان هەزار کەسی، ئەوەی زانراوە کە (قەرە خەلیل جاندرلی) پێشنیاری ئەوەی بۆ سوڵتان ئۆرخان (١٣٢٦_١٣٥٩) کرد کە بەهۆی پێنج یەکی دەستکەوتەکانەوە ئەتوانیّ پارێزگاری لە(بیت المالی) بکات ولە هەمان کاتیش دادەتوانرێ بەشی سوپاوجەنگیش دیاربکرێ [12]

میرنیشنی عوسمانی لە کاتی هەستانەوەیدا سوپایەکی یەکگرتوو نەبوو کە پشتی پێببەستیّ بەڵکو سەرکەوتنەکانی لەلایەن تێکۆشەران و بەرگری کاران و دەروێشەکانی ئەنجامدەدرا، هەموویان خۆبەخشکار بوون و لە شوێنێك کۆدەبوونەوە لە رێگەی بانگەوازی کردن بۆ جیهادی پیرۆز، دوای ئەوەی جیا دەبونەوە کۆتای دەهات و هەر یەکێك لەوانە دە گەرایەوە بۆ بارە ئاساییەکەی خۆی[13].

ئەوکاتە دەوڵەتی عوسمانی دەستوری دەرەبەگی پەیرەو دەکرد، کە لە بێزەنتیەکانی وەرگرتبوو، بەرپرسانی عوسمانیش بەهەمان شێوە لەسەری

دەرۆیشتن بۆیە ئەو سەربازانەی کە سوارە و دەرەبەگی بوون و بەرگریان لە دەوڵەتی عوسمانی دەکرد شایانی پاداشت کردن بوون، بۆیە ئەمان بە زەوی کشتوکاڵی پاداشتیان پێدەدرا(١٤).سوپای عوسمانیەکان لە سوارە و دەربەگایەتی وەها ڕێکخرا بوو کە لەگەڵ بارودۆخی جەنگ بێتەوە،عوسمانیەکان لەو کاتەیکە لەئاسیای ناوەراست هاتبوون بە ئازاو لێهاتوو لە جەنگدا ناسراون(١٥)

هەر لە ڕووی سەربازی و سوپاییەوە عوسمانیەکان هەلی ئەوەیان بۆ رەخسابوو چالاکیە جەنگی و سەربازییەکان بخەنەگەڕ بۆ تەواوکردنی پەیامی دەوڵەتی سەلجوقی، ئەویش بە ئازاد کردنی هەرێمەکانی ژێر ڕکێفی دەوڵەتی بێزەنتی،بۆیە گرنگی باشیان داوە بە سوپای سوارە و دەرەبەگایەتیەکان بۆ رزگارکردنی ناوچەکان و هێنانیان بۆ ژێرڕکێفی خۆیان و بەهێزکردنی فراوانخوازیەکانی خۆیان بە ئاراستەی ڕۆژئاوای ئەنەدۆڵ(١٦). بۆ پاداشت کردنی سەربازان بە پێدانی زەوی، دەبوایە جوتیارەکان ئەو زەویانە بکێڵن و بیچێنن،بۆیە داهاتی هەر پارچەیەك لەو زەویانە لە (٣٠٠٠ بۆ٢٠,٠٠٠) (ئاقچە)(*) بوو لە ساڵێکدا، ئەو زەویانەش دابەش دەبوون بۆ سەر سێ بەش: یەکەم: زەوی تیمار : کە سێ هەزار ئاقچە دەبوو، دەبوو سوارێکی بە هەموو پێداویستیەکانی ئامادە کردبا، دووەم: زەعامەت:بۆ هەر پێنج ئاقچە یەك دەبوو سوارێکی بە هەموو پێداویستیەکانیەوە ئامادەکردبا، سێیەم: خواصی: کە هیچ تەکلیفیان لەسەر نەبوو، بۆیە ئەمانە دەبوو (٢_٤) سەرباز ئامادە بکەن بۆ خزمەتی سەربازی(١٧). هەر بۆیە سوپای دەوڵەتی عوسمانی دەبوایە سوپایەکی بەهێزبێت و سەربازەکان لە کاتی ڕۆیشتنی عوسمانیەکان بۆ هەر شوێنێ برۆیشتنایە(١٨).

دەوڵـەتی عوسمـانی هـەر لـە سـەرەتاوە دەوڵـەتێکی سـەربازی بـووە، هەمیـشە شوێنێك بووە بۆ سوڵتانەکان کە تەماشای ئەو شـەڕانەیان دەکرد کـە لەسـەریان واجب بوو، کاریگەری سوپا لەلای عوسمانیەکان هەر لەسـەرەتاوە پەیوەندیـەکی بـەهێزی هـەبووە بـە لایـەنی بـەڕێوەبردنی حـوکمی عوسمانیـەکان، هـەر بۆیـە سەربازەکانی سوپا سواری و دەرەبەگایەتیەکان کـە لـە جەنگەکانـدا بەشداریان کـردووە وەکـو پاداشـتێك زەویـان پێدراوە،بۆیـە دەوڵـەتی عوسمـانی بـەرەو بەرفراوانی دەچوو،کەواتە هۆکاری ئابووری ڕۆڵی هەبووە بۆ دابین کردنی سەرباز بۆ عوسمانیەکان[١٩].

دەوڵەتی عوسمانی لەسەر بنەمای سیاسەتی بـەرزو سـەربازگەیەکی تونـد و تیژ بنیات نرابـوو، سـوپا شـوێنێکی گرنگـی هـەبوو لـە دەوڵەتـدا ، لـە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی جەنگ کە دەوڵەت زۆرجار پشتی پێبەستووە لەکاتی ئاشتی و هـەم لـەکاتی شـەڕدا،بۆیە هـەر کاتـێ کـە جـەنگ هەڵدەگیرسـا پـێش هـەموو شـتێك دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکی سەربازی بوو زۆربەی گەورە پیاوانی دەوڵەت لـەو کاتەدا فەرماندەی سوپا بوون، وەك ئەو بۆچونەی دەڵـێ: دەوڵـەتی عوسمـانی و سوپای عوسمانی دووڕوی یەك دراو بوون[٢٠].

لە ڕاسـتی دا سـەربازی دەرەبەگایـەتی کـە پـێ ی دەوتـرا (نـواتی) نـاوکی هێزی سەربازی دەوڵەتی عوسمانی بوو، چەکەکانیان بریتی بوو لە تیروکـەوان و شیر و تـیر ، بـەخێوکردنی ئەسـپیش وەك پێویـستیەکی نیزامـی دەرەبەگایـەتی بـوە هـۆی ئـەوەی سـەربازانی دەرەبەگایـەتی بخرێنـە نـاو لیـوای سـەربازی سنجقەوە، لەسەرەتا دا ژمارەی سنجقەکان دەگەیشتە دوو سـەنجەق،بەڵام وردە وردە ژمارەی سنجقەکان گەیشتە دوو سەدو نـەود سـەنجەق،ئەو سـەنجەقانە لـە

پلەی سوپای و ئالای بەگ بەرز تر بوون کە حکومڕانی شارێکی گەورەیان دەکردو دەسەڵاتیان بەسەر هەندێك ناوچەی بچوك دا هەبوو[٢١].

بۆیە لەسەرەتادا دەوڵەتی عوسمانی پشتی بە سوارە تورکمانەکان بەستووە، تەنیا لەسەر سوارەکان چڕبوو بۆوە؛ بەڵام دواتر (سوڵتان ئورخان)(١٣٢٦_١٣٥٩)دووەم سوڵتانی عوسمانی لە دەرئەنجامی لێزانی و کارامەی خۆی لە بواری سەربازیدا دەرکی بەوە کردووە کە پێویستی بە سوپایەکی پیادەی مەشق پێکراوی بەردەوام هەیە بۆ فراوانبونی دەسەڵاتەکەی، چونکە تەنها لە کاتی جەنگدا کۆدەبوونەوە،بەڵام لەباری ئاسایدا هەریەکەو خەریکی کاری ڕۆژانەی خۆی بووە[٢٢].

بەشی زۆری شەڕەکانی عوسمانی لە سەرەتادا لەلایەن جەنگاوەرە ئازا و خۆبەخشەکان و ئەوانەی بە دوای دەستکەوت دا دەگەڕان ئەنجام دەدرا، ئەوانەی کە عوسمانیەکان بەکاریان دەهێنان ناویان لێنا بوون(یایا) یان (پیادە)، کەلە کۆمەڵەی(ئەخیان)[*]ی ئایینی کۆمەڵایەتی پێکهاتبوون، ئەوانە لە ناوچەی حەشاردراودا لە ئەنەدۆڵ دەژیان، زیاتر گومانیش بۆ ئەوە دەچێ کە لەگەڵ سوارە دەرەبەگەکاندا بنەچەی سوپای عوسمانیان پێکهێنابێ، لەبەر ئەوەی هەم سەرباز و هەم دەرەبەگ بوون و نەش دەتوانرا پشتیان پێ ببەسترێ بە تایبەتی لەو چالاکیە سەربازیانەی کە دوور لە ناوچەکانی دەرەبەگایەتی خۆیان ئەنجام دەدرا، بۆیە مەسەلەیەکی ئاسای بوو کە سوڵتانە عوسمانیەکان لە پاش ئەوان سەربازی پیادە بەکاربهێنن و ڕێکیان بخەن بە شێوازێك کە گرفتی سەختی و دوری ڕێگەکانیان بۆ چارەسەر بکات ئەو مەسەلەیەش لە نیوەی یەکەمی سەدەی چواردە مەیسەر بوو[٢٣].

سیستەمی دەرەبەگایەتی کە دروست بوو بەمەبەستی گەشەکردن و دابین کردنی کەرەستەکانی ئارامی و سەربازی بوو، هەروەها پێدانی زەوی بۆ ئەوەی ژمارەی سەربازەکان زۆرتر بکەن، لە بنەرەتەوە سیستەمی دەرەبەگایەتی لەسەر ئەوە وەستا بوو کە خاوەنی زەویەکان لە شوێنەکانی خۆیان دەمانەوە هەڵدەستان بە کشتوکاڵ کردن، هەروەها کۆمەڵێ کەرەستەیان بۆ دابین دەکردن کە ژمارەیەکی زۆریان پرچەك دەکردن و ئەسپی زۆر بە هێزیشیان دەدانێ، زۆربەی دەرەبەگەکان لەلایەن عوسمانیەکانەوە دروست دەکران بۆ یارمەتی دانی سەربازەکان و سوارچاکەکان و جەنگاوەران لە دەوڵەتی عوسمانی کە بەشداری شەڕیان دەکرد موچەیان وەك یەك نەبووە بەڵام وورەیان زۆر بەهێز بووە کاتێك کە ڕووبەڕووی شەڕەکان دەبوونەوە لەبەرئەوەی کەرەستەی جەنگی باشیان پێبووە، هەروەهاسەرچاوەی بژێوی بنەرەتی سوارچاکەکان بریتی بوو لە خڕکردنەوە و رسومات لە جوتیارانی جێگیر بوو لە زەویەکاندا[24]. گروپی سوارچاکان کە ئەوانیش سوارەکانی باب عالی بوون، کە (گیلان دی پۆسیك) دیبلۆماتکاری فەڕەنسی کە نوێنەرایەتی ئیمپراتۆر(فیرنارد هاپسبۆرگ) دەکرد وەك باڵوێزێك هاتووە بۆ لای سوڵتان سلێمان قانوونی و بە سەرسوڕمانەوە باسی لە جوانی ئەسپەکان کردوە بەجۆرێك کلکیان درێژ بووە خودی سوارەکانیش جلکیان دەپۆشی لە قوماشی کەتانی نەرم و ئاوریشمی ڕەنگا و ڕەنگ، چەکی هەموو ئەوان تیروکەوان و قەڵغانێکی بچوك و ڕمێکی بچوك و شمشێرێکی بچوکی دەسکدار بوو. لە ڕاستی دا چەکی ئاگرینی گولله هاوێژ دروست نەکرابوو تاوەکو لە ساڵی ١٥٤٨ لە هەڵمەتی شەڕکردنی بۆ سەر فارس بەکاریان هێنا, بەڵام لە ئەزموونی یەکەمدا شکستیان خواردووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەیەم هێزی دەرەبەگایەتی و سوارەکانی عوسمانی بە

هۆی ئاشنابونییان بە ژیانی شارو یاساو بەندەکانی و کەمی موچە و شەڕە زۆرەکانەوە توشی نائارامی زۆربوونی نارەزای ببوونەوە بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە تا دەهات ڕۆژ بە ڕۆژ ئاڵوزیەکانی ئەو سەربازانە زیادی دەکرد و پەرەی دەسەند کە بەهۆی یاساکانەوە ئەو بارودۆخە زیاتر شێوا بوو[٢٥].

**باسی سێیەم/ هێزی دەریای عوسمانیەکان.**

سەردەمی حوکمی سوڵتان مورادی یەکەم(١٣٦٠_١٣٨٩) سەرەتایەکی ڕاستەقینە بوو بۆ گەشەکردنی دەریاوانی عوسمانی،ئەمە سەرەڕای ئەو سیاسەتەی کە پەیرەوی دەکرد لە فراوانخوازی هەرێمی لە بەڵقان، وە گواستنەوەی پایتەختی دەوڵەت بۆ (ئەدرنە) لە ئەوروپا،ئەم سوڵتانە ژمارەیەك کەشتی دروست کرد سەرباری هێزێکی سەربازی لە دەریاکاندا، وە شوێنی دروست کرد بۆ دروست کردنی کەل و پەلی دەریای لە هەریەك لە (ئەزمیر و کملیك)، لە سەردەمی بایەزیدی یەکەم(١٣٨٩_١٤٠٢) کە کوڕی سوڵتان مورادی یەکەم بوو لە بارەی دەریاوانیەوە هەمان سیاسەتی باوکی پەیڕەو کرد، گرنگی بە دەریاوانی و فراوانخوازی بەندەرەکان دا لە (غالی بۆلی) هەتا گەیشتە(٧٠) کەشتی[٢٦].

هێزی دەریای عوسمانی کاتێك پێشکەوت کە عوسمانیەکان بەرەو ئەنەدۆڵ ڕۆیشتن لە کۆتای چاخی (یانزەهەم)[*]، بونە خاوەنی توانایەکی گەورە ، کاتێك کە لە (ئەنەدۆڵ) نیشتەجێ بوون کە دایکی نیشتیمانی دووەمیان بوو کە جیاواز بووە لە نیشتیمانی خۆیان و لە سێ لاوە بە دەریا دەورە دراوە، هێزی دەریای عوسمانی بەخێرای گەشەکردنی بە خۆیەوە بینیوە[٢٧].

گومانی تێدانیە لە مێژووی عوسمانیەکاندا بە زۆری پاڵنەرەکانیان ئەوە بووە کە لە وشکانی شەڕ بکەن،ئەگەر بەهۆی هەر ڕووداو و هۆکارێك بووایە دووچاری جەنگی دەریای بووبان بەپێی ئارەزوومەندی کەسایەتی خۆیان نەبووە، هەر بۆیەش سەرکەوتنی بندوقیەکان بەسەر عوسمانیەکان لە شەڕی دەریای گالی بۆلی سالی ١٤١٦مایەی بیرکردنەوەی جدی عوسمانیەکان بوولە دامەزراندنی کەشتیگەلی سەربازی دەریای [٢٨].

هێزی دەریای عوسمانیەکان بناغەیەك بووە بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی (بندقیەکان)، پێش ڕووبەڕووبونەوەی عوسمانیەکان لەگەڵ بندقیەکان عوسمانیەکان فراوان بوون لە ڕێگای هێزی ووشکانیەوە، هەروەها بندقیەکان و قوستنەتینیەکان دوو هێزی سەرەکی بوون کەوای لە عوسمانیەکان دەکرد کە دەریا بەکار بهێنێت لە شەڕی بەلقاندا[**]،کە واتە بوونی هێزی دەریای بندقیە و بیزەنتیە بووە هۆی ئەوەی کە عوسمانیەکان بە جدی بیر لە دامەزراندنی هێزی دەریای بکەنەوە، لەراستی دا مێژووی دەوڵەتی عوسمانی هەرلە سەرەتاوە پشت ئەستور بوو بە هێزی ووشکانی و دوای کەوتنە ناو شەڕی دەریای[٢٩].هێزی دەریای عوسمانی لە سالی ١٣٩٠ دانی پێدادەنرێ، بەڵام چەند ئاستەنگێکی بۆ دروست بوو لە پێشکەوتن, (محمد فاتیح) سولتانی بە هێزی عوسمانی ویستی کۆتای بەو ئاستەنگانە بێنێت و بەرەوپێشی ببات هەروەکو ناوچەکانی تری جیهان، بۆیە قوربانیەکی زۆردرا لە پێناو دامەزراندنی سوپای دەریای عوسمانی[٣٠].

سولتان محمدی فاتح(١٤٥١_١٤٨١) یەکەم سولتان بوو کە ناوبانگێکی شایستەی لە دەریادا بۆ عوسمانیەکان تۆمارکرد، لە بەهاری سالی ١٤٥٦، سەدو هەشتا کەشتی چارۆکەدار لە گالی بۆلیەوە بەرەو کەنارەکانی دەریای ئیجە

بەرێکەوتن؛ بەمەبەستی چاك کردنەوەیان و نوێکردنەوەیان، پاشان سولْتان سەلیمی یەکەم(١٥١٢_١٥٢٠) بەردەوام بوو لە بەهێزکردنی ئەو کەشتیگەلە دا، لەسەردەمی سولْتان سلێمان(١٥٢٠_١٥٦٦) کە دەسەلاتی گرتبووە دەست هەستا بە زیادکردنی ژمارەی کەشتیەکان بۆ سێ سەد کەشتی، لە سەردەمی ئەودا ئەدمیرال ( خەیرەدین بەربروسا)ویستی هەستێت بە کارێکی ئەستەم بۆ کۆنترۆڵکردنی درێژای ئەو ڕێگا دەریایانەی کە ناوی عوسمانیەکانی بەسەردا براببوو، بۆیە گومانی تێدانیە عوسمانیەکان وردە وردە لە هێزی دەریایدا پێشدەکەوتن ئەمەش بەهۆی بوونی زۆری سامانی ماددی و بوونی دارستانەکانی کەنارە ئاویەکانی دەریای ڕەشە وە کە دەیانتوانی سودی لێببینن بۆ کەرەستەی تەختە و داری دروستکردنی کەشتی وەکو لایەنێکی پیشەسازی، هەروەها پێویستیەکانی دەریاوانی لە کانەکانی "بەغدان و" ئەفلاق" کە دوو ویلایەتی بەلْقان بوون دەهێنران، هەروەها قوماش و پەردەی چارۆکەکان لە فەرەنساوە دەهێنران، وەستا و کرێکارەکان زۆریان یۆنانی بوون، کەخزمەتیان لە بواری ئەو پیشەسازییەدا کردووە[٣١].

کەشتیگەلی عوسمانیەکان لە سەردەستی سولْتان (محمدی فاتح) زۆر بەهێز بوو، بۆیە بوونی دەریای ڕەش گرنگی باشی هەبوو بۆ بەرەوپێش چوونی هێزی دەریای عوسمانیەکان، سولْتان( سلیمی یەکەم) زۆر چاودێری هێزی دەریای دەکرد، بەلام سلێمانی قانونی لەسەرەتا گرنگی بە سوپای ووشکانی دەدا، بەلام دوای چەند سالێك گرنگی زۆری بە هێزی دەریای دەدا ئەمەش بەهۆی مەترسی پرتوغال و ئیسپانیەکان بۆ سەر دەریای ناوەراست باکوری ئەفریقا هەر بۆیە عوسمانیەکان بوون بە هێزێکی گەورەی دەریایی لە ئاستی هێزەکانی تری جیهاندا[٣٢].

شایەنی باسە دروست کردنی کەشتیە جەنگەکان و چەکدارکردنی تاکو سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم بەجێ دەهێڵرا بۆ سەرکردەکانی دەریاوانی، ئەوان هەڵدەستان بە ئەنجام گەیاندنی کاروبارەکان و بە دڵسۆزی ئیشەکانیان جێ بەجێ دەکرد،کەژمارەیان سەدو پەنجادەریاوان دەبوو، کە دەریاوانەکان یان لە گاورەکانی کیلکیا بوون یان لە یۆنانیە هەڵاتووەکان بوون کە بەمەبەستی دەستکەوتی جەنگ خرابوونە خزمەتی هێزەکانی کەشتی گەلی عوسمانی، هەروەها ڕەگەزەکانی تری دەریاوانەکان کە کەم توانا بوون بریتی بوون لەو بەندە و کۆیلانەی کە بەتوندی لە کەشتیەکان دەبەسترانەوە، کەژمارەیان زۆر زۆر بووە(٢٣).

هێزی دەریای عوسمانی لەکاتی داگیرکردنی(قستەنتنیە) ڕۆڵی گرنگی بینی لەسەرکەوتنیاندا، ئەویش کاتێك سوڵتان محمد فاتیح هەستی کرد بە گرنگی گەمارۆی دەریای لەسەر بەندەرەکانی شار هەر بۆیە کەشتی گەلەکانی عوسمانی لە ڕێگەی ووشکانیەوە ویستیان بگەنە پشتی زنجیرە گەورەکان بۆیە لەم کارەیاندا سەرکەوتن و بیزنتینیەکانیان توشی سەرسوڕمان کرد(٢٤).

جێگەی ئاماژەیە ماوەی نێوان فەتحی قوستەنتنیە تاکۆتای سەدەی پانزە بە قۆناغی بە هێز بوونی عوسمانیەکان لە دەریادا دادەنرێ، تەنانەت دەریای ڕەش بووە بەندەرێك بۆ لەنگەرگرتنی کەشتیەکانیان،وەناوچەکانی دەوروبەری عوسمانیش ملکەچ بوونی خۆیان بۆ عوسمانییەکان دەربڕی وەکو (تەرابزون و ناوچەکانی قرم)، هەروەها لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم کۆگایەکی گەورە دروست کرا بۆ دروست کردنی کەشتی گەلی بەهێز، هەربۆیە عوسمانیەکان لە ساڵی ١٥٢٢ دەستیان گرت بەسەر رودس دا کە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی قوستەنتینەیە هەڵکەوتبوو کە سوارەکانی قەشە قەتس یوحەنای لێ بوو، وە

سەرکردایەتی کەشتی گەلەکە لەلایەن ئەمیری دەریای جەزائیری (خەیرە دین بەربوسا) بوو[٢٥].

هێزی دەریای عوسمانی زۆر لە هێزی دەریای ئیتالی دەچوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئیتالیەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە دەرکەوتن بە ماوەیەکی کەم، چەتەکانی دەریای (القراصنەکان)کەبەچەتەی دەریای ئیتاڵی ناسرابون و کاریان چاودێری کردنی کەشتیەکانی مووسڵمانان و هەموو ئەو کەسانە بوون کە دەچوونە خزمەت سوڵتان ، هێزی دەریای عوسمانی لە بواری ئیداری و بەڕێوەبردنەوە پێشکەوت[٢٦].

کەشتیگەلی عوسمانی بەپلەی یەکەم پشتی دەبەست بە هێزەکانی ئاسیایی، ئەوانیش زۆر دوچاری نارەحەتی و بێزاری بوو بوونەوە،هەر بۆیە سیستەمی (بەدەل) گەشەی کرد و دەوڵەت داهاتی زۆری بۆ هێزی دەریای تەرخان دەکرد، کەشتی گەلی عوسمانیەکان پێکدەهات لە چەند کەشتیەکی زریێ پۆشی قورس (ماعون) بەتورکی(ماونە) کە هەرە گەورەکەیان ٧٥٦ کۆیلەی تۆپ هاوێژی لە خۆی دەگرت،هەروەها لەساڵی ١٥٧٥ کەشتی گەلی عوسمانی لەچەند کەشتیەکی تری بچووکی جەنگی پێکدە هاتن کە قەبارەیان مام ناوەند بوو، سەرنیشنەکانی دەگەیشتە سەد و پەنجا تۆپی کەشتی کە لە سەرەتادا زۆر لاواز بوون کە نەدەتوانرا لە سەریەك کەشتی زیاتر لە بیست تۆپی قورس دابنرێ ، هەربۆیە دواتر عوسمانیەکان لانی کەم لە ڕووی ژمارەی تۆپەکانەوە هاتنە ئاستی هێزی بنەدوقیەکان[٢٧].

ژمارەی کەشتی یەکان لەسەردەمی سوڵتان سلێمان گەیشتە ٣٠٠ کەشتی، ئەمەش بە هۆی بوونی سەرکردەی بەهێزی دەریای خەیرەدین بەربوسا، بەڵام دواتر سەرکردەی لێهاتوو کاریان تێدانەکرد و زۆر لە یۆنانیەکان و ئیتاڵیەکان

چونە ناو كەشتی وانەكان،كە هەمیشە چاویان لە دەستكەوتی مادی بوو نەك سەركەوتنی هێزی دەریای عوسمانی بۆیە كەشتی گەلی عوسمانی بەرەو لاوازی دەرۆیشت[٣٨].

گەورەیی هێزەی دەریای عوسمانیەكان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە بندقیەكان لە رۆژئاوای (بلقان) وەدەرنا و هەروەها لە گرتنی قوستەنتینە لە سەر دەستی سوڵتان محمد فاتیح و دەركردنی قەشە یوحەننا لە ساڵی ١٥٢٢ لە دورگەی رودس، هەروەها لە چالاكی دەریاوانی كە خەیرەدین بەربوسا لە دەوروبەری باكوری ئەفریقا پێی هەستا دژی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز، دواجار دەوڵەتی عوسمانی گەڕا بەسەر ئەو هەڵمەتانەی كە لە دەریادا ئەنجامی دەدان بۆ ئاوەدانی ئیسلامی یان لە كەنداوی عەرەبی و دەریای سور دژی پورتوگالیەكان[٣٩].

هێزی دەریای عوسمانیەكان بوونە هێزی یەكەم لە جیهاندا و توانیان كۆنترۆڵی دەریای ناوەراست بكەن تا نیوەی یەكەمی سەدەی (١٨) ،ئەگەرچی دەریاوانە ئینگلیزەكان لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٨) چەندین فێڵیشیان لە دەریاكاندا دەكرد،بەلاّم سەركەوتونەدە بوون و هێزی دەریای عوسمانی پارێزگاریان لە تایبەتمەندی خۆیان كرد وەكو هێزی سێیەم لە جیهاندا مانەوە تا ساڵی ١٨٧٨لە دوایئینگلیز و فەرەنسا[٤٠].

**بەشی دووەم : سوپای ئینکیشاری**

**باسی یەکەم /سەرەتای دامەزراندنی لەشکری ئینکشاری و ڕۆڵیان لە فراوانخوازی عوسمانیەکاندا.**

بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم هێزە سەربازیە لە دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەردەمی میراتی ئۆرخانی کوری عوسمان (١٣٢٦_١٣٥٩) دەگەڕێتەوە،یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی بە ناوی (قەرە خەلیل) پێشنیاری ئەوەی کرد، سوپایەکی پیادە لەکەسانی ناتورك پێك بهێنێ بۆ ئەوەی ببێتە کاکڵەی سوپایەکی بەردەوامی پیشەیی ،بۆ ئەم مەبەستەش (ئۆرخان) لە ساڵی ١٣٣٠ دەستی کرد بە دامەزراندنی ئەم سوپایە ، بەڵام ڕێکخستن و تەواوکردنی پێداویستیەکانی لەسەردەمی سوڵتان محمدی دووەم (١٤٥١_١٤٨١)بوو، پاشان لەسەردەمی (سوڵتان سلێمانی قانون) کۆتای پێهات،(ئۆرخان) ئەم سوپایەی لە بنکە سەربازییەکاندا دانا،چونکە ئەندامانی ئەم سوپایە خانەوادەیان نەبوو ژنیان نەدەهێنا و هیچ ئومێدێکیان نەبوو بۆ دامەزراندنی خێزان و تێکەڵی کۆمەڵگاش نەدەبوون، بەڵکو خۆیان تەرخان کردبوو بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام و پاراستنی ژیانی میللەت و سوڵتانی عوسمانی،چونکە تاکە باوەڕیان ئیسلام بوو، قورئانی پیرۆز پەرتوکیان و سوڵتانی عوسمانیش باوکیان و بنکە سەربازییەکانیشماڵیان و جەنگیش پیشەیان بوو. لە سەرەتادا ناویان (ینی شهری) بوو واتە (سوپای تازە)، بەڵام لە دواتردا ئەم ناوە وردە وردە لە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبی گۆڕانکاری بەسەر داهات و بوو بە ئینکشاری [٤١].

ئینکشاریەکان هەرچەندە لەسەرەتادا ژمارەیان زۆر نەبوو، بەڵام بەشداریان دەکرد لە جەنگە نیزامیەکاندا هەر وەك چۆن هەڵدەستان بە گرینگیدان بە پارێزگاری ئاسایش لە شوێنەکانی غەیری شەڕەکانیش دا، هەروەها پارێزگاریان

لـە دیـوانی دەوڵـەتی عوسمـانی دەکـرد لـە کـاتی دانیـشتنەکانی سـوڵتان دا، گرینگیان دەدا بە کارەکانی پۆلیس و هێزی ئاگر کوژێنەوە، وە هێزێکی سیاسی زۆر گەورەیان لە دەوڵەتی عوسمانی دا دروست کرد کـە ڕۆڵێکـی زۆر گـەورەیان هەبوو بۆ بە هێزبوونی دەسەڵاتی عوسمانیەکان[٤٢].

دەستەی ئینکشاریەکان گرینگترین بەشەکانی لـە کۆیلـەکان بـوون دوای ئـەوەی کە دەرسێکی زۆری دەبینی و مەدەنی و ئەقڵیان فێرکرا لە سـوپای عوسمـانی دا باشترین جەنگاوەرانی سوپای عوسمـانی بـوون تـاوەکو سـەدەی حەڤدەهـەم بـۆ ڕێکخستنیان لە ڕووی بەکارهێنانی چەك و شـەڕ و تیروکـەوان کـە فرقەیـەکی زۆر چاکی پییادەیان لیّ دروست کرا هەر کاتێك دوژمن هێرشی کردبایە سەر دەوڵەتی عوسمانی زۆر بەتوند و تیژی و ترسناکی ڕووبەڕوویان دەبونـەوە، ئینکشاریەکان هەمیـشە خۆیـان ئامـادە دەکـرد بـۆ جیهـاد و جـەنگ دژی نـەیارەکانیان، ژنیـان نەدەهێنا و تێکەڵاوی کۆمەڵگا نەدەبوونەوە تەنها لە شوێنە بێدەنگەکان دەژیـان کە خۆیان بەخت دەکـرد لـە پێنـاوی خـوا و پارێزگـاری لـە دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمانی و پارێزگاری لە سوڵتان[٤٣]. ژمارەی ئینکشاریەکان لە سەدەی حەڤدە دا گەیـشتە زیـاتر(١٠٠٠٠) جـەنگاوەر کـە ئەفـسەرێك یـان ئاغایـەك سـەرکردایەتی دەکردن کـە بـە پەروەدەیـەکی سـەربازی بـەرز لـە کۆشـکی سـوڵتان پـەروەردە کرابوو، کە لە نێوان (١٥٠)کەس لە لێهاتوترین تیر هاوێژەکان هەڵدەبژێردران بـۆ سـەرۆکایەتی کـردن، هـەروەك بەتـەواوی دەوری سـوڵتانیان دەدا لـە کـاتی دەرچوونی سـوڵتان بـۆ جـەنگ، هـەر بۆیـە عوسمانیـەکانیش هـەر لەسـەرەتاوە گرنگی زۆریان بـە سـوپای ئینکـشاری دەدا و هـەموو پێداویـستیەکیان بـۆ دابـین دەکـردن بـە پێـدانی چـەك و ئامێرەکـانی جـەنگ و ئامـادەکردنی جل و بـەرگ و خـۆراك و هۆکـاری گواسـتنەوە، وە چـەندین ڕێگایـان بـۆ خۆشـکردن لـە هـەموو

لایەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەتایبەت لە بەلقان، وە زیاتر گرینگیان دەدا بە تۆپ و پیشەسازی دروست کردنی تۆپ هەروەها گرینگیان بە باروت دەدا بۆ سەرکەوتنەکانیان بە تەواوەتی پشتیان پێدەبەستن، هەر بۆیە ئینکشاریەکان سەرکەوتنی باشیان بەدەست دەهێنا و کاریگەریان هەبوو لەسەر بە هێز بوونی عوسمانیەکان[٤٤].

ئینکشاریەکان یاخود (أو جاغ ئینکشاریە) لە سێ کۆمەڵە پێك هاتبوو، یەکەمیان (فریق السكمانیە) (وشەیەکی فارسیە واتا (پاسەوانی سەگ ))دێت،کە تیپێك بوو بە شێوەیەکی سەربەخۆ دامەزرابوو، بەڵام دوو کۆمەلەکەی تر کارەکانیان لە کۆتایی ساڵەکانی دواتردا دەرکەوت،کە پێدەچێ زیاتر لەیەکەوە نزیك بووبن،بۆ هەر یەکێکیان (الجماعە) وە دووەمیشیان ناوی (الفرقە) تێدا بوولە تورکیشدا ناوی (کۆمەڵەی بولوك)ە، هەر چۆنێك بێت ئینکشاریەکان بە هەموو بەشەکانیەوە لە ئەسڵدا لە بەندەکانی سوڵتان بوون[٤٥].

هەمیشە سوڵتانەکانی عوسمانی زۆر گرینگیان بە سوپای ئینکشاری دەدا، وریایان دەکردنەوە لە واجب و ئەرکەکانیان دا لە پاراستنی ولات و بەرقەرارکردنی ئاسایش لە ناو دەولەت وە مەشقێکی زۆر قورس و توندیان بە سەربازەکانیان دەکردن، وە هەندێکی تر بە کۆکردنەوەی پارە و سامان سەرقاڵ بوون بە دونیاوە، دەوڵەتی عوسمانی هەمیشە لە هەوڵی بەرفراوانکردنی سوپای ئینکشاری دابووە هەموو سەربازەکانیان دەنارد بۆ مەیدانی جەنگ و هەندێکیان لە پایتەخت دا کۆکرد بوونەوە، بە دڵنابیەوە دەوڵەتی عوسمانی کەوتبۆوە بە کارهێنانی کەل و پەلی پێویست وە تەواوی ئەو کەل و پەلانەی کە ئینکشاریەکان پێوسیتیان پێی بووە، بیروباوەری ئینکشاریەکان بۆماوەیی بوو بە هۆی بوونی رێبازی دەروێشەکان، بیروباوەری دەروێشەکان لەسەر سۆفیگەری بووە کە

بریتی بوو لە هەردوو ڕێبازی سۆفیگەری بەکتاشی و مەولەوی،ئەم دەروێشانە زۆر بەرێزە وە چاودێری و چاویان لە سوپای ئینکشاریی دەکرد و بەهێزی خۆیان دەزانی هەمیشە داوای بەرەکەتیان لە خوا دەکرد کە سەرکەوتوو بن، لەگەڵ تێ پەڕ بوونی کاتیش پەیوەندی نێوان دەروێشەکان و ئینکشاریەکان بە هێز تر دەبوو وە درێژەیان بە هێنانی کۆمەڵێك پیشەوەر و دروست کردنی بازرگان و پیشەسازی بە تایبەتی بواری سەربازی لەڕووی چەك و تەقەمەنی لە دەوڵەتی ئیسلامی دا[٤٦].

بەڕای ئێمە دامەزراندنی لەشکرێك بۆعوسمانیەکان کارێکی زەروریەت بوو بۆیان،ئەمەش لەپێناوپارێزگاریکردن لەو دەسکەوتانەی کە لەسەرەتای شەڕەکانیاندا لەبەرامبەر بیزەنتیەکان بەدەستیان هێنابوو،کە بەهۆیەوە توانیبوویان چەندین ناوچە داگیربکەن و پەرە بەفروانخوازیەکانیان بدەن، ئەمەجگە لەوەی کەمانەوە و پشت بەستنیان بەسوپای دەرەبەگایەتی کە لەسەرەتاوە لە سەری دامەزرابوون توشی لەناوچون وکاولکاری دەکردن، چونکە هێزی دەرەبەگەکان خاوەن مەشقی تایبەت نەبوون،لەسەر ئەساسی بەرژەوەندیەکانیان بەشداریان لەجەنگەکاندا دەکرد،ئەمەسەرەڕای سادەی کەلوپەلی شەڕکردنیان.بۆیەبەهۆی بوونی ئەم هۆکارانەو چەندین هۆکاریترەوە سوڵتانەکانی عوسمانی ناچاربوون کەبیر لە دامەزراندنی لەشکرێکی تۆکمە و مەشق پێکراوبکەنەوە کە بە لەشکری ئینکیشاری ناسرا.

**تەوەرەی یەکەم/ پاڵنەرەکانی دروست بوونی سوپای ئینکشاری.**

دروست بوونی سوپای ئینکشاری لە دەوڵەتی عوسمانی دا دەگەڕێتەوە بۆ چەند پاڵنەرێك لە وانە:

هۆی سیاسی : کاتێك میرنیشنی عوسمانی لە وڵاتی باشوری رۆژهەڵاتی دەریایی مەرمەرە دروست بوو،ئەمەش لەبەرئەوەی ترسی لە هاتنە ژوورەوەی بێزنتیەکان هەبوو بۆ ئەنەدۆڵ ،چونکە ئورتوغرل بەگ(١٢٢٨_١٣٢٦ز) نزیکترین شازادە بوو لە سنوری بێزنتیەکان، ئەم بارودۆخە ناخۆش و خەتەر بوو بۆ عوسمانیەکان کە وایکرد لە هەرکاتێك دا ئاگاداری خۆیان بن و سوپایەك دروست بکەن کە ئامادەیی هەبێت بۆ شەڕ و جیهادکردن دژی بێزەنتیەکان، هەروەها پاڵنەرێکی تر بۆ دروست کردنی سوپای ئینکیشاری کەمی سەرباز بوو بۆ جەنگ کە لە دوای تەواو بوونی شەڕ دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان، بۆیە بوونی سوپایەکی گەورە پێویست بوو بۆ فراوان بوونی پێگەی عوسمانیەکان کە ئەم ژمارە زۆرانەی جەنگاوەران تەنها لە کاتی شەڕدا کۆ دەبونەوە دوای ئەوە هەریەکە بۆ وڵاتی خۆیان دەگەڕانەوە، هەروەها پاڵنەرێکی تر فراوانبوونی دەوڵەتی عوسمانی بووکە پێویستیبە سوپایەکی بەهێز و یەکگرتووهەبوو بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمنەکانیان بەمەبەستی دروست کردنی یەکەیەکی باش لە نێوان هێزە عوسمانیەکان[٤٧].

لەسەرەتادا سوپای عوسمانی پشتی بەو سوارە تورکمانانە بەستبوو کە بڕبڕەی سوپایەکەیان پێك دەهێنا،بەڵام سوڵتان ئورخان(١٣٢٦_١٣٥٩ز) لە دەرئەنجامی لێزانی و کارامەیی خۆی لە بواری سەربازی دا درکی بەوە کرد کە پێویستە بۆ دەوڵەتەکەی سوپایەکی پیادە پێك بهێنرێت بۆ کردنەوەی ئەو قەڵا و شورا پۆڵاینانەی کە بەڵقان پێ ی ناسراوە،هەستی کرد کە ئەو بار گرانیەی

کەوتۆتە سەر میرنیشینەکەی زۆر لەتواناکانی گەورە تر و قورسترن بە تایبەت پاش ئەوەی کە دەوڵەتی بێزەنتی بە چاوی تەماع و ترسەوە تەماشای دەکرد بۆیە دەستی کرد بە دروست کردنی سوپایەکی نوێ کە دڵسۆزبێت بۆ دەوڵەتەکەی[٤٨].

هەروەها پاڵنەرێکی تر ترسانی سوڵتان ئۆرخان بوو، کە دەترسا تیپە سەربازیەکان دەستەگەری پێك بهێنن و هەر کەسەو بەلای هۆزەکەی خۆیدا بچێت و شیرازەی ئەو هاوپەیمانیەتیە کە هەبوو لە نێوانیان دا تێك بچێت، سەرباری ئەوەش زۆربوونی کاروفەرمانەکانی جیهاد و فراوان بوونی شەڕەکان ململانێی دژ بەبێزنتیەکان دەخوازێ کە سوپایەکی بەردەوامی لە حاڵەتی ئامادە باشی دا هەبێت، بۆیە بیرۆکەی دامەزراندنی سوپایەکە لەلایەن ئۆرخان کە سوپایەکی پیادە پێك بهێنێت، لە کەسانی غەیری تورك بۆ ئەوەی ببێتە کاکڵەی سوپایەکی بەردەوام و پیشەیی کاریگەر بوو لەو روەوە.[٤٩].

پاش ئەوەی دەسەلاتی عوسمانیەکان فراوانبوو شەڕ و ململانێ کانیان بەرە و زیاد بوون رۆڵی ئەو هێزەی کە پشتیان پێ دەبەست پێی دەوترا هێزی (بایا) کە لە هۆزە دەرەبەگەکان و عەشایرەکان و هۆزە تورکمانەکان پێك دەهات کەم بویەوە، جونکە بە تێپەڕ بوونی کات کەم و کورتیەکانی ئەم سوپایە بەدەرکەوتن، لەبەرئەوەی ئەم سوپایە بەباشی سەرپەرشتی نەدەکران زۆر جار جەنگاوەرانی ئەم سوپایە لە کاتی جەنگ دا ئامادە نەبوون ئەمەش بە هۆی سەرقاڵ بوونیان بە کاری پیشەوەری و بازرگانی و کشتوکاڵکردن ، هەربۆیە عوسمانیەکان بۆیان دەرکەوت ناتوانن لە پرۆسەی داگیرکاری و فراوانخوازیەکانیاندا پشت بەم هێزە ببەستن ، چونکە ئەم هێزانە بەباشی ئەرکەکانی خۆیان بەجێ نەدەگەیاند، لەبەر ئەمەش عوسمانیەکان بیریان لەوە

کردەوە کە هێزێکی بەردەوامیان هەبێ کە جێگەی ئەو هێزانەیان بۆ بگرێتەوە، بۆیە هەستان بە دروست کردنی هێزی نوێ[٥٠].

بەڕای ئێمە عوسمانیەکان لە دروست کردنی سوپای ئینکشاریدا سودیان لە ئەزموونی دەوڵەتە ئیسلامیەکانی پێش خۆیان وەرگرتوە بە تایبەت دەوڵەتانی عەباسی و ئەیوبی. بەجۆرێك لەسەر هەمان شێوەی ئەوان هەڵسان بە دروستکردنی سوپای ئینکیشاری کە سوپایەکی کۆیلەیەتی بوو.

**تەوەرەی دووەم/ سیستەمی (دێفشرمە).**

ووشەی(دێفشرمە) لە فەرمانی (دفشرمك) ی تورکی وەرگیراوە بە واتا (تۆماری ناو ) بە شێوازی هەڵبژاردنی منداڵەکان و کۆکردنەوەیان لە خێزانەکانیان، واتە (سیستەمی دێفشرمە) بریتی یە لە کۆکردنەوەی ئەو منداڵانە کە تەمەنیان لە نێوان (٥_١٢) ساڵاندا بووە کە لەرێگەی وەکیلەکانی دێفشرمە لە ناوچە مەسیحی نیشەکانی بەڵقان لە شار و ناحیە و قەزاکان کۆدەکرانەوە، کە دەچوونە کڵێسا و مەسیحییەکان لیستی منداڵانی تعمید کراویان لە قەشەی کلێسەکان وەردەگرت لە کۆی پێنچ منداڵ یەك منداڵیان دەبرد، کە ئەمەش هەمان سیستەمی پێنچ یەکە کە لە شەریعەتی ئیسلام یدا هەیە. شایەنی باسە ئەو منداڵانە تەنها لە ڕەگەزی نێر وەردەگیران، ئەم منداڵانە لە بۆرسە و ئەدەرنە و ئەستەمبوڵ فێرگەیان بۆ کرابۆوە لە وێدا دەرسی ئایینی و مەشقی سەربازی و ڕۆشنبیری گشتی یان دەخوێند تا دەگەیشتنە تەمەنی (١٨) ساڵی، کە ئەم سیستەمە ڕەگەزی باشیان دروست دەکرد بۆ چوونە ناو ریزەکانی سوپا لەلایەن عوسمانیەکانەوە[٥١].

پاش ئەوەی ئەم منداڵانە تەمەنیان دەگەیشتە (١٨) ساڵی دەکران بە دوو بەش ئەوانەی لەڕووی هزرەوە بەهرەداربوون پێیان دەوترا ئۆج ئۆغلان ئەمانە لە کۆشکەکانی سوڵتان دادەنران و بەکاریان دەهێنان بەمەبەستی کاروباری دەوڵەت تەنانەت هەندێ لەو منداڵانە بوون بە شێخ الاسلام و هەندێکی تر لە باڵوێزخانەکانی دەوڵەتەکانی عوسمانی کاریان دەکرد، ئەو منداڵانەی کە لەڕووی جەستەوە بەهێزتر بوون پێیان دەوترا ئەعجەم ئۆغلان کەئەمانە سوپای ئینکشاریان لێ دروست دەکرا،هەر تیپێکی ئینکشاری پێی دەوترا ئۆجاق[٥٢].

ئەم منداڵانە سونەت دەکران بەپێی شەریعەتی ئیسلام، ئیسلام دەکران و دەیان کردن بە چاودێری خۆیان، زۆر پاداشت دەکران و بەرپرسیاریەتی زۆریان پێ دەدان لە دەوڵەتدا،هەر لە سەرەتاوە بە بیرۆکەی جیهادهاندەدران وکاتێك بۆ شەڕ ڕەوانە دەکران بروایان بەوە هەبووکە یان سەردەکەون یان شەهید ئەبن [٥٣]

سوپای ئینکشاری لە هەموو جەنگەکانی عوسمانیەکاندا لە کاتی بە هێزیاندا ڕۆڵێکی زۆر باش و گەورەیان بینی وەك شێر لە مەیدانەکانی جەنگدا پێشڕەویان دەکرد لەسەرخستنی جەنگەکەدا ,هەروەك لە یەکلاکردنەوەی جەنگی گرتنی قوستەنتینیەش ڕۆڵی سەرەکی بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە ،لە شەڕە بە بەناوبانگەکانی تریش هەمان ڕۆڵیان هەبووە[٥٤].

ئینکشاریەکان گەورەی هێزەکان بوون بە هۆی ئەو دەرئەنجامە پەروەردەی ئیسلامی و سەربازیانەی کە کرابوون، هێزێکی زۆر گەورە بوون گیانێکی هاوکاریان هەبوو هەر لەبەر ئەمەش بوو سەرکەوتنیان لە زۆربەی شەڕەکاندا بەدەست دەهێنا،کە بەمە خزمەتێکی بەرچاوی دەوڵەتیان دەکرد، لە دوای ئەم سەرکەوتنانە پاداشت دەکران و ئیمتیازیان وەردەگرت پارچە زەویان دەدرایە ڕێگەیان پێدەدرا لە دەرەوەی وولات بژین،هەروەها لە زۆربەی کاتەکاندا

سولّتان خۆی لەشەڕەکاندا بەشدار دەبوو کە ئەمە دەبووە هۆی هاندانی جەنگاوەرەکان[٥٥].

سوپای ئینکشاریەکان هاوکار بوون لە دروست کردنی دەسەلاّتی عوسمانی کە تایبەتمەندی خۆی هەبوو لەگەشەکردندا, هەروەك گرنگیش بوو بۆ داهاتوو بۆ گەشەی دەولّەتی عوسمانی هەر ئەم تایبەتمەندیە وایکرد کە پێویست بوو ئەمانە نزیك ببنەوە لە شانۆی سیاسی ،چونکە ئاگاداری هەر گۆڕانکاریەکی جیاوازی ناو دەولّەت بوون، لە سەردەمی سولّتان محمد الفاتیح (١٤٥١_١٤٨١) ژمارەیان زۆر زیادی کرد، کە کاریگەری زۆرباشیان هەبوو بۆ سەر بەهێز بوونی دەسەلاّتی عوسمانیەکان[٥٦].

هەروەها ئینکشاریەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە پاراستن و پاسەوانی کردنی خودی سولّتان، کە ڕاهێنرا بوون بە ڕاهێنراوی وەرزشی زۆر توند و تیژ و دلّڕەقانە،کە ڕازیبوون بە ژیانێکی هەژارانە لەبەرامبەر ئەمەدا حەزیان لە دەسەلاّتی سیاسی گەورە هەبوو، سەردەمی سولّتان (سلێمانی قانون)ی (١٥٢٠_١٥٦٦) ژمارەیان زیادی کردگەیشتە (١٤) هەزار پیادە وە شێوەی سیاسیان وەرگرت[٥٧].

ئینکشاریەکان ئەگەر چی لە ڕابردوودا کۆیلە بوون، بەلاّم کە بوونە سەرباز لە ناو سوپای عوسمانیدا چاویان بڕیبووە مافەکانی پیاوانی گەورە و سەربەست لە کاروباری مەلیك، هاوسەرگیری و کەسایەتیان ، ئەوانە مامەلاّیان وەکو کۆیلە لەگەلّ نەدەکرا بەمانا یاسایەکەی، هەروەها ئەم سەربازانە بڕوایان وابوو کە مولّکی سولّتانن خۆیان و ژیان و ئەوەی هەیانە هەموو هەر مولّکی سولّتانە[٥٨].

هۆکاری بەهێزی ئەو سەربازانەی ناو سوپای ئینکشاری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە عوسمانیەکان لە سەرەتاوە قوتابخانەیان بۆ کردنەوە بۆ ئەوەی بەتەواوی

فێری شێوازەکانی جەنگی ببن، هەریەکێك لەم منداڵانە یەکەم بووایە دەکرایە سەرۆکی بەشێك لە سوپا یان خەزنەدار یان وەزیر، کە سەرەتا دابەش بوو بوون بۆ دوو بەش، بەشێکیان پەیوەندیان بە دەرگەوانی سوڵتانەوە هەبوو کە پێ دەوترا (قاپی قولەری) واتا پاسەوانی دەرگای سوڵتان، بەشەکەی تریش هەڵدەبژێران بۆ بەرێوەبردنی بەرزترین پۆستەکانی دەوڵەت و زۆربەی هەرە زۆری لە سەرۆك وەزیرەکان بوون [٥٩].

ئاڵایَ سوپای ئینکشاریەکان بریتی بوو لە قوماشێکی (سور) لە ناوەڕاستی دا مانگێك هەبوو لە ژێر مانگەکەش وێنەیەکی شمشێر هەبوو کە ناوی (ذوالفقار) بوو وەکو بەرەکەت وەرگرتنێك لە شمشێرەکەی ئیمامی (عەلی) خوای لێی ڕازی بێت،کە ئامانجی سەرەکی سوپای ئینکشاریەکان بریتی بوو لە درێژە پێدانی جیهاد دژی بیزەنتیەکان و ئازاد کردنی زیاتری خاکەکانیان و ئازادکردنی خاکی ئیسلامی بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامی، چونکە بەتەواوی گەیشتبونە پەروەردەیەکی ئیسلامی جیهادی باش و ئامانجەکانی ئیسلام لە دڵیان چەسپی بوو [٦٠].

لەسەردەمی سوڵتان موڕادی یەکەم (١٣٦٠_١٣٨٩) کە زیاتر گرنگی داوە بە سوپای ئینکشاریەکان، کە (یگی جری) یان (سەربازە تازەکانی ئەوجاق العجم)یان پێدەوترا، وە بە سەربازەکانی (قابی قولی) یان (گەورەی دەرگاکانی سوڵتان) ناسراو بوون، ئینکشاریەکان هەر لەسەرتاوە وەکو هێزێکی ووشکانی گەورە وابوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەهەر دوو بەشی ( پیادە و سوارە) [٦١].

لە ناو ئینکشاریەکان کۆمەڵەی سوارچاکان هەبوون، کە سوارچاکان دوو جۆر بوون جۆرێکیان سوارچاکە هەڵبژێراوەکان بوون کە خاوەنی موچەیەکی باش بوون، ژمارەیان سەرەتا (٢٤٠٠) پیاوی بەهێز بوون، بەڵام پاشان ژمارەیان

زیـادی کردووە،جۆرەکـەی تریـان سوارچـاکی (الـسباهیة) بـوون کـە خـاوەنی زەویەکانی دەرەبەگەکان بوون، بەشێوازێکی بـاش و تـەواو و رێك وپێك مەشـق پێکرا بوون(٦٢).

ئینکشاریەکان دەورێکی زۆر گـەوریان بینـی لـە ژیانی سـەربازیدا، هـەروەها بەردەوام هانی سوڵتانیان دەدا بۆ ئەوەی ئەوان بکاتە خـاوەن پۆسـتی گـەورە و سەرکردە و خەلیفە هەموو هەوڵێکی خۆیان دەدا و هـەموو هاوکاریـەکیان دەکـرد بۆ ئەوەی ئەم کارەیان سەربگرێ و خۆیان نزیك دەکردەوە لە سوڵتان(٦٣).

**باسی دووەم/ چۆنیەتی لاوازبوون و گەندەڵ بوونی لەشکری ئینکشاری.**

لەگەڵ تێپەڕبوونی سەردەم و ڕۆژگار ترس و تـەمبـەڵی ڕویکـردە ناوڕیزەکـانی سوپـای ئینکشاری، بەتایبـەت کاتێك کە لە ناو شارەکاندا کەوتنە ژیان بەو پێیەی کە سـەربازی تایبـەتی سوڵتانن کەوتنە دەست درێـژی کردنـە سـەر موڵـك و مـاڵی خەڵکی،هەرکاتێ سەربازانی ئینکشاریە تێکەڵی خـەڵکی شـار بونایـە سروشـتیان گەندەڵ دەبێت و ڕەوشتیان دەگۆڕێ و ئەرك و کار و فـەرمانیان گـۆڕانی بەسـەر دادێـت و دەردو بـەلا بـەهۆی دوژمنایـەتی و کاریـان لـەڕووی دانیـشتوان دا دێتـە کایەوە و دەست وەردەدەن لە کاروبـاری دەوڵـەت و کەوتنـە گەنـدەڵی نوانـدن و ئاژاوە نانەوە و ئـارەزووی دەسـەڵاتیان لـەلا پـەیدا بـوو(٦٤).لەسـەدەی شـانزەوە کاتێك ئینکشاریەکان گەنـدەڵیان تێکـەوت و وردە وردە بـەرەو لاوازی ڕۆیـشتن و دەسـتیان خـستبووە نـاو کاروبارەکـانی دەوڵـەتی عوسمـانی و هەڵدەسـتان بـە لابـردن و لـە نـاوبردنی سـوڵتانەکان بـە هـۆی لاوازی هەنـدێ لـە سـوڵتانەکانی عوسمانی، کە هەمیشە بەدوای بەرژەوەندی خۆیان دەکەوتن چـاویان لـە پۆسـتە بەرزەکانی وڵات بووە(٦٥).

هۆکاری گەندەڵبونی سوپای ئینکشاری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کاتێك هێرشیان دەبردە سەر هەر وڵاتێ بارگرژیان دەنایەوە و دەستیان دەکرد بە تالانی زۆر و بەڵێنەکانیان بەرە بەرە هەڵدەوەشاندەوە و ئاگر بەستەکانیان دەشکاند، ئەو مەبەستەیان لە بیرکرد بوو کە لەسەری دامەزرا بوون و ڕێکەوتبوون،کاتێکیش سوڵتان موورادی سێیەم (١٥٧٤_١٥٩٥) فەرمانێکی دەرکرد کە ڕێگە نەدەن مەی بخۆنەوە بۆیە سەربازەکان لە بەرامبەر ئەمەدا ڕاپەرین و سوڵتانیان ناچار کرد کە ئەم فەرمانە هەڵوەشێنێتەوە، هەروەها ئینکشاریەکان هەڵدەستان بە کوشتنی سوڵتانەکان و دانانی سوڵتانی منداڵ کە توانای بەڕێوە بردنی وڵاتی نەبوو ئەمە هۆکارێك بوو بۆ لاوازی سوپای ئینکشاری و دەوڵەتی عوسمانی[٦٦].

دوای ئەوەی ژمارەی سوپای ئینکشاریەکان زیادی کرد بۆ وەرگرتنی موچە قورسای زۆریان خستبۆ سەر خەزێنەی دەوڵەت وە پەیوەستبوونی زیاتری ئەمانە بە سوپاوە بۆ وەرگرتنی پارە بووە نەك شەڕکردن و لەکاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن زۆربەی هەرە زۆری سەربازەکان خۆیان دەشاردەوە[٦٧].

بە تێکەڵ بوونی سەرباز و خەڵکی ئاسایی بووە هۆی گەندەڵی لەناو ڕیزەکانی سوپاو هاتنە ناوی خەڵکی مەدەنی کە ئەم خەڵکە هیچ شارەزایەکی ئەوتۆیان لەبارەی سوپا و شەڕەوە نەبوو تەنها بۆ پارە و سامان بوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە بلیتی سەربازیان کڕیبوّوە لە سەربازەکانی ئینکشاری سەربازان ڕەوشتی پیشەکەیان تێکەڵ بەکاری ئاسایی خەڵك کرد و لەناو خەڵکی ئاسایی دەستیان خستە ناو ئیش و کارەکانی دەوڵەتەوە لە پێناو حەز و ئارەزوو و بەرژەوەندیەکانیان دەسەڵاتیان بەکاردەهێنا،ئەمەش بووە هۆی لێکترازانی

سوڵتان و خەڵکی ئاسایی، ئینکشاریەکان لەپێناو بەرژەوەندی خۆیان کاریان دەکرد هەڵساون بەکوشتنی سوڵتانەکان و منداڵەکانیان و دەستیان دەگرت بەسەر زەویەکانی دەوڵەت و بۆ کاروباری خۆیان و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان هێناوە، دژایەتی خۆیان بۆ دەسەلآت ڕاگەیاندوە، ئەمەش بەهۆی ئەو لەخۆباییەی کە هەیانبوو گوایە ئەوان بەشێکن لە موڵکی سوڵتان و دەتوانن دەسەلآتیان هەبێت بۆیە هەموو ئەمانە بوونە هۆی گەندەڵ بوون و لاوازبوونی لەشکری ئینکشاری[٦٨] .

گەندەڵی سەربازەکان لەوەدا بوو کە لەکاتی جەنگ ئامادە نەدەبوون.بەلآم بۆ ئەوە کۆدەبوونەوە کە دەنگی یاخی بوونێك یان داوای لابردنی وەزیرێك یان لە سێدارەدانی چەند وەزیرێك ڕابگەیەنن و کاتێ کە دەوڵەتی عوسمانی شەڕی ڕادەگەیاند و دەیانوویست ڕەوانەی شەڕیان بکات کەمتر ئامادە دەبوون و کەمتر لە بەرامبەر دوژمن خۆیان ڕادەگرت، بەلآم دواتر دەیانویست هەلآتنیان لە شەڕەکاندا بە بلاوکردنەوەی مقۆمقۆ لە نێوان خەڵکی دا داپۆشن، گوایە سەرکردەکان ویستویانە بیانفرۆشن بەدوژمنە خوا نەناسەکان، بۆیە لە دواتر زۆربەی ئەو شەڕانەی دەوڵەتی عوسمانی پێی هەڵدەستا تەنها بەشکستی گەورە کۆتایی دەهات و سنوری دەوڵەتی عوسمانی بەرە بەرە بچووك دەبۆوە و دەسەلآتیان لاواز دەبوو[٦٩].

لە پێناو وەرگرتنی موچەدا لەناو سوپای ئینکشاری شێوازی زۆر هەبوو بۆیە یەکێك کە بیویستبایە بچێت بۆ ناو سوپاکە هەموو شتێکی خۆی دەفرۆشت بۆ ئەوەی بیکات بە بەرتیل تا بتوانێ لە سوپادا وەریبگرن بۆیە ئەمە زیاتر گەندەڵی ئینکشاریە دەردەخا، هەروەها لەم سوپایە گەندەڵی و تەمبەڵی و خۆ دزینەوەی هەندێك لە سوڵتانەکان لە کاتی جەنگەکاندا لە بەژدار بوونیان لەگەڵ

سوپاکە بۆ شەڕەکان، هەروەك چۆن لە سەردەمی سولتان موڕادی سێ یەم(١٥٧٤_١٥٩٥) باوبوو، سەرەرای ئەوەی کە نەدەچووە دەرەوە بۆ جەنگ هیچ خۆشەویستیەکیشی بۆ ئەو سوپایە نەبوو، هەروەها شاردنەوەی ناوی ئەوکەسانەی کە دەمرن لەو سوپایەدا بۆ ئەوەی مووچەکانیان نەبڕن و هەر بەردەوام بێت بۆیە دواتر ئاشکرا بوو هەر کەسێ ناوی مردویەك ئاشکرا بکات ئەوا پارەیەکی زۆری دەدرێتێ هەرچەندە ئەم کارەش سودێکی ئەوتۆی نەبوو، هەروەها بەکارهێنانی مەی خواردنەوە بە شێوەیەکی زۆر لە ناو سوپای ئینکشاریە کاریگەری خراپی کردە سەر گەندەڵ بوونی ئەم سوپایە و تاوای لێهات بە تەواوی بەرەو لاوازی رۆی[٧٠].پاش تێپەڕبوونی سەردەمی هێز و شکۆداری سولتانە عوسمانیەکان کە خۆیان سەرکردایەتی سوپاکانیان دەکرد بەڵام دواتر سەرکردایەتی سوپا بەدەست چەند کەسێکی تر بوو وەك سەرکردە دادەنرا وەك سەدر ئەعزەم و وەزیرەکانی جەنگی کە ئەمە گەندەڵی خستە ناو سوپای ئینکشاری [٧١].

هەروەها خانە نیشنکردنی سەربازەکان ڕێگەیەکی تر بوو بۆ گەندەڵی، چونکە بەپێ یاسای ئەوکاتەی عوسمانیەکان کاتێ یەکێك پێویستبایە خۆی خانەنیشن بکات دەبوایە هۆکارێکی لەبەر دەست بووایە تا خۆی خانەنیشن بکات و سولتانیشی لێ ئاگادار بێت ئەمەش وایکرد کە یاری بە بەڵگە و هۆکارەکان بکرێت سەرە ئەنجامیش ڕێژەی خانەنشین فراوان بوو و بەرەو سەرەوە رۆیشت،هەروەها دیاردەیەکی تریش کڕین و فرۆشتن بە لیستەکان و دەفتەری ناوەکان دەکرا، کە وەك بازرگانی بەبەشی کۆمپانیاوە بکرێ،بەمەبەستی پێدانی موچە بەو ناوانەی کە خۆیان نوسیویانە، ئەمەش پێچەوانەی یاسا بوو کە سەربازی ئینکشاری بێجگە لە کاری سەربازی هیچ کارێکی تر بکات، بەڵام بە

هۆی وەرگرتنی خەڵکانێك کە لە بنەڕەتدا بازرگان بوون لە هەردوولا سودمەند ئەبوون، هەم کاری بازرگانی خۆیان دەکرد و هەمیش ساڵانەش لە جیاتی ئەوەی چوار علوفە واتا (مووچە) وەربگرن لە مووچەی سەربازی دوو علوفەیان پێدەدان، بێگومان هەوڵی چارەسەری ئەم کێشانە دراوە بەڵام هەموویان بێ سوود بوون[٧٢].

لەلایەکی ترەوە گەندەڵ بوونی سوپای ئینکشاری بە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە سوڵتانەکان ڕێگەیان داوە کە سەربازەکان ژن بهێنن و تێکەڵی ژیانی ئاسایی خۆیان ببن و وردە وردە ئەوان هەستیان کرد کە ژیانی سەربازی هەموو شتێك نیە، بۆیە توانای شەڕیان کەم بۆوە هەروەها دووری سەربازەکان کە هەر لە سەرەتاوە لە خێزانەکانیان دورکەوتبونەوە، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی کە هەستی مرۆڤایەتیان لاواز بێت و دڕندە و توندوتیژو لە خۆبای بوون،بۆیە دوای ئەوەی کە سوڵتان ڕێگەی پێدان کە کاری پیشەگەری بکەن بە تایبەت لە کاتی ئاشتی دا ، ئەمەش هێندەی تر لە کاری سەربازی دوری خستنەوە ئەوەندەی تر توانای شەڕیان دابەزی و هەستی شەڕکردن لایەن کەم بۆوە و لە هەمان کاتیشدا دەوڵەت ڕێگەی نەداوە کە لە کاتی ئاشتی و شەڕیشدا چەك هەڵگرن لە ترسی ئەوەی کە بەژداری لە کاری توندوتیژیدا نەکەن، بەڵام سەرباری پەیڕەوکردنی هەموو ئەو کۆت و بەندانە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ سەر هێزی ئینکشاری هەر بارێکی گران بولەسەر دەوڵەت بە هۆی ئەو هەموو یارمەتی و مەسرەفانەی کە لێیان دەکرا زیاتر دەوڵەتی عوسمانی بەرەو لاوازی برد[٧٣].

بە بڕوای ئێمە لاواز بوون و گەندەڵبوونی لەشکری ئینکشاری بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ بێ توانای و لاوازی سوڵتانەکان کە کاروباری وڵاتیان پشتگوێ خستبوو و مەیلیان بەلای ژیانی تایبەتی و خۆشگوزەرانی کەوتبوون، بەمەش

قودسـیـەتیان لای ئینکیـشاریەکان بـەرەو لاوازی و کـەم بوونـەوە چـوو، ئینکشاریەکان سودیان لە لاوازی سوڵتانەکان وەرگرت و دەستیان خستە ناو کاروباری کۆشك و لە هەوڵی بەدەست هێنانی پلەو پایەی باڵا دابوون و هەموو ئەو کارانەی کە سەرەتا لە سەری دامەزرابوون فەرامۆشیان کردو لە دوایدا بەپێچەوانەی بەڵێنەکانیان ئەجولانەوە.

یـەکێکی تـر لـە هۆکـارە سـەرەکیەکان کـە کاریگـەری هـەبوو لەسـەر ئینکیشاریەکان و لاوازبوونیان کاڵ بوونەوەی هەستی ئایینی بوو لەلایان، چونکە لە سەرەتادا بە ناوی جیهاد و جەنگی پـیرۆز بەشداریان لە شەڕەکاندا دەکرد، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات ئەم هەستەیان بۆ ئاینن نەماو تێکەڵی خەڵکی ئاسایی بوون و دوای بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان کەوتن ئەمانەو هەموو ئەو هۆکارانەی کە پێشتر باسمان کردن هۆکار بوون بۆ گەندەڵ بوون و ڕووخانی لەشکری ئینکیشاری.

**بەشی سێ یەم : ڕوخانی سوپای ئینکیشاری**

**باسـی یەکـەم/ کاریگـەری چاکسازی عوسمانیـەکان لەسـەر ڕووخـانی سـوپای ئینکشاری.**

پاش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتیان بەرەو لاوازی دەچوو بە تایبەتی لە ڕووی بەڕێوەبردنی سوپا و کارگێری، بۆیە سوڵتانەکان بیریان لە چاکسازی کردن کردەوە لە وڵاتدا، بەتایبەتی چاکسازی کردن لە بواری سوپادا، چونکە هەسـتیان کـرد سـوپایەکەیان لاواز و گەنـدەڵی تێکـەوتووە و سـەربارە ئینکشاریەکان هەوڵی دەسەلات و سەروەت و سامان دەدەن نەك بەرگری کردن لە وڵات، بۆیە بیریان کردەوە کە سوپایەکی نیزامی نوێ دابمەزرێنن بە تایبەت

بە هۆی شکاندنی سوپای عوسمانیەکان لە زۆربەی شەڕەکان بە درێژای سەدەی (١٨)بۆیە هەستیان کرد بەرەو پێش بردنی لایەنی سەربازی و سوپای ولآتانی رۆژئاوا بەهۆی بوونی تەرخانکردنی پارەیەکی زۆر بووە بۆ لایەنی سوپا، هەر بۆیە زۆرێك لە مێژوو نوسان چاکسازی هێزی سەربازی عوسمانیەکان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی سوڵتان مستەفای سێیەم (١٧٥٧_١٧٧٤) کە هەوڵی داوە سوپای عوسمانیەکان بەهێز بکات و نیزامێکی نوێ دابنێ و دەستی کردووە بە رێکخستنی هێزی سوپای لە ڕووی ووشکانی و دەریاوانی و هەروەها هێنانی جۆری تۆپی نوێ و ڕێکخستنی تۆپ هاوێژەکان بەپێی ڕێگا وچەکی ئەورووپی [٧٤].

بە هاتنی سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩_١٨٠٧) لە سەرەتاوە بۆی دەرکەوت دەوڵەتی عوسمانی پێویستی بە چاکسازی زۆر هەیە و پێویستە نیزامی کۆن بگۆڕێ و ئەو گەندەڵیەی کە لەلایەنی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و سوپای عوسمانیدا هەیە نەمێنێ و قبوڵی ڕێگاکانی نوێ بکەن و دەست بکرێ بە دروست کردنی سوپایەکی نوێ و بەرەوپێشبردنی دەزگای سەربازی، ئەمە کاریگەری هەبوو لەسەر ڕووخانی سوپای ئینکشاری، لە سەردەمی ئەم سوڵتانە مەشقی سەربازی رۆژئاوای بینرا وەهێنانی چەك و ئامێری جەنگی نوێ و پێشکەوتوو شارەزا بوون لە ڕاهێنانی ئەورووپی، سوڵتان دەستی کرد بە دانانی دەستەیەکی بەڕێوەبردن بۆ چاکسازی سەربازی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو خاڵانەی کە بوونەتە گەندەڵی سوپاو چاکردنی، هەروەها لابردنی دەزگای سەربازی تەقلیدی، کردنەوەی قوتابخانەی سەربازی [٧٥].

چاکسازی لە دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی (١٨)یەمەوە شێوازێکی نوێی بەخۆیەوە دەبینێ کە کەسانێك دەرکەوتبوون داوایان دەکرد چاکسازیەکان

لەسەر شێوازی ئەوروپی بێت کە بەپێویستیان دەزانی، بەڵام گروپێکی تر دەرکەوتبون داوایان دەکرد کە دەوڵەت بۆ چاکسازی کردنی بگەڕێنەوە بۆ شێوازە کلاسیکەکان و داب ونەریتە کۆنەکان، بەپێی تێپەڕبوونی کات چاکسازیەکان لەسەر شێوازی ئەوروپی ئەنجام دەدران و گروپی یەکەم زاڵ بوون بەسەر گروپی ئەوروپی دا.

لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی سێیەمدا چاکسازیەکان قۆناغێکی نوێی بەخۆیەوە بینی لە ساڵی ١٧٨٩ کە شۆڕشی فەرەنسی ڕویدا بوو لە ئەنجامی ئەم شۆڕشە حکومەتی فەرەنسا بڕیاری داگیرکردنی میسری دا لە ١٧٩٨ کە جەنەڕاڵ ناپلیۆن وەك سەرکردەی سوپای بۆ ئەم هەڵمەتە دیاری کراو هێزێکی گەورەی ئامادە کرد و ئەم هێرشەی ناپلیۆن بۆ عوسمانیەکانی ڕوون کردەوە کە سوپای عوسمانیەکان زۆر بێهێز و لاوازە و توانای ڕووبەڕوو بونەوەی نیە ، کە لەئاکامدا سوپای عوسمانیەکان بەرامبەر سوپای فەڕەنسی تێك شکا، بۆیە چاکسازی کردن لە بواری سوپای بووە کارێکی زەروورو پێویست لە دەوڵەتی عوسمانیدا و هۆکارێکی سەرەکی بوو لەلای سوڵتان سەلیمی سێیەم بیر لە چاکسازی سوپای بکاتەوە دوای ئەوەی بۆی ڕوون بۆوە کە هێزی عوسمانی لە بەرامبەر لەشکری ئەوروپیدا زۆر لاوازە [٧٦].

سوڵتانەکانی عوسمانی توشی بارودۆخێکی خراپ هاتن بە هۆی خراپی و لاوازی سوپای ئینکشاریەکان بە تایبەت لە سەدەی (١٨) کە دەوڵەتی عوسمانی لە ڕووبەڕوو بونەوەی بەرامبەر وڵاتە ئەوروپیەکان شکستی گەورەی خوارد، ئەمەش بەهۆی لاوازی سوپاکە و گەندەڵ بوونی هەر بۆیە دەوڵەتی عوسمانی چەندین بەڵێن و پەیمان نامەی لەگەڵ وڵاتە ئەوروپیەکان بەست بە تایبەت پەیمانی (کۆچك لوفتنی) لە ساڵی(١٦٩٩) تەسلیم بوونی عوسمانی بوو بۆ

ئەمسا، هەروەها بەلێن نامەی( کوچك کینارچی ) لە ساڵی ١٧٧٤ بەرامبەر وڵاتی ڕووسیا، کە تێکشکانی بەرامبەر ڕووسەکان بۆیە تەواوی ئەو ڕووداوانە وای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد کە چاکسازی لە سوپای ئینکشاری دا بکات و هەوڵبدەن بۆ دامەزراندنی سوپایەکی نوێ لە جێگەی سوپای ئینکشاری[٧٧].

لە دەوڵەتی عوسمانیدا کاتێك هەندێك لە سوڵتانەکان هەوڵی چاکسازیان دەدا پێش هەموو شتێك چاکسازیان لە سوپادا دەکرد، چونکە بەرەو پێش چوونی سوپا و گۆڕانی نیزامی پێشوی سوپا هۆکارێك بوو بۆ بەهێز بوونی دەوڵەت و بەرەنگار بوونەوەی دوژمنان و فراوانکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی هەر بۆیە چاکسازی کرا لە ناو سوپای ئینکشاری و نوێ بوونەوە ئەنجام دەرا لەناو ئەم سوپایە بۆیە نەریت و خووە باوەکانی ئینکشاری و سەباهیەکان گرفت بوون لەبەرامبەر هەر نوێ کردنەوەیەك بۆیە ئەمەش هۆکارێك بوو کە سوڵتان سەلیمی سێیەم لە ساڵی ١٧٩٤ هەستێت بە دامەزراندنی هێزێکی تازە پیادە بە ناوی (نیزامی جدید) واتە(سیستەمی نوێ) کە لەسەر دەستی ئەفسەرانی ئەلمانی و فەرەنسی و ئینگلیز شێوە ڕاهێنان و مەشقیان پێدەکراو دارایەکی تایبەت بەو هێزە خەرج دەکرا، ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر لاوازی ڕووخانی سوپای ئینکشاری کە زیاتر گرنگی دەدرا بە سوپای نوێ[٧٨].

هێزی نیزامی نوێ لە ساڵی(١٧٩٧) ژمارەیان گەیشتە١٩٢٠٠ سەرباز و (٢٧) ئەفسەری لە خۆ دەگرت، لە ساڵی ١٨٠٢ لە ئەنازۆڵ سیستمی بە سەربازی کردن خرایە ئەم بوارە بۆ مەبەستی باشترکردنی هەڵبژاردن و دیاریکردنی سەربازە تازەکان، لە ساڵی ١٨٠٦ هێزەکە ژمارەی سەربازەکانی گەیشتە (٢٢٦٨٥) و(١٥٩٠) ئەفسەری لە خۆی دەگرت،سوڵتان سەلیمی سێیەم لە ساڵی (١٧٩٥) هەستا بەکردنەوەی قوتابخانەیەکی ئەندازیاری سەربازی بە ئامانجی پێگەیاندنی

ئەفسەر و سەربازی تایبەت کە جێگەی سوپا لاوازەکەی ئینکشاریەکان بگرێتەوە، بەتایبەت لە بواری چەك و تۆپ هاوێژیدا، هەروەها هەستان بەچاکسازی کردن لە بواری دەریاوانی و نوێ کردنەوەی سوپاکەو بەردەوام بوون و زیاتر بەرەو پێشبردنی کارەکان لە سوپای دەریای داو ڕاهێنان و مەشقی نوێ بە دەریاوانەکان و ئەنجامدانی تازەگەری لە قوتابخانە دەریاییەکان و سەر لە نوێ ڕێکخستنەوەی چەك و جبەخانە، دامەزراندنی قوتابخانەیەك بۆ باشکردنی کاروبارەکانی هێزی دەریای و تەندروستی، هەروەها کاروباری سەربازی و ئیداری لە یەکتری جیاکردەوە وەك هەوڵێك بۆ دابینکردنی خەرجیەکانی ڕیفۆرمەکان کە ئەوە لە ناو هێزی ئینکشاریەکانیش پەیرەو دەکران، هەروەها سوڵتان سەلیمی سێیەم هەوڵی زۆری داوە کە لایەنگری زۆر بۆ ئەم چاکسازیانە پەیدا بکات لە ناوخەڵك و لەناو هێزی سوپای ئینکشاریش، بەڵام ئەمە لەلای ئینکشاریەکان قبوڵ نەبوو بوو بە هۆی ڕووخاندنی ئەم سوپا نوێیە لەلایەن ئینکشاریەکانەوە[(٧٩)].

شایەنی باسکردنە ئەو هێزە نوێیەی سوڵتان سەلیمی سێیەم دروستی کردبوو هەر زوو بەرهەم و جێ دەستی بە دیارکەوت کە زۆر بەهێز بوو بەتایبەت لە شەڕی (عکا) لەساڵی (١٧٩٩) کاتیك ناپلیۆن هێرشی کردە سەر ئەو شارە بۆیە ئەم هێزە نوێیە توانیان بەرگریەکی باش بکەن و بەرپەرچی هێرشەکەی ناپلیۆن بدەنەوە و ناپلیۆن نەتوانیت ئەم شارە داگیر بکات [(٨٠)].

- دوای ئەوەی سوڵتان چاکسازیەکان خۆی ئەنجامدا بە تایبەت لە بواری سەربازی و سوپای ئەمە بووە هۆی تورە کردنی سوپای ئینکشاری، بەتایبەت کاتێ کە سوڵتان سەلیم سیستەمی نوێ هێنایە ناو سوپای عوسمانیەوە کەسیستەمێك بوو لەسەر بنەمای ڕاهێنانی سەربازی بەپێی شێوازی ئەورووپی لە

بەرامبەردا ئینکشاریەکان زۆر بە توندی دژ بەم کارە وەستانەوە و پیاوە ئاینیەکانیان کە بەتونرەوەکان ناسرابوون هانیان دان دژی چاکسازی سولتان، ڕەخنەی ئەوەیان لە سولتان دەگرت کە ئیسلام گوێی بەزانستی سەربازی نەداوە و هەموو شەڕەکانی بەبێ زانست ئەنجامداوە، وێرای ئەوەی کە ئەو سیستەمە نوێیە بیدعەیەو لای دادوەر هەموو بیدعەیەك حەرامە و بیدعەهی کافرانەو نابێت تەقلیدی ئەوان بکرێتەوە، هەر بۆیە ئینکشاریەکان لە ساڵی ١٨٠٧ دژی چاکسازیەکانی سولتان سەلیمی سێیەم شۆڕشیان بەرپاکرد و گەمارۆی کۆشکەکەی سولتانیان دا و فەتوایەکیان دەرکرد لەلایەن هەندێ لە پیاوە ئاینیەکان کە بە چاکسازی ڕازی نەبوون بۆیە سولتانیان لەسەرکار لابردووە و دواتر کوشتویانە لە جێگەی ئەو سولتانێکی تریان داناوە، هەروەهاهێرشیان کردۆتە سەر ئەو سوپا تازەیەی کە سولتان سەلیمی سێیەم دروستی کردبوو لەسەر شێوازی ئەوروپی و قەتلوعامیان کردووە، بۆیە بەهۆی ئەنجامدانی چاکسازیەکانی لە دەوڵەتی عوسمانی بە تایبەت لە بواری سوپای زیاتر بارگرژی لە وڵات دروست کرد بەتایبەت ئینکشاریەکان بەم کارانە ڕازی نەبوون و پێیان قبوڵ نەدەکرا و بەرپەرچی بڕیارەکانی سولتانیان ئەدایەوە و توندو تیژی زیاتریان ئەنواند و زیاتر ڕق و کینەیان لا دروست ئەبوو کە ئەمانە هۆکار بوون بۆ زووتر ڕوخاندنی سوپای ئینکشاریەکان[٨١].

هەروەها سولتانی عوسمانی پەنایی بردە بەر دابەزاندنی نرخی دراو، سەرچاوەکانی دارای و بازرگانە دەوڵەمەندەکان و زیادکردنی باجەکان کە ئەمەش کارێکی باوبوو لەلای زۆربەی سولتانەکان کە بیانویستیە چاکسازیەك یان کارێك ئەنجام بدەن[٨٢].

هەروەها ئەوەی شایەنی باسە دوای سەردەمی سوڵتان مستەفای چوارەم سوڵتان محمودی دووەم هاتە سەر دەسەڵات کەماوەی حوکمڕانیەکەی لە نێوان ساڵانی (١٨٠٨_١٨٣٩) دابوو،دایکی سوڵتان محمود ئافرەتێکی فەڕەنسی بوو ناوی (ئێمی)بوو کە ئافرەتێکی بەتوانا بووە دەورێکی گەورە و کاریگەری بینوە لە پەروەردەکردن و دامەزراندنی کەسایەتی سوڵتان محمودی کوڕیدا کە وایکرد بیری سوڵتان بەلای کەلتور و پەیڕەوی فەڕەنسی دا بەرێ کە کاریگەری هەبوو لەسەر بەڕێوەبردنی کاروبارەکان لە کاتی حوکمڕانی لە وڵاتی عوسمانیدا، بە هاتنە سەرکاری سوڵتان محمودی دووەم بارودۆخی وڵات ئالۆز بوو بۆیە پێویستی بە چاکسازی هەبوو لە زۆربەی لایەنەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی، بەتایبەتی لایەنی سوپای بۆ ئەوەی خۆیان ڕێکبخەنەوە و بەهێزبن، لەو کاتەشدا بارودۆخ ناتەواو بوو، چونکە وڵات توشی ڕووبەڕوو بونەوەی هێزەکانی ئینکشاریەکان و زانایان بوو بونەوە، بۆیە بارودۆخەکە تێك چووبوو. سوڵتان محمودی دووەم هەستا سیاسەتی بەهێزکردنی دام و دەزگا کارگێری و سەربازیەکانی گرتە بەر،کە سیاسەتی بە زۆر سەربازی کردن بوو ، فەرمانی دەرکرد کە چەك و ئامێری نوێی جەنگی بەکاربهێنن و لەسەر نوێترین شێوازەکانی مەشقی ڕۆژئاوای ڕاهێنانیان پێبکرێ، هەروەها فەرمانی دەرکرد کە دەستەو تاقمەکانی هێزە ئینکشاریەکان لەگەڵ دەستە سەربازیە نوێیەکانی سوپای نوێ ڕێبکەون و هەماهەنگی لە نێوان یان دابێت و هاوکاری یەکتر بکەن، بەڵام هێزە ئینکشاریەکان بەم کارەی سوڵتان ڕازی نەبوون و ئامادەی هیچ گۆرانێك نەبوون و بۆیە ئینکشاریەکان چەندین هەوڵی ڕووبەڕوو بونەوەیان داوە لە دژی ئەم بڕیارانەی سوڵتان و پشێوی و ئالۆزی زۆریان دروست کرد و بارودۆخی دەوڵەتیان خراپتر کرد [٨٣].

هۆکاری ڕاگەیاندنی شۆڕشی چاکسازی لەلایەن سولّتان محمودی دووەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشە و گرفت و ناکۆکیانەی کە لە هەموو لایەکەوە ڕووبەڕووی دەوڵەتی عوسمانی ببۆوە، ئەو گرفتانە ش جۆراوجۆر بوون ,ناوخۆی و دەرەکی بوون زۆرێك لەو گرفتانە درێژخایەن و کۆن بوون دەگەڕانەوە بۆ چەندین سالّ پێش هاتنی سولّتان محمودی دووەم بۆ سەر دەسەلاّت، هەر بۆیە سولّتان چاکسازی بواری سوپای ڕاگەیاند و بەپێویستی زانی کە بەشێوەیەکی پێشکەوتوو ڕێکی بخەنەوە، لە دەرئەنجامی ئەم کارەی ڕووبەڕووی ئینکشاریەکان بۆوە لە ناوخۆی ولاّت کە بوویە هۆی لەناوبردنی سوپای ئینکشاریەکان، چونکە دروستکردنی سوپایەکی نوێ وپێشکەوتووبوویە هۆی لاوازکردنی هێزکانی ئینکشاری و لە ناوچونیان [٨٤].

سولّتان محمودی دووەم وای بەباش زانی کە بەردەوام بێت لە چاکسازیەکانی ولاّت کە سولّتانەکانی پێش خۆشی ئەم کارەیان کردووە، هەستا بەنوێکردنەوەی قوتابخانەکانی سەربازی، کە سولّتان (سەلیمی سێیەم) دایمەزراند بوون، کەمەشقی بە ئەفسەر و سەربازان دەکرد بەشێوازی ئەوروپی نوێ بە ئومێدی ئەوەی سوپایەکی نوێی لێدروست بکات بۆیە بە تێپەڕبوونی کات سولّتان پەنای برد بۆ ئەندامانی سوپای نوێ و تۆپ بۆ لە ناوبردنی سوپای ئینکشاریەکان و هەلّوەشاندنەوەی، هەربۆیە شێخی ئیسلامیش فەتوای دەرکرد کە چاکسازی لە سوپادا بۆ دەوڵەتی عوسمانی کارێکی پێویست و شەرعیە، پێویستە سوپایەکی گەورە و نوێ دروست بکرێ کە بەشێوەیەکی پێشکەوتوو بێت بۆ ئەوەی پارێزگاری لە دەوڵەتی عوسمانی پێبکرێ، سولّتان محمودی دووەم خاوەن کەسایەتیەکی بە هێز ولێهاتوو بوو توانی کارەکان ڕێکبخات لەسەر شێوازی ئەوروپی و ئیمپراتۆری عوسمانی لە ڕووخان ڕزگار بکات [٨٥].

بارودۆخی گشتی دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان محمودی دووەم و ڕووداوەکانی ئەو ماوەیە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر ڕەوت و ئەنجامی چاکسازیەکانی سوڵتان بەتایبەت لاوازی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕووی سەربازییەوە کە ئەوکاتە هەندێك لە بنەماڵە و نەتەوە جیاوازەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە تایبەتی جێگا دوورەکان توانیان ئەو بارودۆخە بقۆزنەوە و هەوڵی دەسەڵاتی خۆیەتی بدەن لە ناوچەکانی خۆیان و شێوە سەربەخۆیەك بەدەست بهێنن، لە گرنگترین ئەو دەسەڵاتانەش کە لە کاتی هاتنە سەر کاری سوڵتان محمودی دووەم دەسەڵاتیان لە دەستدا بوو بریتی بوون لە مەمالیکەکانی بەغدا (١٧٥٠_١٨٣١)، بنەماڵەی جەلیلیەکان لە موصل (١٧٢٦_١٨٤٣)، بنەماڵەی قەرانلی لە تەرابلوس (١٧١١_١٧٥٣)،بنەماڵەی حسەینی لە تونس (١٧٠٥_١٨٨١)، زەیدییەکان لە یەمەن ، هۆزە عەرەبیەکان لە عێراق و شام، هەروەها میرنیشنە کوردیەکان لە کوردستان وەك میرنیشنەکانی بابان و سۆران و بۆتان.سوپای عوسمانی کە بۆماوەیەکی زۆر مایەی شانازی و فراوانبونی دەوڵەت بوو، بەڵام لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە توشی لاوازی بوو؛ لەشکری ئینکشاریەکان کە هێزی سەرەکی و بڕبڕەی پشتی سوپای عوسمانی بوون لە هونەری شەڕ و چەکی پێشکەوتوو بێبەش بوو، هەروەها لەمەبەستە سەرەکیەکەی کە تێکۆشان بوو واتە (جهاد) بوو دوورکەوتبونەوە و خەریکی کاری ئاژاوە گێڕی بوون، کەوتبوونە ململانێ لەگەڵ سوڵتان و دەسەڵاتی ناوەندی حکومەت و دژایەتی کردنی چاکسازیەکانی دەوڵەت و زۆرجار دەگەیشتە ڕادەی کوشتنی سوڵتانەکان و لادانی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم( ١٧٠٣_١٧٣٠) و سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩_١٨٠٧) بەئاشکرا دەردەکەوێ [٨٦].

سـولتان محمـودی دووەم لـە ڕووی سـەربازییەوە، هەوڵیـدا بـەپێکهێنانی سەرکردایەتیەکی گشتی سـەربازی بـەردەوام کـە چاودێری کاروبارەکـانی سـوپا بێت و سوپایەکی نوێ دروست بکات، کە ژمـارەی سـەربازەکانی (١٢٠٠) سـەرباز بێت لە پایتەخت و هێزەکانی تر لە هەرێم و ویلایەتەکان وە ماوەی خزمەتکردنی سەربازانی سوپای نوێ (١٢) ساڵ بوو، کە پشتی بە پـسپۆرانی بـواری سـەربازی وڵاتـانی ئـەورووپا دەبەسـت بـە تایبـەت فەرەنـسی، کـە هەسـتان بەچـاکردن و ڕێکخستنی سوپاو کارگەکان و مەشق پێکردنیان و بـە کارهێنـانی چـەکی نـوێ و کەشتیگەل، بۆ ئەوەی جێگەی سوپای ئینکشاری بگرێتەوە، لە بواری پـەروەردە وفێرکردن سوڵتان محمودی دووەم چەند وەفد و نوێنەرێکی نارد بـۆ ئـەورووپا بـە مەبەسـتی فێربـوونی زانـستە سـەربازیەکان گرنگـی زۆریـی پێـدان، هـەروەها قوتابخانـە هونەریـە باڵاکـانی زینـدوو کـردەوە، خوێنـدکاری نـاردن بـۆ وڵاتـانی ئەورووپا بۆ ئەوەی فێری شێوازی سەربازی ئەورووپی و ببن بە مامۆستا و زانـستی سوپا لە دەوڵەتی عوسمانیدا، هەروەها بایەخی زۆری بەلایەنی تەندروسـتی داوە و چەندین قوتابخانەی تایبەت بەم بوارەی کردەوە و مامۆستای لە ئەورووپاوە بۆ هێنا کە ئامانج لەم کارەی ناردنی تیمی پزیشکی بـوو لەگـەڵ سـوپادا،گرنگی بـە قوتابخانە ئەندازیارییە دەریاییەکان داو فراوانی کردن، هەروەها سـولتان گرنگـی زۆری داوە بە قوتابخانەی مۆسیقای سوپای و قوتابخانەی زانستی سـەربازی کـە ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی سوپایەکی نوێ پێك بهێنرێ لەسەر شێوازی ئـەورووپی، کە زۆربەی سەرپەرشتی کارانی ئـەم قوتابخانانـە فەرەنـسی بـوون، لـە بەرامبـەر ئـەم کارانـەی سـولتان محمـودی دووەم سـەربازانی ئینکـشاری دڵگـران بـوون و پێکدادان لە نێوانیان دروست بوو هێزی ئینکشاریەکانی بەرەو لاوازی و لەناوبردن برد [٨٧].

هەروەها هۆكارێك كە سوڵتانەكان ویستیان چاكسازی لە سوپا بكەن لاواز بوونی سوپای ئینكشاریەكان بوو، هەروەها هێرشی وڵاتە ئەوروپیەكان بوو كە دەوڵەتی عوسمانی نەیدەتوانی بەرەو ڕوویان بوەستێنەوە بە هۆی نەبوونی سوپایەكی بە هێز و نوێ، بۆیە سوڵتان بڕیاری دەركرد بەبانگهێشت كردنی یاریدەدەری وەزیرەكان و گەورە ئەفسەرانی سوپای ئینكشاری لەماڵی مفتی گەورە كۆبوونەوە لە سەرەتای ساڵی ١٨٢٦ وە چەند بڕیاریان دەركرد مفتی ڕازی بوو بە چەسپاندنی یاسای نوێ لە وڵاتدا و چاكسازی گەورە هەموو نوێنەران واژۆیان لەسەر كرد بە والی و ئەفسەرە ئینكشاریەكانیشەوە، بەڵام ئەفسەرەكان هەر بە ظاهیری ڕازی بوون و ئەگینا لە دڵیان ناڕازی بوون، چونكە یاسای نوێ ئەبێتە هەڵوەشاندنەوەی سوپای ئینكشاریەكان و دەست گرتن بەسەر زەوی و زارەكانیان و هەموو بەرژەوەندی و ئارەزووەكانیان لە دەوڵەتی عوسمانیدا(٨٨).

پێویستە ئێمە ئاماژە بەوە بكەین لە پاش هاتنە سەركاری سوڵتان مەحمودی دووەم چەندین كەسایەتی و میری گەورە بەدەركەتبوون و كەوتبوونە ململانێ لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەت و سوڵتان هەوڵی سەربەخۆی خۆیان ئەدا، لەگرنگترین ئەم كەسایەتیانەش محمد علی پاشای والی میسر(١٨٠٥_١٨٤٠ز) و علی پاشا لە ناوچەكانی (ئەلبانیا) سەربەخۆی خۆیان ڕاگەیاند، هەروەها هەندێ لە نەتەوەكانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیش لە بەشی ئەوروپا كە زۆرینەیان مەسیحی بوون و كەمتر سۆزیان هەبوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی، دەوڵەتانی ئەوروپی كەوتنە شۆڕش كردن بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی خۆیان، بەتایبەتی یۆنانیەكان كە كێشە و گرفتێكی زۆریان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست كرد لە ساڵی (١٨٠٤)ەوە دەستیان كرد بوو بە

شۆڕش کردن، سەرەڕای لاوازی سوپای ئینکشاریەکان کە گرفتێکی زۆر گەورە بوو لە بەردەم فراوانبونی دەوڵەتی عوسمانی، ئەم سوپایە کێشەیەکی گەورەی دارایی بۆ دەوڵەت دروست کردبوو بە هۆی خەرجیەزۆرەکانیان و ژمارەی ئەو پسولانەی کە سەربازەکان موچەیان پێوەر دەگرت فرۆشتبوویان بە کەسانی مەدەنی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم گەیشتبۆ (١٣٥٠٠٠) پسولە، تەنها (٥٪)ی هەلگرانی ئەم پسولەیە بە چاکی بەشداریان لە ژیانی سەربازی دا دەکرد، لەبەر ئەم هۆیەش بوو ئینکشاریەکان بەرهەڵستی هەموو پرۆژەیەکی چاکسازیان دەکرد لە بواری سوپایدا[٨٩].

بەهاتنی سوڵتان مەحمودی دووەم هەوڵێکی نوێ درا لە بواری چاکسازی سەربازی، لەبەر ئەوەی سوڵتان مەحمود ئاواتی بۆ پاراستنی وڵات لە ناوچوون و روخان چاکسازی کردن بوو، هەرچەندە لەسەرەتادا بە تەواوی نەیتوانی چاکسازی بکات لەبەر ئەوەی دوژمنانی چاکسازی لە ئینکشاری و پیاوی ئاینی توند ڕەو لەسەر هێزو توانای خۆیان مابوون، بەلام لە دواتردا سوڵتان بە شێوەیەکی زۆر باش و ژیرانە هەستا بەبەخشینی پۆست و پایە بەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەو کەسانەی کە لایەنگری چاکسازی بوون و هەوڵی چاکسازیان دەدا، هەروەها کەوتە لادانی ئەو کەسانەی کە دژی چاکسازی کردن بوون لە پایە گرنگەکانی دەوڵەت و هەموو ئەم کارانەشی بۆ ئەوە بوو کە لایەنگری زۆر بێت بۆ جێ بەجێ کردنی چاکسازیەکەی، هەروەها هەستا ژمارەیەکی زۆری لە ئەفسەر و پلە دارەکانی سوپای ئینکشاری کرد بە لایەنگری خۆی، هەروەها پێدانی پلەی سەربازی بەرز بەو سەرکردە ئینکشاریانەی باوەڕیان بە پێویستی چاکسازی هەبوو[٩٠].

پاش ئامادەكاری تـەواو بـۆ چاكسازی سـوڵتان مـەحمودی دووەم لـە سـاڵی ١٨٢٦ بە ئامادە بوونی سەرۆك وەزیران و زۆربەی كاربەدەستە باڵاكانی دەوڵـەت و زانایانی ئـایینی، ژمارەیـەك لـە ئەفسەرانی (یـەنی شـەهری) بانگێشت كـرد و ئەنجومـەنێكی گـەورەی لێدروسـت كـردن و پـڕۆژەی چاكسـازی كردنـی سـوپای خستە بەردەستیان، پڕۆژەكەش ئەوە بوو سێیەكی یەنیشەهریەكان هەڵبژێردرێن بۆ ئـەوەی بەدرێـژای سـنورەكانی ڕۆژئـاوای دەوڵـەت مەشـقیان پێبكـرێ لەسـەر شێوازی تازە و هەروەها جل و بـەرگی تایبـەتیان لەبـەر بێـت پڕۆژەكـەش پـێی دادەگـرت لەسـەر نەهێـشتن و نـەمانی بـەرتیلكاری لـە نـاو ڕیزەكـانی سـوپادا، ئەنجومەنەكەش بە تەواوی ئەم پـڕۆژەی پـێ بـاش بـوو قبـوڵی كـرد، كەئەمـەش مانای نەمانی سوپای ئینكشاریە و هەڵوەشاندنەوەی ئـەم سـوپایەیە، ئـەوە بـوو دەستكرا بە پێكهێنانی ئەو هێـزە تازەیـە و ناویـان لێنـا سـوپای مهـدی كـە ئـەم هێزە تازەیە لەلایەن ڕاهێنەرانی وڵاتانی ئەورووپا مەشق دەكران[٩١].

دوا بـەدوای ئـەو چاكسـازیەی سـوڵتان مـەحمودی دووەم، ئینكـشاریەكان بەرهەڵستی چاكسازیان كردو و دەستیان كرد بە هەڵگەڕاندنەوە و ناڕەزای بوون، سەدری ئەعزەم هێزێكی گەورەی نارده سەریان و داوای لێكردن دوای گەمارۆدان خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام ئەوان ڕەتیان كردەوە بۆیە شـەڕێكی گـەورە لـە نێوانیان دروست بوو كە بە (ڕوداوی خێر) ناسراوە لـە گۆڕپـانی ئـات مەیـدان لـە ئەسـتەمبوڵ ، هـەر لـە دوای ئـەم ڕووداوە لـە تـەواوی ناوچـەكانی دەوڵـەتی عوسمانی ناوی ئینكشاریەكان قەدەغە كراو هێزێكی نوێی دروسـت كـرد لەسـەر شـێوازی ئـەورووپی و پـشتی بـە ئەفـسەرە پروسـیەكان دەبەسـت بـۆ پێكهێنـانی سـوپای نـوێ و مەشـق پێكردنیـان، هـەر بۆیـە سـوڵتان زیـاتر گرنگـی دەدا بـە قوتابخانـە دەریاییـەكان و ئەنـدازیاری سـەربازی و لـەم مەیانەیـەدا قوتابخانـە

سەرەتاییەکانی لە ژێر سەرپەرشتی لیژنە ئایینەکاندا هێشتەوە و قوتابخانەی (ڕوشدیە)ی دامەزراند کە تایبەت کرا بوو بۆ لایەنی پزیشکی و ئەندازیاری و پۆستە بەرزەکانی وڵاتەوە، لە ساڵی ١٨٢٧ (١٥٠) قوتابی نارده دەرەوەوە، قوتابخانەی پزیشکی کردەوە بۆ مەبەستی ئامادەکردنی پزیشکی سەربازی کە بەزمانی تورکی و فەرەنسی فێر دەکران، جگە لە دامەزراندنی چەندین کارگەی گەورە و پێش کەوتوو لە بواری چەك و تەقەمەنی و تۆپ و کردنەوەی قوتابخانە سەربازیەکان لە ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی، دواتر زانستەکانی مێژوو جوگرافیا و بیرکاری خستەکارەوە، هەموو ئەمانە بوونە لێك هەڵوەشاندنەوەی سوپای ئینکشاری(٩٢).

سوڵتان مەحمودی دووەم چاوەڕێی دەرفەتی گونجاوی دەکرد، تا لە ئینکشاریەکان بدات لە ساڵی ١٨٢٦ واتە هەژدە ساڵ دوای ئەوەی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتووە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ناوی ئینکشاریەکان گەلێك دابەزیبوو بە هۆی لاوازبونیان وگەندەڵ بونیان، هەروەها بە هۆی ئەم چاکسازیە زۆرانەی کەکرا لەسەردەمی سوڵتانەکانی عوسمانی بە تایبەت لە بواری سوپایی و سەربازیەکان، وە بە هۆی شکستە زۆرەکان و بەردەوامەکانی سوپای ئینکشاریەکان لە بەڵقان و ئەورووپای ڕۆژهەڵات، هەر بۆیە سوڵتان پلانێکی تۆکمەی دانا بۆ لەناو بردنی تاقمەکانی ئینکشاریەکان پلانەکەی ئەو کاتە دەستی پێکرد کە فەتوایەکی شەرعی دەرکرد کە گوایە دەبێت سوپای ئینکشاریەکان مەشق و ڕاهێنانیان پێبکرێ لەسەر شێوازی نوێی ئەورووپی تاوەکو بتوانن لەگەڵ کافرەکاندا بجەنگێن، دواتر فەرمانی دا کە مەشق بکرێ بە تیپە ئینکشاریەکان و بەسەریاندا بیسەپێنن، بەڵام ئینکشاریەکان ئەوەیان بەلاوە پەسەند نەبوو و بەرەو ڕووی سوڵتان بوونەوە و شۆڕشیان بەرپا کردو ناڕەزای

بوونی خۆیان بۆ سوڵتان و کارەکەی دەربڕی و بۆیە لەوکاتەدا شەڕ لە نێوانیاندا دروست بوو ژمارەیەك لە ئینکشاریەکان کوژران و ژمارەیەکی تریشیان هەڵاتن و خۆیان بەدەستەوە نەدا، وە لە چەندین شاری دیکە دەوڵەتی عوسمانی ڕووبەڕووی سوپای ئینکشاریەکان دەبوونەوە و سوڵتان فەرمانی دەرکردبووبۆ لەناوبردنیان لەسەران سەری ئیمپراتۆریەتەکەی، داوای لێکردن سوپای ئینکشاری لە ناوچەکانی خۆیاندا هەڵبوەشێنەوە و (سیستەمی نوێی سوپای ) پەیڕەو بکەن بە هۆی هەموو ئەوکارانەی سوڵتانی عوسمانی بوبە هۆی لێك هەڵوەشانەوەو کۆتای هێنان بە سوپای ئینکشاری [٩٣].

هەر دەربارەی چاکسازیەکانی سوپا، لە ڕوداوە سەربازیەکان دەرکەوت کە هێزی دەریای عوسمانی لەگەڵ ئەوەی کە زۆر بوون، بەڵام کاریگەریەکی زۆری نەبوو بۆ بەهێزبوونی دەوڵەتی عوسمانی، چونکە دەریاوانەکان بەگشتی ئینگلیز بوون واتا کەشتی دەوڵەت لە ژێر دەستی دوژمن بوو، بۆیە سوڵتانانی عوسمانی لە بواری دەریاوانیشدا چاکسازیان کردووە و هەرچیەك گونجاو بێت لە بواری کەشتیوانی و بەرەو پێشبردنی کردویانە، هەروەها هەستاون چەکی نوێ یان هێناوە و گرنگی زۆریان داوە بە هونەرەکانی جەنگ و ئەفسەری گەورەی ئەورووپیان هێناوە بۆبەرەو پێش بردنی سوپای عوسمانی و دروست کردنی سوپایەکی نوێ کە جێگەی سوپای ئینکشاریەکان بگرێتەوە و بێباك بن لە سوپای ئینکشاری [٩٤].

بەرای ئێمە دامەزراندنی سوپایەکی نوێ لەسەر سیستەمی ئەورووپی بۆ دەوڵەتی عوسمانی کارێکی پێویست بوو بۆ ئەو سەردەم، بە ئامانجی دەرباز بوونیان لەو قەیرانەی کە بەهۆی گەندەڵ بوونی لەشکری ئیسنکیشاری تێکەوتبوون کە لە زۆربەی شەڕەکاندا توشی زیانی ماددی و مەعنەوەی ببوون بە

تایبەت لە بەرامبەر هێزە ئەوروپیەکان کە چەندین ناوچەیان لە دەست دا، بۆیە سولتانەکانی عوسمانی هەر زوو هەستیان بەگەندەڵ بوون و شکستی سوپایەکەیان کرد و لە سەردەمی چاکسازیدا بیریان لە دامەزراندنی سوپایەکی نوێ کردەوە لەسەر شێوازی ئەوروپی، کە بەهۆیەوە توانیان بۆ ماوەیەك بەردەوام بن لە بوژانەوە و فراوانخوازیەکانیان.

## باسی دووەم / چۆنیەتی ڕووخانی سوپای ئینکشاری و کاریگەری لەسەر دەوڵەتی عوسمانی .

لاوازی سوپای ئینکشاریەکان بە تەواوی کاریگەری هەبوو بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی ئەوەی کە ئینکشاریەکان گەندەڵ بوو بوون وەك پێویست ئەرکەکانی خۆیان بە جێ نەدەگەیاندو زیاتر بەدوای بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەگەڕان بۆ ئەوەی سەروەت و سامان کۆبکەنەوە و پۆستێکی گەورە لە وڵات وەربگرن و زەوی و زارێکی زۆریان کۆکردبۆوە و زۆربەی سولتانەکانی عوسمانی هەڵدەستان پارەیەکی زۆریان ئەدا بە ئینکشاریەکان بۆ ئەوەی شۆڕش بەرپانەکەن و ئاژاوە نەنێنەوە لە وڵاتدا ، هەروەها بە هۆی نەبوونی ئامانجێکی گشتی لەلای هێزی ئینکشاریەکان کە ماوەیەکی زۆر لە قەڵاکان و شارەکان ئەمانەوە ، بەهۆی زۆری شەڕەکان کە بەسەریان هاتبوو سولتانیش زۆر گرنگی پێدەدان و ئەوانیش لەخۆبای ببوون،لەسەرەتادا ئینکشاریەکان لە پەیکەرێکی گەورە و بەهێز ئەچوون لە پارێزگاری کردن لە ئاسایشی وڵات کە تێایدا بوون،بەڵام دواترگۆڕا بۆ ڕەگەزێکی گەندەڵ و فەوزانانەوە و هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ماڵ و سامان کە هەندێ ناوچەیان کۆنترۆڵ دەکرد و لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان لە هەندێ ناوچە بەکاریاندەهێنا ، گۆڕینی سیستەمی

ئینکشاریە بۆ سیستەمی پوکانەوە و لە ناوچوون ، کە بۆ هەموو سەربازێکی ئینکشاریە پێناسێك دروست کرابوو بۆ سەفەرکردن بە ئارەزوی خۆی بۆ هەر کوێ کە حەزی لێبێت و بۆ وەرگرتنی پارە بەشێوەیەکی نەقدی لە دوای لاواز بوونی دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی زۆری باجەکان و نەدانی مافی خەڵك لەلایەن دەوڵەت و وەرگرتنی باج بەشێوەیەکی توندوتیژ لە خەڵك بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی پیشەوەر و هەندێ لە سەربازان ریزەکانی ئینکشاریەیان جێهێشت، هەروەها لاوازی چاودێری دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر ئینکشاریەدا کە پەیوەندی سەربازانی ئینکشاریە لەگەڵ پیشەوەرەکانی شاردا دەبەست لە پایتەختدا لەبەرهەم هێنانی باروت و قازیفە [٩٥]، کە دواجار دەوڵەتی عوسمانی ویستی رەگ و ریشەی ئەم کارەی ئیبکشاریەکان دەربهێنێت بەڵام نەیتوانی ئەنجامی بدات تاوەکو سەردەمی سوڵتان محمودی دووەم کە توانی کۆتای بە هێزەکانی ئینکشاری بهێنێت ، هەروەها لاواز بوونی ئینکشاریەکان کە هۆکار بوو بۆ لە ناوچونی ئەم سوپایە بەهۆی ئەوەی لەلایەن هەندێ لە سەربازانی ئینکشاریە چەند سەربازێکی تایبەت فرێندرا بوون و لە ناوچەکانی ویلایەتەکاندا لە سەدەی ( ١٨) کە زۆربەی ئەو پارانەی دەوڵەت دابینی دەکرد لە دراوی ویلایەتەکان بوو ، دەوڵەت پشت دەبەستێ بە سەربازە خاوەن پارەکان ، تاوەکو وایلێهات بوو بە هۆی دروست بوونی پشێوی و فەوزا و ئاژاوە نانەوە و تێکچونی ریزەکانی ئینشکاریەکان و لاوازبوونی و دواتر بو بە هۆی رووخانی سوپای ئینیشکاریە و کاریگەری هەبوو لەسەر لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی[٩٦] .

سوڵتان مەحمودی دووەم بەم کارەی ئینکشاریەکان تێکچوو کە دەیانکرد و ئەو هەڵسوکەوتانەی کە دەیانواند وە سەرسام بوو بەو نیزامە سەربازیە تازەی کە دروستی کردبوو دڵخۆش بوو پێیان و شانازی بە سەرکەوتنەکانی ئەو سوپا

تازەیە دەکرد کە دەستەبەری کردبوو [٩٧]. گوێ بیستی ئەوە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە لە جەنگی دژی یۆنانیەکان کە لە دەرئەنجامی ئەو سیستەمە سەربازیە تازەیە کە دروستی کردووە ، بەوەش زیاتر پەیوەست بوو بە چاکسازی سەربازی و زیاتر گرنگی پێدانی ، بۆیە هەستا بەکۆکردنەوە ی میر و پیاوماقوڵان و شانشینەگەورەکان و ئەفسەرانی ئینکشاریە لەساڵی ١٨٢٦ کەلە ماڵی موفتی کۆی کردبوونەوە، کاتێك هەمووان ئامادەبوون لەوتەیەکدا سەدری ئەعزەم وێنەیەکی خستەڕوو لە بارەی ئەو حاڵەتە و بارودۆخە لاوازە و گەندەڵیەی کە هێزە ئینکشاریەکان پێی گەیشتوون لەلاوازی و رووخان و مل نەدان بۆ فەرمانەکانی تاوەکو بوو بەیەکێك لەگەورەترین هۆکارەکانی لاوازبوون و دواکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی. لەبەرامبەر پێشکەوتنە بەردەوامەکانی وڵاتی ئەوروپا بۆیان ڕوون بۆوە کە پێویستە سیستەمێکی نوێ بۆ ڕێکخستنی سەربازی بخرێتەکار و شێوازێکی نوێ لەناو هێزەکانی ئینکشاری پەیڕەوبکرێ و بەو حاڵەتەی ئێستاوە ناتوانێت لەبەرامبەر سوپا ڕێکخراوەکانی ئەوروپی دا بجەنگێ و بوەستێت ، کاتێکیش سوڵتان مەحمودی دووەم ئامادەبوانی گەیاندە ئەو قەناعەتەی لەبارەی دروستی بیرۆکەکەی و پێویستی ئەنجامدانی چاکسازی سەربازی سەرجەمیان لەسەر ئەم بیرۆکەیە و مەبدەئە هاودەنگ بوون. ڕازنووسی ( مەکتوبچی ) سەدری ئەعزەم هەستا بەخوێندنەوەی ئەو پرۆژەیە کەلە ( ٤٦ )بەند پێکهاتبوو، کە بەڕوونی باس لە چاکسازی گەورە دەکات لە سوپا ، پاش پەسەندکردنی لەلایەن لیژنەکە سەرجەم ئامادە بووان بە سەربازانی ئینکشار یشەوە ئیمزایان لەسەر کردبوو موفتیش فتوای لەسەردا و دروستە کاری پێبکرێت و لەڕوی شەرعەوە و سزادانی هەریەکێك لەوەی کە بەرەنگاری بێتەوە لەسەر خستنی دا، پاشان پرۆژەکە بۆ سەرجەم ئەفسەرانی

ئینکشاریە خوێندرایەوە،بەڵام تەنها بە ڕواڵەت ڕەزامەندیان لەسەر دەردەبڕی ، کاتێکیش دەستکرا بەڕاهێنان و زانیاری پێدانی ئەفسەران لەلایەن ئەفسەرە فەرەنسیەکان کە وەك مامۆستا بۆیان دیاری کرابوو ، سەربازانی ئینکشاری بۆیان ڕوونبۆوە ئەو سیستەمە تازەیە لە سوپادا پەیڕەو دەکرێ بە فەرمانی سوڵتان دەبێتە هۆی لە ناوچونی پلەی ئیمتیازاتەکانیان و لە دەست دانی سەربەستی خۆیان، بۆیە هەستان بە خۆئامادەکردن بۆ شۆڕش و یاخیبوون بەئامانجی وەستانی ئەم بڕیارە و جێ بەجێ نەکردنی [٩٨].

سوڵتان مەحمودی دووەم سیستمی سەربازی کردنی ناچاری دەرکرد، ماوەی سەربازی کردنی کرد بە (١٠) ساڵ و ئەفسەرەکانی ناردن بۆ دەرەوەی وڵات بۆ زیاتر شارەزابوونی سەربازی لە چواچێوەیەکی فراواندا و ژمارەیەکی زۆریشی لە ئەفسەرانی لە فەرەنسی بانگێشت کرد بۆ ڕاهێنانی هێزە نوێیەکان بەم کارەشی زیاتر هێزەکانی ئینکشاری یاخی بوون و دەستیان کرد بە شۆڕش [٩٩].

هەر بۆیە لە ساڵی (١٨٢٦) سەربازانی ئینکشاریەکان لەکاتی مەشق و ڕاهێناندا سەربازەکان یاخی بوون و گوێیان بەفەرمانەکانی سوڵتان نەداو سوڵتانیش فەرمانیدا بە سزای کوشتنی هەرکەسێك سەرپێچی و پشت بکات لە فەرمانەکان بۆیە سەرجەم ئەوانەی کە پەیمانیان دابوو سەر لەئێوارەی ئەو ڕۆژە کوبوونەوە بۆ پوچەڵکردنەوە و لەناو بردنی ئەو یاخی بوونە، لەبەرامبەردا سوڵتان زانایانی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن کە ئینکشاریەکان چ مەبەست و مەرامێکیان هەیە ئەوانیش کارەکەیان بە ناڕەوا و خراپ دانا هانییاندا بەرەنگاریان بێتەوە، لە پاش ئەم پرس و ڕاوێژە تیمی تۆپخانە (تۆپچی) بانگکرا کە ئەو تیمە لە دوای هاتنە سەرکاری سوڵتان سەلیمی سێیەم بەجۆرێکی باش

ڕێکخرابوو، سولتان خۆی ئامادەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخی بووان و پێداگری کرد کەبەهیچ شێوەیەك لە بەرامبەریان بەزەیی نانوێنێ و لەبەر مەترسی بلاوبونەوەی خراپەکاریەکانیان.سولتان بەهەلگرتنی ئالای پێغەمبەر (د.خ) لەگەلّ سەربازەکانی دەرچوو فەرمانیدا بەتیمی سەربازی تۆپخانە بەرەو گۆڕەپانی ( ئات میدان) بە ئالاکەوە پێشڕەوی بکەن و ئەو کاتە یاخی بووان لەچەند شوێنێك بوون بۆ نانەوەی ئاژاوەگێڕی، بەلام زۆرێك لەخەلك بەدوای ئەوە نەبوون وزۆرێك لەقوتابیان و زانایان بەدوای سولتانەوە بوون، زۆری نەبرد تیمەکانی تۆپچی لەگۆڕەپانی ( ئات میدان) هەموو لایەکیان گەمارۆداو دەستیان گرت بەسەر گشت بەرزایەکان کەدەیانڕوانیە گۆڕەپانەکە سەربازە ئینکشاریەکانیان لەهەموو لایەکەوە خستە ژێر لولەی تۆپەکانیان، پاشان ئینکشاریەکان سەرجەمیان دەرچوون بەکۆمەلّ و قەرەباڵغیەوە هێرش بکەن بۆسەر تۆپەکان تاکو دەستیان بەسەردا بگرن، بەلام تۆپەکان لەهەموو لایەکەوە بۆمبارانی کردن ژمارەیەکی زۆری لەناو بردن و تەنیا ژمارەیەکی کەم لەسەربازانی ئینکشاریە مابونەوە دلنیا بوون لەوەی کە ناتوانن بەرەنگاری بنوێنن، بۆیە سەربازەکانی ئینکشاریە لە پەناگاکاندا خۆیان شاردبۆوە و داوای ڕزگاری پارێزی گیانیان کرد بەلام گوێ بەم داواکاریە نەدراو تۆپەکان بەچڕی بۆمبارانی دەکردن و پەناگەکانی سوتاندن و وێرانی کردن و بەو جۆرە ئەو ئاژاوەو یاخیبونە زۆرەی کەدەمێك بوو دەستیان پیکردبوو کۆتای هات [١٠٠].

ژمارەی کوژراوان لە سەربازانی ئینکشاریە لە ڕووداوەکەی (ئات میدان) بە مەزەندەکراوی کە لە نێوان (١٥-١٦) هەزار سەرباز بوون، بۆیە بەڕوداوێکی گرنگ گەورە دانراوە لەمێژوی دەولەتی عوسمانی [١٠١].

لـە ڕۆژی دوایـدا مەرسـومی سـوڵتان مـەحمودی دووەم دەرچـوو بـە هەڵوەشاندنەوەی تـەواوی سـوپای ئینکـشاریە و جـل و بـەرگ و زاراوە و ناویـان لەسەرجەم ویلایەتەکانی ژێر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی، هـەروەها فـەرمان دەرچـوو بـۆ سـەرجەم ویلایەتـەکان کـە ئـەو ژمـارە سـەربازانەی ماونـەوە یـان هەڵاتوون کە لە سێدارە بدرێن یان دوریـان بخەنـەوە بـۆ شـوێنە دورەکانی وڵات تاوەکو جارێکی تـر نـەتوانن خۆیـان ڕێکبخەنـەوە، لـە دوای ئەمـە سـوڵتان ڕێـو شوێنی تایبەتی گرتەبەر بۆ ڕێکخستنی سەربازی بۆ سوپاکەی تاوەکو کەسی تـر نـەتوانێت دەستی بخاتـە ناویـەوە، بـۆ ئـەم مەبەستـەش هەستا بـە پێکهێنـانی لیژنەیـەك لـە گـەورە وەزیرەکـان و حسێن پاشـای وەزیـری سـوڵتان مـەحمودی دووەم کە دەستێکی بـاڵای هـەبوو لـە لـەناوبردنی ئینکـشاریە ڕای سـپارد وەکـو سـەرکردەی بـاڵای سـوپا، سـوڵتان و ڕاوێـژکارانی هـەوڵ و توانایـەکی زۆریـان خـستەگەڕ تـاکو پـێش کۆتـای ئـەو سـاڵە توانیـان (٢٠) هـەزار سـەربازی نـوێ بەتەواوی ڕێکبخەن و چەکداریان بکەن لە کۆتای سـاڵی داهـاتوو واتـە لـە کۆتـای سـاڵی ١٨٢٧ ژمـارەی سـەربازانی نـوێ گەیـشتە (١٢٠) هـەزار سـەربازی ئامادەکراو[١٠٢].

دوای هەڵوەشاندنەوەی سـوپای ئینکـشاریەکان سـوڵتان لـە پـەیڕەو کردنـی نیزامـی نـوێ لـە سـوپادا و ڕاهێنـان و ڕێکخـستن بـەپێی ڕێگاکـانی سـەربازی ئەوروپی، ئیمپراتۆریەکەی دابەش کرد بۆ چەندین دائیرەی سـەربازی وە لەسـەر هەر دائیرەیەك سوپای تایبەتی خۆی داناوە و ئەفسەرێکی گـەورە سەرپەرشـتی ئەو سوپایە دەکات کـە نازنـاوی ( سر عـسکرة ) لێنـاوە واتـە ( سـەر لەشـکر ). لەسـاڵی ١٨٢٨ سـوڵتان مـەحمودی دووەم دووبـارە بڕیـاری دامەزرانـدنی قوتابخانەی هەندەسی سەربازی دەرکردەوە و وە هەندەسەی دەریاوانی فراوانتر

کرد و گرنگی زۆری پێداوە ،جگە لە قوتابخانەی سەربازی کە زۆربەی ئەو قوتابخانانە چاودێرەکانی فەرەنسی بوون [١٠٣].

سەرەڕای گرنگیدانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەهێزکردن و چاکسازی لە بواری سوپایدا و ڕێکخستنی خزمەتی سەربازی و ڕێکخستن لەسەر شێوازی ئەوروپی و مەشقی ئەوروپی دەرکردنی چەند یاسایەك بۆ بابەتی چاکسازی سوپای بۆمان دەردەکەوێ کەوا زۆرێك لە سەربازان لەکاتی شەڕەکاندا پێچەوانەی چاکسازی و هەوڵەکانی سوڵتانی عوسمانی کاریان کرد بۆ لایەنی سەربازی ئەم پێچەوانەیەش کاریگەری هەبوو لەسەر لاوازکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی [١٠٤].

دوای نەمانی سوپای ئینکشاریە و دروست بوونی سوپای نوێ لەسەر شێوازی ڕۆژئاوای وڵات بەرەو لاوازی و بارودۆخی خراپ دەڕۆیشت، ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە سەربازانی سوپای نوێ ناکۆکیان لە نێوان دروست بوو وەك پێویست کارەکانیان بە ئەنجام نە دەگەیاند ، بۆیە کۆنترۆڵ کردنی هێزی سەربازی بە شێوەیەکی گشتی لەلای سوڵتانی عوسمانی وڵاتی بەرەو لاوازی برد، لەبەرئەوەی سەربازەکان بیریان بە عەقڵ نەدەکردەوە و بەباشی کاریان نەدەکرد هەر بیریان لای بەخشش و ماڵ و سامان بوو، هەوڵی زۆریان دەدا بۆ بەدەست هێنانی زەوی ئەمە وایکرد سەربازەکان گرنگی بدەن بە شوێن و دەسەلاتی خۆیان، هەمیشە بەدوای بەرژەوەندیەکانی خۆیان بوون لە هەوڵی ئەوە دابوون خۆیان لە سوڵتان نزیك بکەنەوە بۆ وەرگرتنی پۆست و پلە و پایە، هەموو ئەو هۆکارانە کاریگەری گەورەی کردە سەر لاوازی و ناکۆکی لەناو دەسەلاتی عوسمانی و دەوڵەتی عوسمانی بەرەو روخان دەبردکە توانای فراوان بوون و بەرگری کردنی نەمابوو. بێگومان بۆ بەرەو پێشچونی وڵات پێویستە ئابوری باش هەبێت و سوپایەکی گەورە و بەهێز و پێشکەوتو هەبێت بۆ بەرە و پێشچونی دەوڵەت و بەرگری کردن

لە خۆی لەکاتی هێرشی دوژمنان و فراوان بوونی سنوری ولآت، بەلآم لە دەوڵەتی عوسمـانی کـە سـوپایە نوێیەکـەش وەك پێویـست نـەبوو ئـەرکی خـۆی بـەجێ نەدەگەیاند و سوپای ئینکشاری کۆتای پێهاتبوو بۆیە دەسەلآتی عوسمانی بـەرە و لاوازی هەنگاوی دەنا (١٠٥).

شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لـە سـەربازانی سـوپا هەڵدەهاتن جا بەهـەر شـێوەیەك بێـت. هـەروەها زیـاد بـوونی حاڵـەتی فـیراری سـەربازەکان لەوانەیـە بگەڕێتەوە بۆ توندوتیـژی لـە کۆکردنـەوەی سـەربازان، هـەروەها درێـژی مـاوەی سەربازی کردن واتە خزمەتی سەربازی کە خەڵك بەو هۆیەوە بێـزار بـوون، تـەواو هیلاك بوون بە خزمەتی سوپای، ئەوەی زیاتر خەڵکی بێزارکرد ناردنی سـەربازان بوو بۆ دوور لە ولآتی خۆیان بەتایبەتی بۆ ناوچەکانی (ڕۆمێلـی و چـیای ڕەش) ، بەبەردەوامی شۆڕش و ڕاپـەڕین لـە ویلایەتـەکانی عوسمانیـدا دەکـراو بـارودۆخی ولآت تێك ئەچوو نائارامی دروست دەکرد دەبوو بەسوپا ڕووبەڕویان ببنەوە بۆیـە ژمـارەی کـوژراوان و برینـداران زیـادی ئـەکرد ئەمـەش کاریگـەری زۆری هـەبوو لەسەر لاوازی دەسەلآتی سوڵتانەکان و لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمـانی. هـەروەها دیاردەیەکی تر کەلەو کاتـەدا هـەبوو کـە زۆربـەی تاکـەکانی گـەل منـداڵانی گـەل هەڵـدەهاتن لـە سـەربازی کـردن خۆیـان ئەشـاردەوە، بـەلآم بەشـێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەوڵەت لەو قوتابیانە خۆشبوو کـە لـە قوتابخانـە ئاینیـەکان دەیـان خوێند کە ئەیانتوانی سەربازی نەکەن، لەلای هەنـدێ هـۆز و عەشـیرەت کێـشەی نەکردنی سەربازیان لەلایەن تاکەکانەوە چارەسەر کرد ئەویش بە بیانوی ئـەوەی سەربازی کردن ڕێگە دەگرێ لە جێبەجێ کردنی واجبەکانی ئاینی . بۆیە بـەهۆی ئـەو دیاردانـە و لـەناو بردنـی سـوپای ئینکـشاری و دانـانی سیـستەمی نـوێ کـە لەدوایدا ناڕێك و پێك بوو ولآت لەکاتی شـەڕەکان لاواز بـوو توانـای بـەرگریکردنی

وەك پێویست نـەمابوو بۆیـە دەوڵـەتی عوسمـانی بـەرەو لێـك هەڵوەشـان ئەڕۆیشت[١٠٦].

هەمیشە دەوڵەتی عوسمانی پلەی بەرزی ئەدا بە سەربازەكان بۆ ئـەوەی لـە خۆیانی نزیك بكاتەوە و ڕازیان بكات لـە خـۆی، بۆیـە لـە دەرەنجامی ئـەم كـارە سـەربازەكان زۆر كـات هێـزی خۆیـان بـەكار ئـەهێنا بـۆ هەركەسـێ كـە داواكاریەكانیان جێ بەجێ نەكات ئەمەش خۆی لـە خۆیدا لاوازی سوپا و لاوازی دەسەلاتیان دەگەیانـد بـۆ هـەر كارێـك كـە سـەربازان حـەزیان لێبوایـە ئـەیانكرد ئەمەش ئاڵۆزی دروست كرد بوو وە دەوڵەت توشی گەندەڵی بوو بـوو كـە بـەرەو ڕوخانی دەبرد[١٠٧].

سـەربازەكان لـە دەوڵـەتی عوسمـانی لـە سـەریان پێویسـت بـوو كـە لـە سەربازگەكاندا بمێنەوە و حەقی خۆیان لەوێ وەربگـرن و واجبـەكانی خۆیـان بـە شێوەیەكی ڕێكوپێـك ئـەنجام بـدەن گـوێ ڕایـەڵی ئەفسـەرە بیانیـەكان بـبن كـە سـوڵتان لـە وڵاتـی ئـەڵمانیا و ڕوسیا و فەرەنـسا و ئینگلیـز هێنـا بـوونی بـەڵام بەباشـی ئەركـەكانیان نـە دەكـرد و بۆیـە دەوڵـەتی عوسمانی ڕوبـەڕوی هێرشـی دەرەكـی دەبـۆوە و شـەڕی زۆری ئـەنجام دەدا بـەڵام دەبیـنین سـوپاكە وەك پێویست نەبوو بۆیە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو لاوازی دەچوو[١٠٨].

لێـرەوە بۆمـان دەردەكـەوێ دەوڵـەتی عوسمـانی لاوازیەكـەی بـە هـۆی هەڵوەشانەوەی سیستمی سـەربازی ئینكشاریەكان زیـاتر دەركـەوت. كـە دواتـر هێزێكی نوێی سوپای دەركەوت وهۆیەك بـوو بـۆ لاوازی دەسـەڵات، هـەروەها بـە هـۆی بڵاوبونـەوەی بەدڕەوشـتی و بـەرتیل و بـێ هێـزی سـوڵتانەكان و خـراپ كۆكردنەوەی باج و سەپاندنی یاسـای پەیوەسـت بـوون بـە بـاج بۆیـە زۆرێـك لـە جوتیاران كۆچیان كرد لە زەویەكان بەهۆی زۆری باجەكانەوە. دەبینین سوڵتانی

عوسمانی بۆ چاكسازی كردن لە سوپا و هەڵوەشانەوەی سوپای ئینكشاری پێویستیان بە پارەیەكی زۆر بوو بۆ ڕێكخستنی كاروباری بواری سەربازی بۆیە دەوڵەتی عوسمانی ناچار بوو قەرز لە وڵاتانی ئەورووپی بكات ئەمەش وایكرد دەوڵەت بكەوێتە ژێر باری قەرزێكی زۆر و وڵاتانی ئەورووپیش بە هۆی بیانوی قەرز پێدان بە دەوڵەتی عوسمانی زیاتر دەسەڵاتیان فراوان كرد لەناو دەوڵەتدا و بەهۆی لاوازی دەوڵەت چەندین بزوتنەوە دروست بوو وڵات بەرەو پشێوی ڕۆیشت، كاتێ عوسمانییەكان توانای دانەوەی قەرزەكانیان نەبوو بۆیە قەرزەكانیان لەسەر كەڵەكە بوو سەرەنجام ئەورووپییەكان زیاتر ئیمتیازیان پێدەدرا لەناو دەوڵەتدا، هەروەها بەهۆی كاری چاكسازی لە دەوڵەتی عوسمانی دەرفەتی زیاتر ڕەخسا بۆ ئەورووپییەكان بۆ ئەوەی پارێزگاری بكەن لە نەتەوەكانی ژێر دەستی عوسمانی كە موسوڵمان نە بوون بۆ بەرژەوەندی خۆیان كاریان دەكرد لەناو دەوڵەتدا, چاكسازیەكان نەبوون بەهۆی بە هێزی دەوڵەت چونكە زۆربەی چاكسازیەكان ڕوكەشی بوون و چاولێكەری بوون و نەیتوانی لە بنەڕەتدا گەندەڵیەكان لەناو سوپا لەناو بەرێ بۆیە دەوڵەتی عوسمانی بەرەو ڕوخان و لەناوچوون ڕۆیشت (١٠٩).

## ئەنجام

بێگومان نوسین لە بارەی هەرشتێك و هەربابەتێك کۆمەڵێ دەرئەنجام دەدات بەدەستەوە و هەڵوێستە لەسەرکردنی دەبێتە داخوازیەکی زانستی بەتایبەت بابەتی مێژوویی کە هەر ڕووداوێك لە ناو زنجیرەی ڕووداوەکانی چەند ئەنجامێك دەدەن بە دەستەوە، لەم لێکۆڵینەوەیەش دا گەیشتینە چەند دەرئەنجامێك کە ئەمانەی خوارەوەن:-

**یەکەم:** عوسمانیەکان یەکێك بوون لەو هۆزە تورکمانانەی کە لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای مەرمەڕە لە باشوری قوستەنتینەی پایتەختی بێزەنتی دەژیان و وردە وردە دەسەڵاتەکەیان بەرەو فراوان بوون هەنگاوی دەنا.

**دووەم:** سوپا لە دەوڵەتی عوسمانی ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە فراوانبون و بەهێز بوونی ئیمپراتۆریەتەکە و بەرهەم و جێ دەستیان دیاربوو. لە سەرەتادا سوپا پشتی بە سوارەکانی تورکە دەرەبەگەکان بەستووە بۆ دامەزراندنی ئەم سوپایە، لە بەرامبەردا سەربازەکان پاداشت دەکران بە پێدانی زەوی کە زیاتر هۆکار بوون بۆ بەهێزی وڵات.

**سێیەم:** هێزی دەریای عوسمانی ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەری بینی لە فراوانخوازیەکانی عوسمانی، کە لە سەردەمی سوڵتان موورادی یەکەم گرنگی بەم هێزە دراوە. گەورەیی هێزی دەریای بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە چەندین فراوانخوازی و داگیرکاری ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە لە سەرکەوتنەکاندا.

**چوارەم:** دوای فراوانبونی دەوڵەتی عوسمانی و درێژەدانیان بەفراوانخوازیەکانیان پێویستیان بە سوپایەکی گەورە و بەهێز هەبوو بۆ جیهادکردن و ڕووبەڕوو

بونەوەی دوژمنان بۆیە سوپای ئینكشاری دامەزرا كە سولّتان ئۆرخان بیرۆكەی دامەزراندنی سوپاكەی دارِشت بەپێی سیستەمی دێفشرمە.

**پێنجەم:** لە سەدەی حەڤدە و هەژدە دەولّەتی عوسمانی بیری لە چەند چاكسازیەك كردەوە بۆ هەموو لایەنەكانی ئابوری و سیاسی و ئیداری و سەربازی بە تایبەت لایەنی سوپایی، لەو كاتەدا سوپای ئینكشاری بەرەو لاوازی هەنگای نابوو هەر بۆیە سوپای نوێی مەشق پێكراویان لەسەر شێوازی ئەورووپی چەندین قوتابخانەو كارگە دروست كران بۆ لایەنی سوپایی.

**شەشەم:** لە ئەنجامی چاكسازیەكانی دەولّەتی عوسمانی لە ڕووی سوپاوە سوپای ئینكشاری بەرەو لاوازی و لەناو چوون ئەچوو، سەربازانی ئینكشاری بەم كارە ڕازی نەبوون چەندین هێرشیان كردە سەر سوپا نوێ یەكە، چاكسازیە سوپاییەكان كە بەشێوەیەكی باش هەنگاوی بۆ نرابوو لەلایەن سولّتانەكان، بەلّام ئەمە پێچەوانە بۆوە كاریگەری هەبوو لەسەر لاواز بوونی دەولّەتی عوسمانی و دواتر بەرەو ڕووخانی برد.

پەراوێزو سەرچاوەکان

(١)محمد سهيل طقوش، تأريخ العثمانين من قيام الدولة الى الانقلاب على الخلافة،ط.الثاني، جميع الحقوقة محفوظة،بيروت_لبنان،٢٠٠٨. بە سود وەرگرتن لەسەرچاوەی نوسەر ،ئەحمەد حەمەد ئەمین، چەند پەرەیەك لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی عێراق،چ.یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلآت، هەولێر.٢٠١٠،لا ٢١.

(٢) د. إبراهيم خليل أحمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني (١٥١٦_١٩١٦) ط.الاولى، المطابع جامعة الموصل،١٩٨٣،ص ١٩_٢٠.

(٣)ابرى و برتولواشثولمر ،تاريخ الاسلام،ترجمة،أحمد ارام، ض٥،انتشارات اميركبر،تهران، ١٣٨٥،ص ٣٦٧.

(٤) د. إبراهيم خليل أحمد,المصدر السابق، ص ١٦.

(٥)د. علی وەردی، چەردەیەکی کۆمەلآیەتیانە لە مێژووی نوێی عێراق،و. دلێر میرزا، بەرگی یەکەم،چ .یەکەم، چاپخانەی تیشك، ٢٠٠٤، لا٤٨٧.

(٦) مێژووی نوێی کورد، http,//www .magjeedherire .Zhyan.net/vblindex.php.

(٧) راس نی دان و دیگران، تأريخ تمدن و فرهنگ جيهان، ت. عبدالحسين أزرنگ، جلد ٣،سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرصنگ و ارشاد اسلامی،تهران،١٣٨٢،ص ١٠٥.

(٨) عبدالمنعم الهاشمي، تأريخ العرب عصر المماليك و العثمانيون، ط. الاول، دار مكتبة الهلال،بيروت،٢٠٠٦ ، ص ١٨٧_١٨٨.

(٩) محمد سهيل طقوش, المصدر السابق، ص ٢٦.

(١٠) د.محمد عبدالله کاکە سور، دەوڵەتی عوسمانی دامەزراندن و فراوان بوونی، گۆڤاری مێژوو،ژمارە١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، لا ١٨٢

(١١) راس نی.دان و دیگران، المصدر السابق، ص ١٠٧_١٠٨.

(١٢) د.محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية والمسالة الشرقية، ط١، دار الثقافة للطباعة والنشر، القاهرة،١٩٧٦، ص١٧.

(١٣) محمد سهيل طقوش, المصدر السابق، ص ٣٤.

(١٤) كارل بروكلمان,تاريخ الشعوب الاسلامية،ت:نبية أمين فارس _ منيرا البعلبكي ، ط.الاول، دار العلم الملاين، بيروت، ١٩٤٨، ص ٤٥٨.

(١٥) د.محمد كمال الدسوقي، المصدر السابق، ص ١٧.

(١٦) محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص ٢٥.

(*) ئاقچە: جۆرێك بوو لە دراوی عوسمانیەکان.

(١٧) كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص ٤٥٨.

(١٨) زين العابدين شمس الدين نجم، تاريخ الدولة العثمانية، ط.الاول، دار المسيرة للنشرو التوزيع والطباعة،عمان، ٢٠١٠، ص٢٢٢.

(١٩) د.جميل بيضون، تاريخ العرب الحديث، ط.الاول، دائر الاول للنشرن التوزيع، ١٩٩٢، ص١٩.

(٢٠) زين العابدين شمس الدين، المصدر السابق، ص ٢٢٢.

(٢١) كارل برو كلمان،المصدر السابق، ص٤٥٩.

(٢٢) محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص٢٧.

(*) (ئەخیان) لەو کۆمەڵەو رێکخراوانەن کە کاکڵەی رێکخستنی یەکەم بوون لە ژیانی میرنیشنی عوسمانی تازەدا،کەئادابی ئیسلامیان لە خۆگرتبوو بۆ بنیادنانی دەزگا گەلێك لەم میرنیشینەدا کە وردە وردە لە ماوەی دوو سەدەدا پەرەی سەند کە ئیتر لەوێوە گە شەسەندنی عوسمانیەکان دەستی پێکرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە, محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص٣١.

(٢٣) محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص ٢٨.

(٢٤)ابری و برتولوشتولر، المصدر السابق، ص ٣٦٩.

(٢٥)ابری و برتولوشتولر، المصدر النفسة، ص ٣٧٠.

٢٦)د.عبدالعزيز محمد الشناوي، الدولة العثمانية دولة اسلامية مفترى عليها، جزء الثاني، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة،٢٠٠٤،ص ١٦٣.

(*) بەرای ئێمە کۆتای چاخی یانزەهەم مەبەستمان سەدەی حەڤدەی زاینی یە.

(٢٧)يلماز أوزتونا,تاريخ الدولة العثمانية،ت. عدنان محمود سليمان،ط.الاول، منشورات مؤسسة فيصل للتمويل تركيا، استانبول،١٩٩٠،ص ٤٢٠.

(٢٨)وديع ابوز يدون, تاريخ الامثراتورية العثمانية من تأسيس الى سقوط،ط١، لاهلية للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٣،ص ١١٥

(**) بەلقان: دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلاتی ئەوروپا کە وڵاتانی (مەقدۆنیا و یۆنان و بولگاریا و ئۆکرانیا و ڕۆمانیا و سربیا و مۆنتینگرۆ) هاو سنورە لەگەڵ تورکیا و پێگەی ستراتیژی لەسەر دەریای ناوەڕاستە.

(٢٩) كارل بروكلمان,المصدر السابق،ص ٤٦٩.

(٣٠) يلماز أوزتونا, المصدر السابق؛ ص ٤٢١.

(٣١) وديع ابو زيدون, المصدر السابق، ص١١٥.

(٣٢) يلماز أوزتونا, المصدر السابق، ص٤٢٢.

(٣٣) وديع ابو زيدون, المصدر السابق، ص١١٦.

(٣٤) محمد سهيل طقوش, المصدر السابق، ص١١٤.

(٣٥) د. ميمونة حمزة المنصور, تأريخ الدولة العثمانية، ط.الول، الدار العامد، عمان، ٢٠٠٨، ص ٧٠.

(٣٦) زين العابدين شمس الدين نجم,المصدر السابق،ص ٢٣٩.

(٣٧) وديع ابو زيدون, المصدر السابق،ص ١١٦.

(٣٨) د. ميمونة حمزة المنصور, المصدر السابق، ص٧١.

(٣٩) زين العابدين شمس الدين نجم,المصدر السابق،ص ٢٣١.

(٤٠) يلماز ئوزتونا، المصدر السابق؛ ص٤٢٤.

(٤١) د. محمد فريدبگ المحامي ،تاريخ الدولة العلية العثمانية، ط ، دار الجيل ، بيروت؛ ١٩٩٧؛ ص ١٢٣.

(٤٢) د. زين العابدين الشمس الدين نجم، المصدر السابق، ص ٢٢٥.

(٤٣) د. زين العابدين الشمس الدين نجم، المصدر السابق،ص ٢٢٦_٢٢٨.

(٤٤) د.محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص٦٧.

(٤٥) السير هاملتون جيب و هارولدبوين، المجتمع الاسلامى والغرب وأثر الحضارة الغربية في الفكر الاسلامى في الشرق الادنى، ترجمة: عبدالمجيد حسيب القيسي، ج١، دار الثقافة والنشر، سوريا،١٩٩٧، ص ١٠٧.

(٤٦) هاملتون جيب و هارولدبوين، المصدر السابق؛ ص ١١١_١١٣.

(٤٧) د.سونيا محمد سعيد البنا، فرقة الاءنكشارية، نشأتها و دورها في الدولة العثمانية، ط الاول،إيتراك الطباعة وانشر والتوزيع، قاهيرة،٢٠٠٦،ص ٩_١١.

(٤٨) د.محمد سهيل طقوش، المصدر السابق، ص ٣٣.

(٤٩) د.محمد سهيل طقوش، المصدر السابق: ص ٣٤_٣٥.

(٥٠) د.سونيا محمد سعيد البنا، المصدر السابق، ص ١٤.

(٥١)بيترشوجي .اوروبا العثمانية ،ت: عاصم الدسوقي.ط ١.الدار الثقافة العديدة، القاهيرة،ص ٧٣_٧٦.

(٥٢) بيتر شوجي:المصدر النفسة،ص ٧٦.

(٥٣) د.محمود محمد الحويرى ،تأريخ الدولة العثمانية في الحصور الوسط،الادارة مصطفى طحوم،المنيل _القاهيرة:٢٠٠٢،ص ٢٤٨.

(٥٤) د.جفرى برۆن ؛ پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ سەردەمی کۆن ،سەدەکانی ناوەراست،سەردەمی نوێ)،و:نیهاد جلال حبیب الله،چ١،ناوەندی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٩،لا٥٨٦

(٥٥)محمود الشاكر ، تأريخ الاسلامى العهد العثمانى،ط الرابع،مكتب الاسلامى،بيروت،٢٠٠٠،ص ١١٠.

(٥٦)د.حسن الظيقة،الدولة العثمانية الثقافة المجتمع والسلطة، دار النتخب العربي،بيروت،١٩٩٧،ص ٩٠_٩٦.

(٥٧) د.النوره دين حاطون، تأريخ عصر النهظة الاورثية، ط الاول، دار الفكر،ديمشق،ص ٣٤٧.

(٥٨)برنارد لويس، الستنبول وحضارة والخيلافة والاسلامية،ط ١، والنشر والتوزيع،الرياض،١٩٨٢،ص ٨٨_٨٩

(٥٩) شمس الدين الكيلانى،الاسلام وأوروبا المسحية(من القرن الحادى العشر الى نهاية القرن السادس عشر،ط الاول،وزارة الثقافة،دمشق،٢٠٠٧، ص ١٠٩_١١٠.

(٦٠)د.على محمد الصلابي،الدولة العثمانية عواميل النهوض وواسباب و السقوط،ط ١ دار ابن الكثير،دمشق، ٢٠٠٣ص ٥٥.

(٦١) د.سونيا محمد سعيد البنا، المصدر السابق،ص ١٤_١٥.

(٦٢) د.محمد كمال الدسوقى،المصدر السابق،ص ١٩.

(٦٣) محمود شاكر، المصدر السابق، ص ١١١.

(٦٤) هاملتون جيب و هارولد بوين ،المصدر السابق ، ص ١٠٦_١٠٨.

(٦٥) د.حسن الظيقه، المصدر السابق، ص ٩٩.

(٦٦)د.جفرى برۆن، سەرچاوەی پێشوو،لا ٥٨٦_٥٨٧.

(٦٧) د. سۆنيا محمد سعيد البنا، المصدر السابق، ص ٣٢٣.

(٦٨) لە ئینتەرنێت وەرگیراوە، (أسباب سقوط الدولة العثمانية،ص٧،
www.saaid.net\minute\mm٧٢

(٦٩) د. علی وەردی ، سەرچاوەی پێشوو،لا ١١٢-١١٣.

(٧٠) د. سۆنیا محمد سعید البنا،المصدر السابق،ص ٣٢٤_٣٢٥.

(٧١) برنارد لويس، المصدر السابق، ص ٩١.

(٧٢) د.حسن الظيقة: المصدر السابق، ص ١٠١.

(٧٣) د.محمد سهيل الطقوش، المصدر السابق، ص ٢٧٦.

(٧٤) د.إبراهيم خليل أحمد، المصدر السابق، ص ١٧٩.

(٧٥) د. مفيد الزيدى، تأريخ الاسلامى العصر العثمانى، ط ١، دارأسامة النشر، الارمن، ٢٠٠٣، ص ٢٤٥.

(٧٦) د.محمد فريدبگ المحامى، المصدر السابق، ص ١٨٠.

(٧٧) د. جميل بيصوت، المصدر السابق، ص ٦١.

(٧٨) روبيرمانتران ،تأريخ الدولة العثمانية، ت: بشير السبائى، جزء الثاني، دار الفكر الدراسات، قاهيرة، ١٩٩٢، ص ١٣.

(٧٩) روبير مانتران، المصدر السابق، ص ١٤.

(٨٠) د.مفيد الزيدي، المصدر السابق، ص ٢٤٦.

(٨١) د. علی وەردی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٧٩.

(٨٢) روبير مانتران، المصدر السابق، ص ١٤.

(٨٣) د.محمد سهيل طقوش ، پوختەی مێژووی ئسلامی،و: نهاد جلال حبيب الله ،چاپی یەکەم، ٢٠٠٩، ناوەندی رۆشنبیری، هەولێر، لا ٤٤٩.

(٨٤) عبدالمنعم الهاشمی، المصدر السابق، ص ٢٠٥_٢٠٦.

(٨٥) د.إبراهيم خليل أحمد ، المصدر السابق، ص ١٨٢_١٨٣.

(٨٦) د.حكيم أحمد مام بكر،م. عدنان أمين محمد، بزوتنەوەی چاکسازی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨٠٨_١٨٣٩)، گۆڤاری مێژوو، ژمارە ٢، چ منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، لا ٢١٢_٢١٥.

(٨٧) موسوعة، (التأريخ الاسلامي العصر العثماني)، ط الاول، دار اليوسف للطباعة والنش و التوزيع، بيروت، ٢٠٠٥،ص ٢٥٤_٢٥٥.

(٨٨) نترار قازان، أحداث والمشاهير عالمية سلاطين بنى عثمان بين قتال لاخوة و فتنة الانكشارية، دار الفكر البناني، بيروت،ص ٩_١٠.

(٨٩) د.حكيم أحمد مام بكر، م. عدنان أمين محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢١٥.

(٩٠) د.مفيد الزيدى ، المصدر السابق، ص ٢٤٩.

(٩١) د.حكيم أحمد مام بكر، م. عدنان أمين محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٢٣.

(٩٢) د. جميل الموسى النجار، الأدارة العثمانية في ولاية بغداد من عهد الولي مدحت پاشا إلى نهاية الحكم العثمانى (١٨٦٩_١٩١٧)، ط الاول، مكتبة المدبولي القاهرة، ١٩٩١، ص ٢٥_٢٦.

(٩٣) د.خسان حلاق، تأريخ الشعوب الأسلامية الحديث والمعاصر، ط.الأول، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت،٢٠٠٠، ص ٣٧_٣٩.

(٩٤) د.محمد صرب، سوڵتان عبدالحميدى دووەم، سوڵتانە گەورەکەی عوسمانی ؛ و.ئیبراهیم ئەحمد شوان، چاپی یەکەم، نوسینگەی تەفسیر، هەولێر،٢٠٠٤،لا ٦٤,

(٩٥) زين العابدين شمس الدين نجم، المصدر السابق، ص ٢٢٩_٢٣٠.

(٩٦) د.محمد حرب، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٥.

(٩٧) محمود شاكر، المصدر السابق، ص ١٦٨.

(٩٨) محمد فريد بك المعامبى، المصدر السابق، ص ٢١٩.

(٩٩) کۆمەڵە نوسەر، عوسمانیەکان لە عوسمانی کوڕی ئورتوغرل تا سوڵتان عبدالمەجیدی دووەم، و. سەلام عبدالكريم ، چاپی دووەم ، چاپەمەنی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨،لا ١٦٦.

(١٠٠) محمد فريد بك المحامبى، المصدر السابق، ص ٢٢٠.

(١٠١) السفير الفرنسى انكة الهارد، تأريخ الاصلاحات والتنظيمات في الدولة العثمانية، ط الاول، الدار الزمان للطباعة والنشر والتوزيع،دمشق، ٢٠٠٨،ص ٢٤_٢٥.

(١٠٢) د. على حسوان، الدولة العثمانية و علاقاتها الخارجية، ط ١ ، المكتب الاسلامى، دمشق، ١٩٨٠، ص ١٣٠.

(١٠٣) د.مفيد الزيدى، المصدر السابق، المصدر السابق، ص ٢٥١.

(١٠٤) د. ابراهيم خليل أحمد، المصدر السابق، ص١٨٦.

(١٠٥) محمود شاكر، المصدر السابق، ص ١١٥.

(١٠٦) د. ابراهيم خليل أحمد، المصدر السابق، ص١٨٧.

(١٠٧) محمود شاكر، المصدر السابق، ص ١١٥.

(١٠٨) المصدر نفسة، ص ١١٥.

(١٠٩) لە ئەنتەرنێت وەرگیراوە: www.nassem١٠.jeeran.com

سەرچاوە عەرەبیەكان.


١_ إبراهيم بك حليم، تـأريخ الدولـة العثمانيـة العليـة، طبـع الاول، مؤسسة المختـار للنـشر والتوزيـع، القاهرة، ٢٠٠٤.

٢_ د. إبراهيم خليل أحمد،تأريخ الوطن العربي في العهد العثمـانى١٥١٦_١٩١٦، طبـع بمطـابع جامعـة الموصل، ١٩٨٣.

٣_أنكة الهارد، تأريخ الاصلاحات و التنظيمات في الدولـة العثمانيـة، طبـع الاول، الـدار الزمـان للطباعـة والنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠٠٨.

٤_بترشوجر،أوروبا العثمانية، ترجمة، عاصم الدسوقي، طبع الاول،الدار الثقافة العديد،باب السوق، القاهرة.

٥_ برنارد لويس، استنبول وحضارة والخيلافة والاسلامية، طبع الاول، والنشر والتوزيع، الرياض، ١٩٨٢.

٦_ د.جميل الوسى النجار، الادارة العثمانية في ولاية بغداد مـن عهـد إلى مـدحت ثاشـا إلى نهايـة الحكـم العثماني (١٨٦٩_١٩١٧)، طبع الاول، مكتبة المدبولي، القاهرة،١٩٩١.

٧_ د.جميل بيصوت، تأريخ العرب العديث، طبع الاول،دائر الاومل الشرق التوزيع، ١٩٩٢.

٨_ د.حسان حـلاق، تـأريخ الـشعوب الاسـلامية العـديث، المعاصـير، طبـع الاول، دار النهظـة العربيـة للطباعة والنشر، بيروت،٢٠٠٠.

٩_ حسن الظيقة، الدولة العثمانية الثقافة المجتمع والسلطة، طبع الاول، دار المنتخب العربي، بيروت، ١٩٩٧.

١٠_روبير مانتران، تأريخ الدولة العثمانية، ترجمة، بشير الـسباني، جـزء الـثانى، دار الفكـر الدراسـات، القاهرة، ١٩٩٢.

١١_د.زين العابدين الشمس الدين نجم، تاريخ الدولة العثمانيـة، طبـع الاول، دار المـيرة للنـشر ةالتوزيـع والطباعة، عمان،٢٠١٠.

١٢_ د.سونيا محمد سعيد البنـا، فرقـة الانكـشارية ونـشأتها و دورهـا في الدولـة العثمانيـة، طبـع الاول، إيتراك الطبعة ونشر والتوزيع، القاهرة، ٢٠٠٦.

١٣_ شمس الدين لكيلاني، الاسلام واورثا المصية، من القرن العادي العشر الى نهاية القرن السادس عشر، طبع الاول، وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٧.

١٤_ د.عبدالعزيز محمد الشانوي، الدولة العثمانية الدولة إسلامية مفتري عليها، ج٢ ،مكتبة الانجلو المصرية، القاهيرة، ٢٠٠٤.

١٥_عبدالمنعم الهاشمى، تأريخ العرب عصر المماليك والعثمانية، طبع الاول، دار مكتبة الهلال بيروت،٢٠٠٦.

١٦_ د.على حسوان، الدولة العثمانية و علاقاتها، طبيعة الاولى، المكتب الاسلامي، دمشق، ١٩٨٠.

١٧_د.على محمد الصلابى، الدولة العثمانية عوامبل النهوض وأسباب والسقوط، طبع الاول، دار إبن الكثير، دمشق، ٢٠٠٣.

١٨_ كارل بروكلمان، تأريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة، نجيبة أمين فارس و بعلبكي،ط١، دار العلم الملاين، بيروت، ١٩٤٨.

١٩_ لامير شكيب ارسلان، تاريخ الدولة العثمانية، طبع الاولى، دار ابن كثير، دمشق، ٢٠٠١.

٢٠_ محمد سهيل طقوش، تاريخ العثمانين من قيام الدولة إلى الانقلاب على الخلافة، طبع الثاني، جميع العقوق معفوظة، بيروت، ٢٠٠٨.

٢١_ د.محمد فريدبك المعامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، طبع الاول،دار الجيل، بيروت،١٩٧٧.

٢٢_ د.محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، طبع الاول، دار الشقافة الطباعة والنشر، القاهيرة، ١٩٧٦.

٢٣_ محمود شاكير، تاريخ الاسلامي العهد العثماني، طبع الربع، المكتب الاسلامي، بيروت، ٢٠٠٠.

٢٤_د.محمود محمد العريري، تاريخ الدولة العثمانية في العصور الوسطى، الادارة ٥ش مصطفى طصوم المنيل، القاهيرة، ٢٠٠٢.

٢٥_ د.مفيد الزيدي، تاريخ الاسلامي العصر العثماني، دار اسامة النشر الارمن، ٢٠٠٣.

٢٦_ موسوعة تاريخ الاسلامي العصر العثماني، طبع الاول، دار اليوسف للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠٥.

٢٧_ د.ميمونة حمزة المنصور، تاريخ الدولة العثمانية، طبيعة الاولى، الدار العامد، عمان، ٢٠٠٨.

٢٨_ نزار قازان، احدث والمشاهير عالمية سلاطين بن عثمان بين قتال الاخوة و فتنة الانكشارية، دار الفكر البناني؛ بيروت، ١٩٩٢.

٢٩_ د. نوردين حاطوم، تاريخ علر النهظة الاورثية، جزء الربع، دار الفكر، دمش، بی ساله.

٣٠_وديع ابوزيدون، تاريخ الامبراتورية العثمانية من تاسيس الى السقوط، طبع الاول، الاهلية للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٣.

٣١_ هاملتون جيب و هارولد بوين، المجمتح الاسلامي والغرب وأثر الحضارة الغربية في الفكر إسلامي في الشرق الادني، جزء الاول، ترجمة، عبدالمجيد حسيب القيسي، دار المدي للثقافة والنشر، سوريا، ١٩٩٧.

٣٢_ يلماز اوزتونا؛ تاريخ الدولة العثمانية ، ترجمة، عدنان محمود سليمان، طبع الثاني، منشورات مؤسسة فيصل للتمويل تركيا، استانبول، ١٩٩٠.

* کوردیەکان.

٣٣_أحمد حمد ئەمین، چەند لاپەرێك لە مێژووی نوێی هاوچەرخی عێراق، چ١، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠.

٣٤_دجفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەوروپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ (سەردەمی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی نوێ)،و، نهاد جلال خبيب الله، چاپی یەکەم، ناوەندی رۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٩.

٣٥_د.علی وەردی، چەردەیەکی کۆمەلایەتیە لە مێژووی نوێی عێراق، و، دلێر میرزا، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، ٢٠٠٤.

٣٦_د. فەرهاد پیربال، سولتانە عوسمانیەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٧,

٣٧_ کۆمەلێ نوسەر، عوسمانیەکان لە عوسمانی کوڕی ئورتوغرل وە تا سولتان عبدالمجیدی دووەم، و، سلام عبدالكريم، چاپی دووەم، چاپەمەنی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٣٨_د.محمد سهيل طقوش، پوختەی مێژووی ئیسلام، و،نهاد جلال حبيب الله، چاپی یەکەم، ناوەندی رۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٩.

٣٩_د.محمد حرب، سولتان عبدالحمیدی دووەم سولتانە گەورەکەی عوسمانی، و، ئیبراهیم ئەحمد شوان، چاپی یەکەم، نوسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٤.

٤٠_ محمد رسول هاوار، کورد و باکوری کوردستان له سەرەتای مێژوو هەتا شەڕی دووەمی جیهانی، بەرگی یەکەم. چاپی دووەم، بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی وەرگێران. ٢٠٠٦.

* فارسیەکان.

٤١_أ.ج.ابری وبرتولو اشپولسر_أن.ل.س)؛ تاریخ اسلام، ترجمه، أحمد أرام، چاپ پنجم، أنتشارات امیرکبر، تهران، ١٣٨٥.

٤٢_ راس نی دان ودیگران، تاریخ تمدن وفرهنگ جهان ، ترجمه، عبدالحسین ازرنگ، جلد٣، سازمان چاپ وانتشارات وزارت فرهنگ وارشاد اسلامی، تهران، ١٣٨٢.

* گۆڤارەکان

٤٣_ د.حکیم أحمد مام بکر، م.عدنان أمین محمد، بزوتنەوەی چاکسازی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان محمودی دووەم (١٨٠٨_١٨٣٩)،گۆڤاری مێژوو،ژمارە (٢)،چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠٠٧.

٤٤_ د. محمد عبدالله کاکە سور، دەوڵەتی عوسمانی دامەزراندن و فراوانبوونی،گۆڤاری مێژوو،ژمارە(١)، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.

* سایتە ئەلکترۆنیەکان

٤٥_www.Saaid.net\minute\mm٧٢-htu.

٤٦-www. Zhyan.net\vb\index.php.

٤٧.haseem١٠ jeran.com

# کورتیەکا مێژوویی ل سەر مالباتا بەدرخانیان

بێوار ئدریس دەحلێنەوی

پشتی ئیسلامێ سەرهلدای، میر عەبدولعەزیز کورێ سلێمان پادشاتیا کوردا ل جزیرا ئیبن عومەر دانا[1]، ل سالا (٥٥٦ك ـ ١١٦١) سەربەخوییا خو راگەهاند، مالباتاوی ب (ئەزیزان) هاتە نیاسین، ئەڤ ناسناڤە بو ناڤێ وی دزڤریتە ڤە[2].

لێ کامیران بەدرخان[3]کو نەڤیێ میر بەدرخانی یە، نەژادێ مالباتا خوە گەهاندیە گوندێ ئارزیزان (Arzizan) کو گوندەکە ل نێزیك جزیرێ یە، وناڤێ مالباتێ ژ ناڤێ ڤێ گوندی هاتیە وەرگرتن[4].

گەلەك مالباتێن ئیسلامێ یێن رەسەن نەژادێ مالباتا ئەزیزان گەهاندیە سەرکردێن قوناغا ئێکێ ژ دیروکا ئیسلامێ[5]. چیڤا نوکەك هەیە:(نەژادێ وان گەهاندیە پێغەمبەری (س.خ) کو زاروکەك ژ رویدانا کەربەلا قورتال بوی وخوەگەهاندیە چیایێن کوردستانێ ومالباتەك لدیف کەفتیە)[6].

شەرەف خانێ بەدلیسی نەژادێ مالباتا جزیرێ دگەهینیتە سەحابی خالدێ کورێ وەلید[7]. هندەك دگەهیننە سەلاحەدینێ ئەیوبی (٥٣٢ك ـ ٥٨٩ك)[8]. هزرەکا دی هەیە (نەژادێ مالباتا میرێن بوتان دگەهیننە عەبدولعەزیز کورێ خەلیفە عومەر کو دبێژن ئەوی بازێرێ جزیرێ ئاڤاکریە، وناڤێ بابێ خو ئیبن عومەر دانایە سەر ڤی بازێری)[9].

گەلەك ژ مالباتێن كورد نەژادێ خو گەهاندیە هەڤدوستێن پێغەمبەری (س.خ) یان سەركردێن بناڤ ودەنگ د دیرۆكا ئیسلامێدا، ژ بەركوكوردا باوەریەكا موكم ب ئولێ ئیسلامێ هەبوو، مەرەما وان مالباتاژی ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو كو میللەتێ وان باوەری پێ هەبیت ولدیف یاساییێن وان كار بكەن[10]. هەتا هندەك جاران باوەریا هندەك كەسان دناڤ میللەتی دا دگەهشتەوی رادەی كو هەر كەسەكێ ژ بریار وئارستەیێن وان مالباتان بدەركەڤیت دێ بئاگرێ دوزەخێ هێتە سوتن. ل دیف هندەك ژێدەرا دیار دبیت كو:"باپیرێ ڤێ مالباتێ، كوییێ بمالباتا خو بەرنیاسە ب باپیرێ حەفتێ ڤە دگەهیتە خان بەدلیس (شەرەفخانێ ئێكێ) دانەرێ پەرتوكا مێژوویێ (شرفنامە)"[11].

د سەدێ شازدێ و هەژدێ دا پێزانین ل سەر مالباتا ئەزیزان دكێمن، دسەدێ نوزدێدا دەمێ كو میر بەدرخان دەست هەلاتداریا مێرنشینێ وەرگرتی، ڤەكولەرا سەر ژ نوی بەحسێ ئەڤێ مالباتێ یێ كری[12].

میر بەدرخان میرێ مێرنشینا جزیرا بوتان یێ دوماهیێ یە[13]، پاشان مالباتا ئەزیزان بمالباتا بەدرخانیان دهێتە نیاسین، ناڤێ مالباتا بەدرخانیان ژ ناڤێ بەدرخان هاتیە[14]. میر بەدرخان كورێ عەبدوللا خان (عبدالخان) ێ كورێ میر مستەفا خانێ كورێ ئیسماعیل خانێ كورێ مەنسور خانێ كورێ میر شەرەفخانێ دووێ كورێ میر محەمەد خانێ كورێ میر شەرەفخانێ ئێكێ یە[15].

مالباتا بەدرخانیان خەلكێ رۆژئاڤایا كوردستانێنە، ل نیڤا دووێ ژ چەرخێ نوزدێ ـ كو دەسپێكا بزاڤا چەكداریا بەدرخان بوو ـ ئەڤ مالباتە دبزاڤا سیاسیا كوردیدا دیار بوون[16].

میر بەدرخان ل بازێرێ جزیرا بوتان (مەلبەندێ میرگەهێ) ل سالا ١٨٠٣ یێ ژ دایك بووی[17]، ل سالا ١٨٢١ ێ دژیێ هەژدەسالییێدا وهێش گەنج دبیتە میرێ

مێرنشینا جزیرا بوتان[١٨]. میر بەدرخان میرێ کوردستانێ، بەشێ وەلاتێ کوردنشینا ئوسمانیان بوو[١٩]، دڤیا حکومەتەکا کوردی یا مەزنا سەربەخو بدامەزرینیت[٢٠].

ژ گرنگترین کارێن میر بەدرخان یێ ب دانانا ئێککگرتنا پیرۆز رابووی[٢١]، و لێدانا پارەی بناڤێ خو[٢٢]، وبزاڤ کر ژ بو دانانا پێشەسازیێن جەنگی (الحربیە) یێن تایبەت وهنارتنا هندەك ژ جەحێلا ژ بوێ خواندنا زانستی ل ئەوروپا[٢٣]، وئەرمەن وئاشوری گێشانە لایێ خو ڤە دژی عوسمانیا[٢٤].

ل سالا ١٨٤٧ فەرمانا ژناڤبرنا میر بەدرخان ژلایێ دەست هەلاتداریا عوسمانی ڤە هاتە دان[٢٥]، ل حوزەیرانا سالا ناڤبری هەوا عوسمانیا دەست پێکر، ل مەها تەموزێ میر بەدرخان بنەچاریڤە خودا دەستێ عوسمانیان[٢٦]، پشتی ل سێ جها هاتیە ڤەگوهاستن ل سالا ١٨٦٨ ل وەلاتێ شام وەغەرا دوماهیێ کر[٢٧].

هەژی یە بێژین کو گەلەك ژ ڤەکولەر ومێژوونڤیسا پەنابریە بەر هندێ کو ئێزدین شێر خیانەت ل میر بەدرخان کریە وەکو: بلەج شێرکوە[٢٨]، محەمەد ئەمین زەکی[٢٩]، عەلائەدین سوجادی[٣٠]، کو ئێکەم مێژونڤیسێن کوردن مێژوویا کوردی نڤیسی ونڤیسینێن وا بوینە سەرچاوەیێن ژێدەرێن دی. لوتفی (**لطفی**)[٣١] ل سەر میر بەدرخان وبزاڤا وی یارامیاری وئەگەرێن ژناڤچوونا مێرنشیناوی ئاخفتیە، لێ ئاماژە ب چ خیانەتا نەکریە کو ژ لایێ ئێزدین شێر ڤە هاتبیتە کرن.

هەروەسا دوو بابەت دروێژ ناما کوردستاندا[٣٢] ل ژێر ناڤ ونیشانی (بدرخان بەگ) هاتینە بەلاڤکرن، دهەژمارێن (١٣ - ١٤) دا هاتیە کو چەوا مێرنشینا بوتان ژ ناڤچویە وئەگەرێن ژ ناڤچوونا وێ دیار کرینە، بەلێ ڤان هەردوو بابەتان ژی ئاماژە ب خیانەتا (ئێزدین شێر) نەکریە.

دیسان (سەلاح هروری) ژی ئەگەرێ ژناڤچوونا میرنشینا بوتان بوٚ وێ هێزا دەولەتا عوسمانی فرێکریە سەر میرگەهێ دزڤرینیتە ڤە نەك خیانەتا ئێزدین شێری[٣٣]. ئەڤە وێ چەندێ دگەهینیت کو ئەو ژێدەرێن بەحسێ خیانەتا ئێزدین شێر کری دجهێ گومانێدانە.

پشتی وەغەرکرنا میر بەدرخان، خەباتا ڤێ مالباتێ نەهاتە راوەستاندن، بەلکو گەلەك ژ ئەندامێن مالباتا بەدرخانیان روٚلەکێ بەرچاڤ وکاریگەر هەبوو درێیا بزاڤا رزگاری خوازا نەتەوەیا کورد دا.

پێشەنگێن سەرهەلدانا[٣٤] سالا ١٨٧٧ ـ ١٨٧٩حسێن کەنعان وعوسمان پاشا[٣٥] بوون. هەر ژ بەریەرێن خەباتا ڤێ مالباتێ، هەردووبرا ئەمین عالی بەدرخان[٣٦] ومقداد مەدحەت بەدرخان شیان ل سالا ١٨٨٩بسەرهەلدانەکێ[٣٧] رابن ل نێزیکی ترابزون بەلێ سەرنەگرت. ژگرنگترین کارێن ئەڤ مالباتە پێ رابووی روٚژناما کوردستان بوو[٣٨]، کو ژلایێ مقداد مەدحەت بەدرخان[٣٩] ڤە هاتبوو دەرئێخستن د سالا ١٨٩٨ل قاهیرە. عەبدولرەحمان پاشا[٤٠] ناڤەکێ دییە ژ خەباتکەرێن مالباتا بەدرخانیان، پشتی برایێ خو (مقداد) شیایە هژمارا شەشێ ژ روٚژناما کوردستان وەلبگریت ول جنێف (سویسرا) دەرئێخست، هەتا هژمارا سیە وئێکێ کو دهێتە هژمارتن دوماهیك هژمار.

سورەییا بەدرخان (١٨٨٣ ـ ١٩٣٨)[٤١] سەرنڤیسەر وخودانێ روٚژناما کوردستان بوو گەرا دوویێ و سێ یێ، پشتی کو هاتیە راوەستاندن دسالێن ١٩١٧ ـ ١٩١٨دانویکرەڤە[٤٢]. دیسان پەرتوکەکا گران بها دانابوو بناڤێ (کێشا کوردی) کو بزمانێ فرەنسی بەلاڤکریە[٤٣]. پشان (محەمەد عەلی عونی) ئەڤ پەرتوکە ل قاهیرە ل سالا ١٩٣٠کرە عەرەبی وچابکر وبەلاڤکر[٤٤].

عەبدولرەزاق بەدرخان[٤٥] ژی ئێک ژناڤدارێن مالباتا بەدرخانیان بوو، بزاڤاوی دناڤبەرا سالێن ١٩١٠ ـ ١٩١٤دەست پێکریە، کو دژی دەست هەلاتداریا ئیتحادیا راوەستیا بوو[٤٦]، ل سالا ١٩١١گەشتەك بۆ دەڤەرێن کوردنشین ل تورکیا وئیرانێ کر، داکو کوردان کومڤەکەت ودەولەتەکا کوردی بدامەزرینیت[٤٧]، ل سالا ١٩١٢کومەلا جیهاندینی ل بازێری خوییێ (ئیران) دامەزراند[٤٨]، شیا پەیوەندیێن خو دگەل چەند سەرکردەکێن کورد ودەلەتێن دەوروبەر گرێبدەت[٤٩].

هەر ژ خەباتکەرێن مالباتا بەدرخانیان جەلادەت بەدرخان[٥٠]، کو ژیانا خو تەرخانکربوو بۆ رێکا ئازادی خوازا کوردی، ژ گرنگترین کارێن پێ رابووی، دەمێ کومەلا خویبون ل تەشرینا ئێکێ سالا ١٩٢٧هاتیە دامەزراندن سەرکردێ کومەلا ناڤبری بوو[٥١]. دناڤبەرا سالێن (١٩٣٢ ـ ١٩٤٣) گوڤارا هاوار[٥٢]، وسالێن (١٩٤٢ ـ ١٩٤٥) گوڤارا رۆناهی دەرئێخستن[٥٣]. دیسان کامیران بەدرخان خەباتەکا بەرچاڤ بۆ دوزا میللەتێ کورد کریە، نەخاسمە خەباتا رەوشەنبیری برێکا دەرئێخستنا دوو رۆژناما ئەوژی (رۆژا نوو ١٩٤٣ ـ ١٩٤٦) و (ستێر ١٩٤٣ ـ ١٩٤٥) ل بەیروتێ[٥٤]، زێدەبارەی ڤان ئەنداما بدەهان ئەندامێن دی یێن خەباتکەر دناڤ مالباتا بەدرخانیا دەرکەفتینە[٥٥].

(١). Celîle Celîl, AUTOBîYO GRAFîYA EBDURRIZAQ BEDIRXAN, Dhok, ١٩٩٩, L ١٣.

(٢). عبدالفتاح علي يحي، بوتان والبوتانيون والاغينة الكردية التاريخية، ق١ ، مجلة كاروان، عدد (٢٨)، اربيل، كانون الثاني، ١٩٨٥، ص ١٥٧.

(٣). بوژيانا كاميران بەدرخان بنێرە: .

(٤).صلاح محمد سليم هروري، امارة بوتان في عهد الامير بدرخان ١٨٢١ ـ ١٨٤٧ دراسة تاريخية سياسية، دهوك، ٢٠٠٠، ص ١٨" ازاد ديركي، المدن الكردية، بيروت، ١٩٩٨، ص ١٦.

(٥). B.Selah Hirorî, Ezîzan yan mîrên Botan?!, wergêran ji Ingilîzî: Prof.D.M.H.warhêl, Govara Dicle, hijmar (١٤), Duhok, Gulan, ١٩٩٩, L ٥٢.

(٦). هاتيە وەرگرتن ژ: jederê navbirî, L ٥٢.

(٧). بنێرە، شرف خان البدليسي، شرفنامە، ترجمە: محمد جميل الملا احمد الروژبيـاني، گ٢، اربيل، ٢٠٠١، ص ٢٦٩.

(٨). ماليمساند، بدرخانيو جزيرة بوتان ومحاضر اجتماعات الجمعية العائلية البدرخانية، ترجمة: شكور مصطفى، اربيل، ١٩٩٨، ص ٣٨.

(٩). هاتيە وەرگرتن ژ: selah hirorî, Ezîzaan yan..., L ٥٢.

(١٠). بو پتر پێزانين ل سەر ڤى بابەتي. بنێرە: صلاح هروري، اماره بوتان...، ص ١٧ ـ ١٩.

(١١). هاتيە وەرگرتن ژ: ماليمسانژ، المصدر السابق، ص ٣٨.

(١٢). جليلي جليل، من تاريخ الامارات...، ص ٧٤.

(١٣). Celîle Celîl, AUTOBîYO GRAFîYA..., L ١١.

(١٤). صلاح محمد سليم هروری، الاسرة البدرخانية نشاطها السياسي والثقافي خلال المدة ١٩٠٠م ـ ١٩٥٠م دراسة تاريخية، دهوك، ٢٠٠٤، ص ١٣.

(١٥). لطفي، الامير بدرخان، ترجمة: علي سيدو طوراني، مراجعة: روشن بـدرخان، اعـداد ونـشر: دلاور زنكـي، بـيروت، ١٩٩٢، ص ١٠" ماليمـساند، البـدرخانيون في جزيـرة بوطـان (وثـائق جمعية اتحاد العائلة البدرخانية)، ترجمة: طولبهار بدرخان ودلاور الزنطي، مراجعة وتقـديم: نذير جزماتي، بيروت، ١٩٩٨، ص ٦٨.

(١٦). عزيز الحاج، القضية الكوردية في العشرينات، ط٢، بغداد، ١٩٨٥، ص ٢٠.

[17]. صلاح هروري، امارة بوتان...، ص ٤٨.

[18]. بلةج شيركوة، القضية الكردية ماضي الكرد وحاضرهم (جمعية خويبون الكردية الوطنية)، النشرة الخامسة، مصر، ١٩٣٠، ص ٤٠ “Konê Reş. Celadet Bedirxan – jiyan û ramanên wi-, Stockholm. ١٩٩٧. L ٧.

[19]. كريس كوچيرا، مێژووی كورد لە سەدەی ١٩ ـ ٢٠ دا، وەرگێران: محمد ربانی، تاران، ١٣٦٩ش، ل ٤٣.

[20]. محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان في الدور الاسلامي، ترجمة: كريمته، بغداد، ١٩٤٥، ج١، ص ١٣٦ ـ ١٣٧.

[21]. دەربارەی ئێککرتنا پیروز بنێرە: بلەج شیرکوە، المصدر السابق، ص ٤١ وما بعدها.

[22]. علاو الدين سجادی، شۆرشەکانی کورد وە کورد وکۆماری عیراقی، بەغدا، ١٩٥٩، ل ٤٥.

[23]. جلال الطالباني، كوردستان والحركة القومية الكردية، ط ٢، بيروت، ١٩٧١، ص ٨٥.

[24]. جليلی جليل، م.س.لازاريف وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د.عبدي حاجی، بيروت، ١٩٩٢، ص ١٩.

[25]. بو پتر بێزانین دەربارەی ڤی فەرمانێ وهەوا عوسمانیان بنێرە:عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣ ـ ١٩٤٦ دراسة تأريخية وثائقية، اربيل، ٢٠٠٣م، ص ٤٦ ـ ٤٧.

[26]. جليلي جليل، الحركة الكردية...، ص ٢٠ ـ ٢١.

[27]. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتوریەتی عوسمانی، وەرگێر: د.کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧، ل ٢٤٦ ـ ٢٤٧.

[28]. بنێرە: پەرتوکا وی، المصدر السابق، ص ٤٥.

[29]. بنێرە پەرتوکا وی: خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التأريخية حتى الان، ترجمة: محمد علي عوني، ط ٢، بغداد، ١٩٦١، ج ١، ص ٢٤١.

[30]. بنێرە: پەرتوکا وی، ژێدەرێ بەرێ، ل ٤٦ ـ ٤٧.

[31]. بنێرە: پەرتوکا وی، المصدر السابق، ص ١٥ ومابعدها.

[22]. کوردستان یەکەمین رۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢، کۆکردنەوە وپێشەکی: کەمال فوئاد، بەغدا، ١٩٧٢.

[23]. بو پتر رونکرن بنێرە: سەلاح هرووری، بەرپەرەکێ فەشارتی ژ پەیوەندیا دناڤبەرا میر بەدرخان وئێزدین شێری دا، گوڤارا مەتین، ژمارە (٩٧)، دهوك، شوات، ٢٠٠٠، ل ٣ وپشتی وێ.

[24]. بو پتر پێزانین ل سەر ڤێ سەرهلدانێ بنێرە: جلیلی جلیل، انتفاجە الاکراد عام ١٨٨٠، ترجمە: سیامند سیرتی، بیروت، ١٩٧٩، ص ٤٦ ـ ٤٨" ن.أ. خالفین، الصراع علی کردستان، ترجمە: د.احمد عپمان ابوبکر، بغداد، ١٩٦٩، ص ١١٧ ـ ١١٩.

[25]. دەربارەی ژیانا (حسین، عوسمان) بنێرە: مالمیساند، بدرخانیو جزیرة...، ص ١٣٠ ومابعدها.

[26]. ئەمین عالی بەدرخان کورێ میر بەدرخانێ مەزنە، ل سالا ١٨٥١ یێ ژ دایك بووی، خواندنا حقوقێ ل قوتابخانا (السلطانیة) تەما کریە، ئێك ژ دامەزنێنەرێن کومەلا تەعالی کوردستان بوو ئەوا ل سالا ١٩٠٨ هاتیە دامەزراندن. بو پتر زانین ل سەر ژیانا وی بنێرە: مالمیسانژ، بدرخانیو جزیرە...، ص ١٠٨ ومابعدها".Konê Reş, jêderê berê. L ١١ – ١٥.

[27]. بو پتر پێزانین ل سەر ڤێ سەرهەلدانێ بنێرە: بلەج شیرکوە، المصدر السابق، ص ٤٨ ـ ٤٩" محمد امین زکی، خلاصە تاریخ...، ص ٢٤٠.

[28]. رۆژناما کوردستان ل ٢٢ ی نیسانا سالا ١٨٩٨ ل بازێرێ قاهیرە ژلایێ مقداد مەدحت ڤە هاتیە دەرئێخستن (یەکەم ژمارە)، دهێتە نیاسین یەکەم رۆژناما کوردی، هەر ژ دەرکەفتنا وێ رۆژنامەگەری دمێژوویا نەتەوەییا کوردیدا پەیدابوو. بو پتر پێزانین ل سەر رۆژناما کوردستان بنێرە: کوردستان یەکەمین...، بەغدا، ١٩٧٢.

[29]. مقداد مەدحت کورێ میر بەدرخانێ مەزنە، ژ دایك بونا وی چ ژێدەران بەحسی لێ نەکریە، بتنێ دبێژن ل سالا ١٨٩١ یێ چویە میسر ژ بو جارەیا نەخوشیا سلێ، ل سالا ١٨٩٨ پێنج ژمارێن رۆژناما کوردستان یێن دەرئێخستین، ل سالا ١٨٩٩ دگەل برایێ خو ئەمین عالی بەدرخان بسەرهەلدانەکێ رابووین. بو پتر زانین ل سەر ژیانا وی بنێرە: کوردستان یەکەمین...، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١٢ ـ ١٤.

[40]. عەبدولرەحمان برایێ مقداد بوو کورێ میر بەدخانێ مەزن، ل سەردەمێ زاروکینیا وی ئەهاتیە زانین، ل سالا ۱۸۹۰ جێگرێ سەروکێ ئیدارێ بوو ل ئەستەنبول، قوناغا دووێ ژ رۆژناما کوردستان تەمام کریە، دسالێن ۱۸۹۸ ـ ۱۸۹۹ دگەل گروپێ ئیتحاد وتەرەقی بوو. بو پتر پێزانین ل سەر ژیانا وی بنێرە: مالمیسانژ، رۆژنامەنووس وسیاسەتمەداری گەورەی کورد عەبدولرەحمان بەدرخان، وەرگێر: ئارام قەلا دزەیی، گوڤارا رامان، ژمارە (۱۷)، هەولێر، تشرینی دووەم، ۱۹۹۷، ل ۱۳۱ ـ ۱۳٤.

[41]. میر سورەییا کورێ ئەمین عالی بەدرخان پاشای بوو، سالا ۱۸۸۳ ل ئەستەنبولێ یێ ژ دایك بوی، ئەخریێ بابێ خو بوو ژبلی کچا، دەسپێکا ژیانا وی بخوشی بوو تاکو گەهشتی یە دەست پێکا کارێ سیاسی ورەوشەنبیری. بو پتر پێزانین ل سەر ژیانا وبەرهەمێن وی بنێرە: مالمیسانژ، بدرخانیو جزیرە...، ص ۸۲ وما بعدها.

[42]. کوردستان یەکەمین رۆژنامەی کوردی دەورەی سێ یەم ۱۹۱۷ ـ ۱۹۱۸، کۆنکردنەوە وپێشەکی: دوکتۆر کەمال فوئاد، سلیمانی، ۱۹۹۸.

[43]. نافێ وی یێ دروست ئەڤەیە: Dr.Bletch Chivguh:LaQuestion Kurde. Le caire: ۱۹۳۰.

[44]. کوردستان یەکەمین...، سلێمانی، ۲۰۰۰، ل ۲۸ ـ ۳۱.

[45]. عەبدولرەزاق بەدرخان کورێ نەجیب پاشایێ کورێ میر بەدرخانیە، ل سالا ۱۸٦٤ ل باژێرێ ئەستەنبولێ ژدایك بوویە، ل دەسپێکێ خواندنا رۆژهەلات وئەورووپی خواندیە. بو پتر زانین ل سەر ژیانا وی وبزاڤا وی بنێرە: کونێ رەش، عبدالرزاق بدرخان ۱۸٦٤ ـ ۱۹۱۸، مجلە متین، عدد (٤۹)، دهوك، شباگ، ۱۹۹٦، ص ۹۹ ـ ۱۰۷.

[46]. عیمان علی، المصدر السابق، ص ۲٤۷.

[47]. م.س.لازاریف، کێشەی کورد ۱۸۹٦ ـ ۱۹۱۷، وەرگێر: د.کاوس قەفتان، بەغدا، ۱۹۸۹، بەشی یەکەم، ل ۲٥٤.

[48]. د.کمال مظهر احمد، کردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی، ترجمە: محمد الملا الکریم، بغداد، ۱۹۷۷، ص ۱۰۲.

[49]. دەربارەی پەیوەندیا بنێرە: د. صلاح هروری، الاسرة البدرخانیة...، ص ۵۹ ـ ۷۱.

- . جەلادەت کورێ ئەمین عالی بەدرخان بەگە، د سالا ١٨٩٣ ل باژارێ ئەستەمبولێ ژدایك بویە، خوەندنا خویا سەرەتایی وناوەندی هەر ل ئەستەنبولێ بداوی ئانیە، پشکداری د خویبونێدا وشورەشا ١٩٢٥ وشورەشا ئاگری داغ دا کریە. بو پتر پێزانین ل سەر ژیان وبەرهەمێن وی بنێرە:صادق بهاو الدین ئامێدی، جەلادەت بەدرخان، گوڤاری کوری زانیاری عێراق، بەرگی حەوتەم، ١٩٨٠، ل ٢٥٥ ـ ٢٨٦" Konê Reş, Celadet .Bedirxan...

(٥١). دیڤید مکدول، تاریخ الاکراد الحدیث، ترجمة: راج ال محمد، بیروت، ٢٠٠٤، ص ٣١٨" روهات الاکوم، خویبون وثورة اطری، الترجمة باشراف رابطة کاوا للثقافة الکردیة، هەولێر، ٢٠٠٠، ص ١٣.

(٥٢). د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلێ کورد، هەولێر، ٢٠٠١، بەرگی دووەم، ل ٢٤٥"

Ebdulsemed Islam Teha, Hawar û Pênasek, Govara Dicle, hijmar (٢٨), Duhok, Tirmeh. ٢٠٠٠, L ٣٨.

(٥٣). وریا جاف، کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٤٩" صلاح هروری، الاسره البدرخانیه...، ص ١٥٣.

(٥٤). علاو الدین سجادی، مێژوی ئەدەبی کوردی (مێژوو، ئەدەب، زانیاری)، بەغدا، ١٩٥٢، ل ٥٥٧" جمال خزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٤٥ ـ ٤٦.

(٥٥). بو پتر پێزانین ل سەر مالباتا بەدرخانیان بنێرە: مالمیساند، البدرخانیو جزیرة..." صلاح هروری، الاسرة البدرخانیة....

# سەرەتاکانی شەڕی سارد

فهمی جلال کریم (گوردە)

## باسی یەکەم

### لەدایك بوون و پێگەیشتنی هاری ترومان:

هاری ترومان لە ساڵی ١٨٨٤ لە ویلایەتی میسۆری لەدایك بووە(١)، باوکی ناوی(جۆن ئەندرسۆن ترومان)ە، دایکیشی ناوی(ماریا ئیلین)ە، ئەم خانەوادەیە چەندین جار شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیان گواستۆتەوە، یەکەم جار لە ساڵی ١٨٨٧ چوونە کێڵگەیەك لە نزیك گراند ڤیۆد، لەدواییدا چوونە شاری کەنساس، لە ساڵی ١٩٠٢ لە ئیند پێسندس هاری ترومان چووە قوتابخانە بەڵام قوتابخانەی تەواو نەکرد بۆ ماوەیەکی کەم وەکو چاودێر کاری دەکرد لە دروستکردنی هێلی ئاسنین، دواتر وەکو نووسەر کاری کرد لە دوو بانکی شاری کەنساس. لە ساڵی ١٩٠٦ هاری ترومان گەڕایەوە گراند ڤیۆ بۆ یارمەتی دانی باوکی لە کاروباری کێڵگەکەی و لەو کارەی بەردەوام بوو بۆ ماوەی(١٠) ساڵ(٢). لە تەمەنی گەنجیدا لە چەندین بوار کاری کردووە وەك کشتوکاڵ و فەرمانبەر لە بانك و خزمەتی سەربازی(٣). لە ویلایەتی میسۆری خەریك بووە بە چەند کارێك جگە لە فەرمانبەری بانك و جوتیاری، ئەفسەری تۆپخانە بووە لە جەنگی یەکەمی جیهانی، دوای ئەوەی مایەپووچ بوو هێشتا هەر خاوەنی دوکانێکی بچووکی دەرمان بوو. دواتر چووە دەستەی سیاسی(نیدر غاست) لە شاری کەنساس

وەكو پاڵێوراوێكی سەركەوتوو دوای پشتگیری كردنی لەلایەن ئەو دەزگایە بۆ هەڵبژاردنی دادوەری ناوچەكە وە پشتگیری كردنی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریكا، وە لێرەوە دەركەوت وەكو سەرۆكی لیژنەی ڕێكەوتنەكانی شەڕ كە ئەو لیژنەیە پارەیەكی زۆری گەڕاندەوە بۆ حكومەت. لە ١٩١٩/٦/٢٨ ترومان(بێس والاس)ی خواست كە هەر لە تەمەنی منداڵیەوە دەیناسی و منداڵەكەیان(ماری مارگرێت) و خێزانەكەی لە ١٩٨٢/١٠/١٨ كۆچی دوایی كرد(٤).

ڕۆڵ و چالاكیە سیاسی و كارگێڕیەكانی هاری ترومان:

ترومان لەساڵی ١٩٢٢ وەكو دادوەری دادگا لە ناوچەی جەكسۆن دەستبەكاربوو كە بە پیشەیەكی ئیدار دادەنرێت، هەروەها لە ساڵی ١٩٢٤ بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی پیران، لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی ئەركی سەرۆكایەتی كردنی كۆمیتەی لێكۆڵینەوەی جەنگ لەم ئەنجوومەنەدا پێی سپێردرابوو بۆ تاوتوێ كردن و ڕێگەگرتن لە زیادە خەرجی و گەندەڵی(٥). لە ساڵی ١٩٤٤ ڕۆزڤلت كردی بە جێگری خۆی لە ماوەی سەرۆكایەتی ئەمەریكادا، پاش مردنی ڕۆزڤلت لە ساڵی ١٩٤٥ لە جێگەی ئەو بوو بە سەرۆك كۆمار(٦). ماوەی سەرۆكایەتی ترومان لە ئەمریكا بە بەهێزی سیاسەتی دەرەوە ناسراوە، تا ڕادەیەكیش مەركەزیەتی پێوە دیاربوو، وە هەموو شتێك كە ترومان ئەنجامی دەدا لە سیاسەتی دەرەوە پەیڕەوی لێ دەكرد بریتی بوو لەوەی كە ڕێ بگرێ لە فراوانخوازی و كاریگەری و هەژموونی یەكێتی سۆڤیەت، ڕێبازی ترومان دەربڕینێك بوو لەو ئارەزووەی كە ئەمەریكا یارمەتی سەربازی پێشكەش بەو وڵاتانە بكات كە بەرەنگاری كۆمۆنیزم دەبوونەوە(٧). كاتێك كە ترومان دەسەڵاتی وەرگرت بارودۆخی نێودەوڵەتی شلەژابوو، كە پێویست بوو لەسەری بڕیارێكی

یەکلاکەرەوە بدات بە کۆتایی هێنان بە جەنگی دووەمی جیهانی و بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی لەکاتێکدا ئەگەر یابان خۆی بەدەستەوە نەدا[٨]، وە فەرمانی دا بە هاویشتنی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی کە دانوستانی لەسەر خۆبەدەستەوەدان دەکرد، ئەوەبوو کارەساتی هێرۆشیمای لێکەوتەوە[٩]. ترومان پیاوێکی بەهێز و توانا بووکە هەندێك لە چاودێران رایان وایە کە بۆ سەرکردایەتی ولاتیش کەمترە بەلکو بۆ سەرکردایەتی کردنی نێودەولەتی[١٠].

ترومان لە زۆر لە سەرۆکەکانی تر هۆشیارتر بوو و خاوەنی زانیاری بوو و شارەزای مێژووی ئەمەریکا بوو[١١]، پلانەکانی لە سیاسەتی نێودەولەتیدا بە تەواوی لەبەرچاو روون نەبوو، جگە لە دەرکەوتنی یەکێتی سۆڤیەت و ئارەزووەکانی لە دەست بەسەرداگرتنی ئەوروپا رۆلی هەبێت لە بەرێوەبردنی جیهانیدا، بیرکردنەوەی ترومان بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوە و ئاراستەکردنی سیاسەتی دەرەکی ئەمەریکا بە تایبەتی لە سەرەتای جەنگی سارد جیاوازی ئامانجی هەردوو زلهێزەکە[١٢].

ئەوەی سیاسەتی ترومانی لە سەرۆکەکانی پێشووتری ئەمەریکا جیادەکردەوە دوورکەوتنەوەی راشکاوانە و ئاشکرای ئەمرێکا بوو لە سیاسەتی دەست نەخستنە کێشە نێودەولەتیەکانەوە کە سەرۆکەکانی پێشووی ئەمریکا هەولیان دەدا سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای پێ سواق بدەن، تا ئەندازەیەکی زۆریش توانیان بروا بە کۆمەلگای نێودەولەتی بهێنن کە پابەندن بەم پرەنسیپەوە لە سەردەمیدا دەست تێوەردانی ئەمریکا لە کاروباری ناوچەیی وەك بەشێك لەو ئامانجە فراوانەی بەرەنگاربوونەوەی فراوانخوازی(توسع)ی یەکێتی سۆڤیەت دەستی پێکرد[١٣].

لەئاداری ساڵی ١٩٤٧ پرۆژەی ترومان کە کۆنگرێسی ئەمریکی ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیبوو بریتی بوو لە یارمەتیدانی ئابووری و سەربازی بۆ ئەو وڵاتانەی کە هەڕەشە و مەترسی سۆڤیەتیان لەسەر بوو بەتایبەت یۆنان و تورکیا، دوای ماوەیەکیش ڕاگەیاندنی پرۆژەی مارشاڵ[١٤]. ترومان لە سیاسەتی ناوخۆدا هەوڵی دەدا بە گواستنەوەی سەمتی ئابووری لەکاتی جەنگدا بۆ کاتی ئاشتی، بێ ئەوەی گەلی ئەمریکا زیانی پێ بگات و بکەوێتە تەنگژەوە، هەروەها هەوڵیدا بە درێژکردنەوەی بەرنامەکانی پەیمانی نوێی کۆمەڵایەتی حکومەتیش خزمەتگوزاری زیاتر لەخۆبگرێت بۆ خەڵك، وە زۆر سەرکەوتوو بوو لە بەدەست هێنانی ئابووریەکی تەندروست بەڵام تەنها هەندێك لە پێشنیارەکانی بوون بە یاسا لەکاتی سەرۆکایەتیدا، کۆنگرێس زیاتر پێکهاتبوو لە ئەندامانی کۆماریەکان، واتە وەکو سەردەمی ڕۆزڤڵت نەبوو بۆیە کۆنگرێس زۆر هاوڕا نەبوو و حەزیان بە بەرنامەکەی ترومان نەدەکرد لە بنیاتنانی پەیمانی نوێ لیژنەیەکی پێکهێنا لەسەر مافە مەدەنیەکان و هانی لایەنی دادگای دا بۆ گفتوگۆکردن پێش دادگای باڵا لەجیاتی بانگەشەکاران دژ بە جیاوازی ڕەگەزی[١٥].

لەساڵی ١٩٤٨ ترومان دووبارە هەڵبژێردرایەوە بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری[١٦]. لە وتەیەکدا ترومان ڕایگەیاند(کە بە زۆری دەسەڵاتەکانی سەرۆك لەوەدا قەتیس دەبێت کە خەڵکی بهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە پێویستە لەسەریان چی بکەن بەبێ ئەوەی خۆی داوای ئەوەیان لێ بکات[١٧]).

دەسپێکی سیاسەتێك کە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەمریکا پەیڕەوی کردبێت پەیوەست بووبێت بە سیاسەتی فراوانخوازیەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، سیاسەتی یارمەتیە داراییەکان بوو بۆ وڵاتە دۆستەکانی، ئەمەش لە

ڕێگــەی پــڕۆژەی ترومــان( بنــەمای ترومــان)ەوە کــە لــە میانــەی ڕێــوڕەسمی سەرۆکایەتی ئەمریکادا ڕاگەیەنرا بەناوی( پرۆگرامی خاڵی چوارەم[18]).

ئیدارەی ترومان لە ساڵی ١٩٤٨ قورسایی خۆی لە پشتگیری بزافی زایۆنیزمەوە دانابوو، وە بووە هۆی دەرچوونی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان و داننان بە دەوڵەتی ئیسرائیل و پشتگیری لە فراوانبوونی ئیسرائیل کرد لە دەرەوەی چوارچێوەی دابەشکردن و خستنەسەری زەویەکانی عەرەبی[19]. کاتێك پشتیوانی لە ئیسرائیل کرد بەر لە دامەزراندن و دواییش تا ڕاددەیەك شکستی خوارد لە درك پێکردنی کاردانەوەی قووڵی نێگەتیڤی عەرەبی کە هەڕەشەی ئاوەژووکردنەوەی ستــراتیژیەکانی ئەمریکای دەکرد تایبەت بە نەوت و جەنگی سارد[20]. ئیسرائیل یارمەتی لە ئەمریکا وەرگرت بە درێژایی سەردەمی ترومان، بۆ دووەم جار ١٩٤٨–١٩٥٣ بڕی(٧٠) ملیۆن دۆلار بە شێوەی یارمەتیدانی ئابووری و(٢٠) ملیۆن دۆلار لە زیادەی خۆراکی ئەمریکا. ترومان سەرۆکایەتی بەجێهێشت و خانەنشین بوو لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ کە ڕۆژەکانی تەمەنی بە خوێندنەوە و نووسین و تۆمارکردنی یاداشتەکانی بەسەر دەبرد[21].

باسی دووەم:

چەمك و زاراوەی جەنگی سارد:

جەنگی سارد بریتی بوو لە کێشمەکێشی ڕامیاری و ئابووری و ئایدۆلۆجی و پێشبڕکێی پڕچەککردنی دوو وڵات یان چەند وڵاتێك، لەگەڵ جەنگی دەروونی و ڕاگەیاندن بەبێ ئەوەی سەرباز یان چەکی تێدا بەکاربێت. واتا جەنگی سارد دوژمنایەتیەکی شاراوەی لە پەیوەندی نێوان دەوڵەتان دروست کرد بەڵام بەرەو

جەنگێکی ڕاستەقینە پەلکێشی نەکردن، ئەم زاراوەیە لە پاش جەنگی دووەمی جیهان بە ململانێی نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وتراوە[٢٢].

شەڕی سارد بەوە پێناسە دەکرێت ئەو ناکۆکیەیە کە لایەنە تەرەفدارەکان لەو ناکۆکیەدا چەك بەکارناهێنن لەدژی یەکتری، زۆرتر ئەم دەستەواژەیە بۆ ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت بەکاردێت.[٢٣]

ئەم زاراوەیە بەو شەڕەی نێوان هەردوو سەربازگەی ڕۆژهەڵاتی(شیوعی) ڕۆژئاوایی( سەرمایەداری) دەوترا کە تەنها تەقەمەنی گەرمی لیَ بەکارنەدەهات، بریتی بوو لە جەنگی ڕاگەیاندن و فکری و فەلسەفی و شارستانی و یاسایی.[٢٤]

جەنگی سارد بەدیل و جێکەوتەی شەڕی سێیەمی جیهانی بوو کە سەردەمێکی گرژی و توندوتیژی هاتە ئاراوە لەنێوان هەردوو بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە زۆرێك لە چاودێران پێشبینی شەڕێکی تری جیهانیان دەکرد، بەڵام شەڕەکە ڕاستەوخۆ هەردوو زلهێز ڕووبەڕوو نەبوونەوە بەڵکو لە پەراوێز و چوارچێوەی وڵاتانی هاوپەیمانی یەکتری دەخولایەوە.[٢٥]

بەشەڕی ڕاگەیاندن و پڕۆپاگەندەی نێوان سەربازگەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات دەوترێ،و لەلایەنی پچڕاندنی پەیوەندی ئابووری و دروستکردنی نەیاری سیاسی، وە هەموو ئەو کار و کردانەی کە دەگیرایە بەر لەلایەن هەردوو بلۆك لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی.[٢٦]

یەکێکە لەحاڵەتەکانی ململانێی بێ چەك لەسایەی بارودۆخێکی گرژ لەنێوان هەردوولا کە هەریەکەیان مەبەستیان خۆبەهێزکردن و لاوازکردنی لایەکەی ترە بە هەر هۆکارێك بێت جگە لە جەنگ.[٢٧]

## کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم:

جەنگی دووەمی جیهانی زۆر جار بە جەنگی هیتلەر ناودەبرێ، دوای کۆتایی هاتنی جەنگ یەکێك لە ئەنجامەکانی دابەش بوونی ئەڵمانیا و دروست بوونی دوو جەمسەری( ئەمەریکا – سۆڤیەت) و ململانێی بەردەوامیان بوو.بەڵام ئەنجام و ڕووداوی گرنگی دوای جەنگەکە دەرکەوت گۆڕانی دوژمنانی دوێنێ بۆ هاوڕێیانی ئەمڕۆ و گۆڕانی دۆستانی دوێنێ بۆ دوژمنانی ئەمڕۆ.

لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی گۆڕانێکی گەورە لە هاوسەنگی هێز ڕوویدا لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی سۆڤیەت و ئەمریکا وەکو دوو زلهێزی گەورە دەرکەوتن لە دوای جەنگ، بەریتانیا نەیتوانی چیتر ئاراستەی کاروباری جیهان بکات کە پێشتر ئەنجامی دەدا، وە جیهان دابەش بوو بەسەر دوو سیستەمی ئابووری کە یەکێکیان لەسەر بنچینەی ئابووری ئازاد بنیات نرابوو، ئەویتریان لەسەر بنچینەی موڵکیەتی گشتی، وە ململانێ و ناکۆکی دروست بوو لەنێوان ئەم دوو سیستەمە وە کاریگەری هەبوو لەسەر زۆربەی کێشە و بابەتەکانی پەیوەندار بە بارودۆخی نێودەوڵەتی[٢٨].

جەنگی دووەم دژ بە هەریەك لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان بوو، بەڵام لەدوای شەڕ ئەم وڵاتانە بوونە دۆست و هاوپەیمانی ڕۆژئاوا و دامەزراندنی سیستەمی لیبراڵی و سەرمایەداری. بەڵام سۆڤیەت کە بەشداربووی جەنگ و هاوشانی هاوپەیمانان( حلفاء) و دژ بە نیزامی فاشی و نازی بەڵام لەدواییدا گۆڕدرا بۆ نەیار و معادی و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی بلۆکی ڕۆژهەڵات و ململانێ ڕکابەری وڵاتە ڕۆژئاواییەکان، وە چین وەکو ژمارەیەکی بەهێز لەو مەیدانە دەرکەوت کە دەوڵەتی بنیات نابوو لەسەر ئایدیۆلۆجیای کۆمۆنیستی کە لە بەرامبەریدا ژاپۆن

و بەشێك لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نزیك دەبوونەوە لە سەربازگەی ڕۆژئاوا[٢٩].

لە جوڵای ١٩٤٥ ئەمریكا و سۆڤیەت و ئینگلیز لە پۆتسدامی نزیك بەرلین كۆبوونەوەیەكیان سازكرد، بەیەكەوە بارودۆخی ئەوكاتی جیهانیان تاوتوێ كرد، دیداری نێوان ستالین ترۆمان بۆیەكەمجار بوو ماوەیەكی كەم پێش هێرشە ئەتۆمیەكەی ئەمریكا بۆسەر هێرۆشیما، بە پشت بەستن بەو سەركەوتنە سەربازیە گفتوگۆكان دەستی پێكرد، ئەمریكا بە ڕاشكاوی بە(مۆلۆتۆف)ی ڕاگەیاند كە سیاسەتی خۆبەدەستەوەدانی( ڕۆزڤلت* ) لە بەرامبەر ستالین كۆتایی هاتووە. ترۆمان و چەرچل سیاسەتی سەختگیری لە بەرامبەر ڕووسەكان بە هۆكاری سەرەكی ڕێگری لە پەرەسەندنی كۆمۆنیزم دەزانی وە پێشنیاری بەردەوام بوونی داگیركاری سەربازی سەر ئەڵمانیا و دادگایی كردنی هاوكارانی هیتلەر. مێژوونووسێكی ئەمریكی( ئاپرۆتیس) لە كتێبی( دبلۆماسی و ئەتۆم، هێرۆشیما و پۆتسدام) دەنووسێت: ترومان وایدەزانی كە بوونی چەكی ئەتۆمی یەكێتی سۆڤیەت ناچار دەكات كە دان بە هەموو بۆچوون و داواكاریەكانی ئەمریكا بنێت بۆ ئەوەی ناوچەكانی ژێر نفوزی سوپای سوور چۆڵ بكات لە دامەزراندنی حكومەتێكی ملكەچ بە مۆسكۆ لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات. بۆمباران كردنی هێرۆشیما و بەكارهێنانی چەكی ئەتۆمی بە وتەی( ئاپرۆتیس) تەنها كۆتایی بە جەنگ لە ئاسیا و خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن نەبوو بەڵكو بۆ دەرخستنی هێز و توانای سەربازی بوو.[٣٠]

ئەو وتەیەی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بە دانپێدانانی فەرمی بەرپرسێكی ڕۆژئاوایی دادەنرێت سەبارەت بە جەنگی سارد لە ٥ی ئاداری ساڵی ١٩٤٦ كە ڕایگەیاند لەو بڕوایە دام سۆڤیەتیەكان تەنها ڕێزی هێز دەگرن، دەبێت ئەو

گەلانەی کە بە ئینگلیزی دەدوێن یەك بگرن تا هیچ سەرکێشیەکی فراوانخوازی لەلایەن ستالین ڕوونەدات[٣١].

لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت( مەکسیم لیت ڤینۆف) هاوتا ئەمریکیەکەی خۆی ئاگادار و وریا کردەوە کەهیچ سازش و نەرمی نواندنێك لەلایەن سۆڤیەتەوە نیە چونکە کێشەی نێوانیان هۆکارەکەی ڕیشەییە ئەویش چەمك و تێڕوانینی ئایدۆلۆجیە، ململانێی نێوان هەردوو جیهانی شیوعیەت و سەرمایەداری شتێکی حەتمیە[٣٢].

## تیۆری و بیروڕاکان دەربارەی سەرهەڵدانی جەنگ:

لێرەدا سێ قوتابخانەی فکری هەیە کە باس لە سەرهەڵدانی جەنگی سارد دەکات:

١- تەقلیدی - خۆپارێز و توندڕەو( المتشددین) پرسیار دەکات کە کێ دەستپێشخەری جەنگ بووە؟ لە وەڵامدا ستالین و یەکێتی سۆڤیەت، لە کۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهانی دبلۆماسیەتی ئەمەریکی دبلۆماسیەکی بەرگری بوو، بەڵام دبلۆماسیەتی سۆڤیەتی شەڕانگێز و فراوانخوازی( عدوانی توسعی) بوو[٣٣].

هەندێك کەس تێکچوونی پەیوەندیەکان دەخەنە ئەستۆی سەرۆکی سۆڤیەت( ستالین) کە بە ڕێکەوتنی( یالتا) پابەند نەبوو بەتایبەتی مەسەلەی مافی چارەی خۆ نووسینی میللەتان کە لە نازیەتی ئەڵمانیا ڕزگاریان بووبوو، هەروەها بەردەوام هەڕەشەی لە وڵاتانی دەوروبەری خۆی دەکرد بۆ ئەوەی بیانخاتە ژێر هەژموونی خۆیەوە.[٣٤]

نەریتی سیاسی یەکێتی سۆڤیەت بنیات نرابوو لەسەر دوو پایە، ڕوسی و شیوعی. نەریتی سیاستی ڕوسی جەختی دەکردەوە لەسەر حوکمی ڕەها و نەبوونی دیموکراسی، ئارەزوو لەسەر سەرکردەی بەهێز، ترس لە ئاژاوەی سیاسی، داگیرکاری وڵات و پەلاماردان، دوودڵی و خەجاڵەتی لە دواکەوتن و نەزانی، نهێنی و بێدەنگ کردن، دەوڵەتی پۆلیسی، نەریتی شیوعیەت مامەڵە کردن لەگەڵ چین( تەبقە) نەك تاك چونکە پێیوابوو ئەمە بنچینەی دادپەروەریە، ڕۆڵی گونجاو بۆ تاك و کۆمەڵگا و ئاراستەکردنی ئابووری لەژێر ڕکێفی دەوڵەت. بەڵام نەریتی سیاسی ئەمەریکی پشتی دەبەست بە لیبرالی و فرەیی( پلورالیزم) دابەشکردنی دەسەڵات، ڕۆڵی تاك، ئازادی ئابووری، هێزی بەرهەم هێنان، کە ئەمانە پارێزەری ئەمەریکا بوون، سەرەڕای ئەمە ئەمەریکا وڵاتێکی دوورەدەستی و ئاوی بوو، لە بەرامبەردا سۆڤیەت وڵاتێکی وشکانی و خاوەن ڕووبەری فراوان بوو.

ئەمریکا دوای جەنگ پێشنیاری سیستەمێکی جیهانی کرد لە ڕێگای(نەتەوە یەکگرتووەکانەوە)* کۆمەڵگا بخاتە باری ئاسایشەوە، سۆڤیەت نەتەوە یەکگرتووەکانی بەهەند هەڵنەگرت، چونکە ئەو فراوانخوازیەی لەئەورووپای ڕۆژهەلات و باڵادەستی لا گرنگ دەبوو.[٢٥]

٢- تەعدیلیەکان( دەسکاریخوازەکان): ئەمانە لە نووسینەکانیان لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لەو باوەڕەدا بوون کە هۆکاری جەنگی سارد ئەمەریکا بووە نەك فراوانخوازی یەکێتی سۆڤیەتی، بەڵگەشیان بۆ ئەمە کە جیهان لەدوای جەنگی دووەم جیهانی دوو جەمسەر نەبوو بەڵکو سۆڤیەت لاوازتر بوو و خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی نەبوو، و یەکێتی سۆڤیەت ژمارەی زۆر لە دانیشتوانەکەی لەدەست دابوو، باری ئابووری و پیشەسازی لە داتەپین دابوو،

ساڵی١٩٤٥ ستالین ڕایگەیاند کە ئیتر لەمەودوا ڕوودەکەینە کاروباری ناوخۆ و چاکسازی و پێشخستنی، سیاسەتی ستالین لە سەرەتای جەنگەکە میانڕەو(إعتدال) بوو.[٣٦]

( گێرمی ئیزاك و تەیلۆر داونینگ) مێژووناسن دەڵێن هەرچەندە ستالین لە وتەکانیدا باسی ئامانجی کۆنی مارکسی و شۆڕشی جیهانی دەکرد، بەڵام بەڵگەیەکی بەهێز لەبەردەستدا نیە کە ستالین بەڕاستی بیری لە پەلاماردان کردبێتەوە بۆ سەر ڕۆژئاوا.[٣٧]

هەروەها سەبارەت بە مەترسیەکانی سۆڤیەت زانیاری وەرگرتن پرسیار لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە مۆسکۆ دەکرا بۆ ئەمە( جۆرج کینان) لێکۆڵەر و توێژەری ڕوسیا لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا کاری دەکرد ڕایگەیاند سیاسەتەکانی ستالین سەرچاوەیان لە مێژووی ڕووسیادایە، مێژوویەك نیشانی دەدا کە ئەم وڵاتە دوورەپەرێزە تووشی بەدگومانی و بێ بەزەیی بووە، ئەو پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە تەنها بە زمانی زۆر و هێز دەتوانرێت لەگەڵ سۆڤیەت قسەبکرێت.[٣٨]

٣- ما بعد التعديليون( پۆست دەسکاریخوازەکان): ئەمانە لە سەردەمانی کۆتایی ساڵانی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو حساب دەکرێن، ئەمانە هیچ لایەك تاوانبار ناکەن بەڵکو ڕایان وایە حەتمیەتی واقیع و بارودۆخی جیهانی ئەوکات وای دەخواست جەنگی سارد دەستپێبکات کە هیچ ڕاکردن و خۆبواردنی تێدا نەمابۆوە، بەهۆی پێکهاتەی هاوسەنگی هەردوو هێزەکە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم، کە پێش جەنگ فرە جەمسەر بوو بەڵام دوای جەنگ بەهۆی ماڵوێرانی و داڕمانی زلهێزەکان تەنها دوو جەمسەر و هێز مانەوە. سۆڤیەت لایەنی موڵك و ماڵی بەرجەستەیان هەبوو وەکو زەوی و زار، ئەمریکا ئامانجی

بەرجەستەی نەبوو بەڵکو پەیوەست بوو بە نێوەندە نێودەوڵەتیەکان و بایەخیان بە پێڕەوی گشتی سیاسەتی جیهانی دەدا. ئەم دوو ئامانجەش بەریەك کەوتن.[٣٩]

**سەرکردەکانی ڕۆژئاوا لەو کاتەدا سێ ئاراستەی سیاسی جیایان هەبوو:**

**١- ئاراستەی توندڕەو(متطرف) کە ونستۆن چەرچل سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا نوێنەرایەتی دەکرد کە داوای مانەوەی هێزەکانی ئینگلیز لە پاڵ هێزی ئەمریکی لە ئەورووپا دەکرد، بۆ پاراستنی گرنتی جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی سۆڤیەت کە لە کۆنگرەی یالتا قبوڵی کردوو، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە هەڵبژاردن لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا.**

**٢- ئاراستەی دووەم هنری دالاس وەزیری بازرگانی ئەمریکی کە داوای دەکرد ئەمریکا بەرەنگاری پڕۆژەکانی سۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا ببێتەوە.**

**٣- لەلایەن گەل و حکومەتی ئەمریکیەوە، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا( جمیس بایرنز) کە داوای دەکر ئەمریکا سیاسەتی هێمنی و دەورەدان پەیڕەو بکات.[٤٠]**

باسی سێیەم:

**هۆکارەکانی سەرهەڵدانی جەنگی سارد:**

**١- ڕێکەوتنامەی( یالتا): دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی ئەمریکا و سۆڤیەت ساڵی ١٩٤٥ ڕێکەوتن لەسەر کێشەی ئەڵمانیای دوای جەنگ بە مەبەستی ئەوەی نابێت ئەڵمانیا جارێکی تر ببێتەوە بە مەترسی بۆ سەر سۆڤیەت و ئەمریکا، لەسەر ئەوە ڕێکەوتن ئەڵمانیا بیست ملیار دۆلار قەرزی شەڕ بداتەوە، لەو ڕێژەیەش دە ملیار دۆلاری بۆ سۆڤیەت بێت و لە داهاتی کەرتی**

ئــەڵمانیای ڕۆژئــاوا بــدرێ، بــەڵام ترومــان ڕایگەیانــد کــە ئەگــەر پــارە لــە ئاوەدانکردنەوەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا مایەوە ئەوسا دەدرێ بە سۆڤیەت ئەگەرنا با لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی بسێنێ کە خۆی داگیری کردووە، ئەمە هۆکارێك بـوو بـۆ ناکۆکی و گۆڕانی سـتـراتیژیەتی هەر لایەکیان.[٤١]

گـەمارۆی( بـەرلین* ) لەلایـەن سـۆڤیەتەوە سـاڵی ١٩٤٨ هـەوڵێك بـوو بـۆ ناچـارکردنی و دوورخـستنەوەی ڕۆژئـاوا لــە ئــەڵمانیا و شکـست پێهێنــانی لــە دروسـتکردنی ئـەڵمانیای ڕۆژئـاوا و ناچـارکردنی سـەرانی ڕۆژئـاوا و ناچـارکردنی سەرانی ڕۆژئاوا بە گفتوگۆکردن لەگەڵ سۆڤیەت.[٤٢]

دوای کۆنگرەی یاڵتا لەنێوان ستالین و ڕۆزڤێلت و چەرچل، ئامادەکاریـان بـۆ پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتانی دۆڕاوی میحوەر،ستالین پێداگری کـرد کـە لە دوای جەنگ کۆنتـرۆڵکردنی حکومەتی پۆڵۆنیای لەدەست دابێت، وە لە ئاسـیا دوای چوونی ژاپۆن بۆ جەنگ، لە بەرامبەردا سۆڤیەت بۆ هاوکـاریکردنی جـەنگ بەرەیەکی نوێ لە ئۆقیانووسی ئارامدا دەکاتەوە، سۆڤیەت دەیویست جێپێیەکی لە ژاپۆن هەبێت، وە لە بەڕێوەبردنی ژاپۆندا ڕۆڵێکی هەبێت، بەڵام هاری ترومـان لەدوای مردنی ڕۆزڤێلت( دوو مانگ پاش کۆنفرانسی یاڵتا) بوو بـە سـەرۆك کۆمـار ئەم داوایەی ڕەتکردەوە.[٤٣]

٢- فراوانخـوازی: کۆنتــرۆڵکردنی ئــەورووپای ڕۆژهــەڵات، سیاســەتی دەرەوەی ستالین لە دوای جەنگ لەسەر ئەو ڕێباز و بنەمایە کـاری دەکـرد کـە ناوچـەیەکی بێلایــەن لــەنێوان سـۆڤیەت و دونیــای ناکۆمۆنیــست دابمــەزرێ، سـۆڤیەت وای دەبینی کە زۆربەی هێرش و پەلامارەکان بۆسـەر ڕوسـیا لـە ڕێگـای پۆڵۆنیاوەیـە یان لە ناوچەکانی ڕۆمانیا تا فینلەندا وەکـو کۆنتــڕۆڵکردنی ئـەورووپای ڕۆژهــەڵات هەرچەشنە هەڕەشەیەکی دەرەکی دووردەخستەوە.

لەدوای جەنگی دووەم نوێنەری(٥٢) وڵات کۆبوونەوە و کۆنگرەیەکیان بەست لە پۆتسدام کە ڕەزامەندیان لەسەر سەربەخۆیی ژاپۆن دەربڕی، سۆڤیەتیەکان داوای کەرتێك( بەشێکیان) لە ژاپۆن کرد.[٤٤] ترومان پێشنیاری کرد سەرلەنوێ لەسەر ڕێکخستنەوەی دەوڵەتانی ڕۆمانیا و بولگاریا و هەڵبژاردنی ئازاد، ستالین وای بەباش دانا لەمەڕ بابەتی وەك غەرامە وەرگرتن لە ئەڵمانیا و گۆڕینی سنوری ڕۆژئاوای پۆلەندا و نەهێشتنی دەوڵەتی مەنفای پۆلەندا گفتوگۆ بکەن.[٤٥]

یەکێتی سۆڤیەت وای دەبینی کە کۆنترۆڵکردنی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا کارێکی گرنگ و زیندەگیە بۆ نەهێشتنی دوژمنکاری ئەڵمانی نوێ، وە ئەم ناوچەیە بە ستراتیجی و گرنگی جیۆپۆلەتیکی هەیە وەك بەربەستێك وایە لە بەرامبەر ڕۆژئاوا.[٤٦]

سەبارەت بە بانگەشەی سۆڤیەت بۆ داواکاری بەشێك لە وڵاتانی ژاپۆن ئەمەریکا ڕەتی کردەوە بەو بیانووەی کە سۆڤیەت و درەنگ گەیشتۆتە ئەوێ بۆیە مافی ئەوەیان نیە، هەر بۆیە ئەمریکا کۆمەکی پێشکەش بە ژاپۆن کرد بۆ خێرا خستنەگەڕی ئابووریەکەی تا ببێتە نموونەیەکی درەوشاوەی سەرمایەداری و دیوارێك بێت لە بەردەم تەشەنەی کۆمۆنیزم.[٤٧]

کێشەی پۆڵەندا یەکێك لە هۆکارەکانی تر کە زیاتر مەبەست سەپاندنی دەسەڵات و کاریگەری و هەژموونی سۆڤیەت بوولەم بارەیەوە، کە ڕۆژئاوا پشتگیری حکومەتی مەنفای دەکرد کە لە لەندەن بوون خوازیاری هەڵبژاردن و سیستەمی دیموکراسی بوون، لە بەرامبەردا ستالین پشتیوانی سوپای ئازادیخوازی پۆلەندی لایەنگیری کۆمۆنیزمی دەکرد، ستالین بەردەوام پێداگیری دەکرد لەسەر هەبوونی دەوڵەتێکی لایەنگیری کۆمۆنیزم دەیگوت پۆڵەندا بە

درێژایی مێژوو ڕێگەیەك بووە دوژمن لێیەوە هاتۆتە ناو خاکی ڕوسیا لە سێ ساڵی ڕابردوودا، پۆڵەندا بۆ یەکێتی سۆڤیەت مەسەلەی مان و مردنە.(٤٨)

هۆکاری گەورەی ململانێی نێوان سۆڤیەت و ڕۆژئاوا ڕەتکردنەوەی ئیدارەی دیموکراسی بوو لەو هەرێمانەی لەژێر دەستی نازیدا بوون سۆڤیەت لە کاتی جەنگدا دەستی بەسەردا گرتبوو، ئەمە لە کاتێکدا ڕێبەرانی بلۆکی ڕۆژئاوا بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان پەنایان بردۆتەبەر گفتوگۆ و دانوستاندن و دیموکراسی.(٤٩)

هەروەها کێشەی ڕۆژهەڵاتی دوور و هەبوونی بۆمبی ئەتۆمی و هەڵوەستەی یەکێتی سۆڤیەت لەسەر ئەم بابەتە هەستیارە و هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی.(٥٠) ئەمریکا باوەڕی وابوو تەنیا بە هەڕەشەی بەکارهێنانی ئەم چەکە دەتوانێ پێش بە سۆڤیەتیەکان بگرێت لە بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم.( ستیڤن ئەجرۆم) مێژووناس دەڵێ: لە پۆتسدام بەدواوە ئەم بۆمبە هۆکاری بەردەوام بوو لە ڕوانینی ئەمریکا بۆ یەکێتی سۆڤیەت.(٥١)

لەوکاتە بەدواوە باس لە ستراتیجی ئەتۆمی دەکرا کە جیاوازە لە ستراتیجیە کلاسیکیەکان، کە کاریگەریان هەبوو لەسەر گۆڕان و هەڵوەشاندنەوەی پلانە ستراتیجیەکان.( ڕۆزڤێلت) بڕیاری دابوو سۆڤیەت لە بوونی بۆمبی ئەتۆمی ئاگادار بکاتەوە، هەربۆیە لە کۆنگرەی پۆتسدام( ترومان) ڕایگەیاند کە ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمی هەیە، بەڵام ستالین ئەم هەواڵانەی بەلاوە ئاسایی بوو چونکە پێشتر لە ڕێی سیخوڕەکانیەوە بستبووی، کاتێکیش ئەمریکا ساڵی ١٩٤٦ پرۆژەی( باردخ)ی پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد بۆ ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان چاودێری چەکی ئەتۆمی بکات ستالین ئەم پرۆسەی ڕەتکردەوە چونکە دەیویست بۆمبە تایبەتیەکەی خۆی دروست بکات.(٥٢)

بەسەرکەوتنی شیوعیەکان لە چین و ڕاگەیاندنی کۆماری چینی میللی لەلایەن( ماوتسی تۆنگ) لە ئەیلولی ١٩٤٩ ئەوەندەی تر ترس لای ئەمریکا دروستکرد، چونکە سەرکەوتنی ئەم شۆڕشە فاکتەرێکی هاندانی بزووتنەوە چەپە شۆڕشگێڕەکانی ئاسیا و جیهانە بە ئاراستەی پلان دانان بۆ جێبەجێ کردنی تیۆریای مارکسی– لینینی.[٥٣]

هەروەها دوای شەڕی نیمچە دوورگەی کۆریا ساڵی ١٩٥٠–١٩٥٣ کە کۆریای باکوور هێرشێکی بەبڵاوی کردە سەر کۆریای باشوور وە کاردانەوەی سەرۆکی ئەمریکا( ترومان) کە ڕایگەیاند( هێرشکردنە سەر کۆریا ئەوە دەگەیەنێت کەوا شیوعیەکان بە وێرانکردن دەیانەوێت وڵاتێکی سەربەخۆ داگیربکەن ئەگەر ئەمە بەبێ چارەکردن بمێنێتەوە مانای وایە شەڕی سێیەمی جیهانی دەستی پێکردووە.[٥٤]

دوای ئەوەی چین یارمەتی کۆریای باکووری دا بە سەربازی خۆبەخشکەری و هێزی سەربازی ئەمریکی تووشی شکست بوون ناکۆکی توند لەنێوان سۆڤیەت و ئەمریکا دروست بوو، وە لە ئەمریکا دەنگی نارەزایی بەرزبۆوە داوایانکرد بە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی، ترومان ڕایگەیاند ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان ڕازی بێ کردەیەکی سەربازی ئەنجام دەدەین دژ بە چین، لەو کاتەش دەسەڵات دەبەخشین بە جنرال( ماک ئارسەر) بە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی، بەڵام دوای هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٢ هاتنەسەر کاری( ئایزنهاور) سیاسەتێکی نوێی گرتەبەر لەجیاتی سیاسەتی ئیحتیوا( النظره الجدیده) New Look کە پشتی دەبەست بە ستراتیژی سەربازی ئەویش Massive Retataition ( الإنتقام الشامل).[٥٥]

٣- کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست:

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگیەکی زۆری هەیە و هەموو دەوڵەتەکانی بەیەکتریەوە بەستراونەتەوە بۆیە ناکرێ لە ڕەوتی ڕووداوەکان جیابکرێنەوە، هەموو هێزەکان هەوڵیانداوە دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن بەسەر ناوچەکە.[٥٦] وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێش جەنگ بەریتانیا خاوەنی نفوز و هەیمەنە بوو بەسەر ئەم وڵاتانەن، بەڵام دوای جەنگ بەریتانیا ئەو هێز و کارتی فشارەی نەما بەسەر ئەم وڵاتانەدا، بۆیە ئەمریکا جێگای بەریتانیای گرتەوە، هەروەها ڕەتکردنەوەی سۆڤیەت بە کشانەوەی سوپاکەی لە باکوری ئێران لە ئاداری ١٩٤٦، وە فشار خستنەسەر تورکیا لەلایەن سۆڤیەت، وە لە شەڕی ناوخۆیی یۆناندا کۆمۆنیستەکان سەرکەوتن، دوای ئەم ڕووداوانە ئەمریکا هەستی بە مەترسی سۆڤیەت کرد و هاتە ناو کێشەکانەوە و کەوتە ململانێ و فشارخستنەسەر سۆڤیەت لەبەر گرنگی و ستراتیجی ئەو دوو وڵاتە بوونی گەروو تەنگەبەرەکان و مەترسی بلۆکی ڕۆژهەڵات کە دەست بگرێ بەسەر ئەم وڵاتانەدا.[٥٧]

هەروەها بزوتنەوە ڕزگاریخوازە نیشتمانیەکانی جیهان لەم سەردەمانەدا هۆکارێك بوون بۆ گرژی و ناکۆکی و دروستبوونی جەنگی سارد، لەو زەمانەدا بزاڤە ڕزگاریخوازەکان هاوئامانج و جۆرێك لە یەکانگیریان هەبوو لەگەڵ بزاڤە سۆشیالیستیەکان کە هەریەکێکیان ئاراستە یاخود دژ بە سەرمایەداری بوون، بەم جۆرە یارمەتی و کۆمەکی بزوتنەوە نیشتمانیەکان لەلایەن سۆڤیەت دەبووە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی بلۆکی ڕۆژئاوا بەبێ ئەوەی سۆڤیەت پێویست بکات هێرشی ڕاستەوخۆ ئەنجام بدات.[٥٨]

سۆڤیەت بۆی دەرکەوت سێ ڕەگەزی بنچینەیی هێزی شۆڕشگێری لە جیهاندا هەیە،ئەوانیش سیستەمی ئیشتیراکی و بزوتنەوەی کرێکاری جیهانی، بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانی، پێویستە هاوپەیمانی لەنێوان ئەم سێ هێزە دروست بکرێت بۆ لاوازکردنی پێگەی ئیمپریالیزم.[٥٩]

ستالین وەك سەرۆکی سۆڤیەت سیاسەتەکەی گۆڕیبوو لە سیاسەتی هێرشی ڕاستەوخۆ بۆ سیاسەتی هێرشی ناڕاستەوخۆ بۆ کیشوەرەکانی تر، دوای سەرکەوتن لە یارمەتیدانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لە گۆڕینی نیزامەکەیان بۆ ئیشتیراکی گرنگی جێ سەرنجی گواستنەوە بۆ بزاڤە ڕزگاریخوازە نیشتمانیەکان لە ئاسیا و ئەفریقیا کە ئەم بزوتنەوانە چالاك بوون دوای جەنگی دووەمی جیهانی.[٦٠]

## قۆناغەکانی جەنگی سارد :

١- سەرەتاکانی جەنگ: ١٩٤٥-١٩٤٧ یان ( ١٩٤٥-١٩٥٣)

لەواقیعدا جەنگی سارد پێش کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهان دەستی پێکرد بە واتای لە شوباتی ١٩٤٥([٦١] سۆڤیەت لە دەستپێکی جەنگەکە ئامانجی بەرجەستە و دیاریکراوی هەبوو( ممتلکات – زەوی) واتا زیاتر گرنگی دەدا بە فراوانخوازی و شوێنپێکردنەوە لە ناوچە جیاوازەکاندا، لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بازنە و سنووری دەسەڵات و نفوزی خۆی فراوان بکات بە تایبەتی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات، بەڵام ئەمەریکا ئامانجی( غیر ملموس) زیاتر مەعنەوی و کاریگەری بوو واتا گرنگیدان بە چوارچێوە و بازنەی گشتی لە سیاسەتی جیهانی، لە هەوڵی دامەزراندنی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووکانی جیهانی بوو و کاریگەری دروستکردن لە وڵاتانی جیهانی وەکو براگەورەیەك.[٦٢] ترسان لە یەکێتی

سۆڤیەت لەلایەن ئەمەریکاوە پێویستی بەوە هەبوو کە بانگەشەی جەنگێکی خۆپارێزی بکات وە( جۆرج کینان) وریایی دابوو بە ئیدارەی ئەمەریکا کە دەسەلاتی سۆڤیەت لە فراوانبووندایە ئەگەر ئەمەریکا کارێك نەکات بۆ ڕێگرتنی سەرکەوتنەکانی ئەمەریکا لە مەترسیدایە، بۆیە لێرەدا ئەمەریکا ئامانجی دامەزراندنی سیستەمێکی جیهانی لەسەر بنەما و ڕێبەری کردنی ئەمەریکا بۆ ئەو سیستەمە.[٦٣] ئەم قۆناغە لە ساڵی ١٩٤٥-١٩٥٣ واتا ساڵی مردنی ستالین، لەم قۆناغەدا گرنگترین بیرۆکەی ستالین هارینی دەسکەوتە سەرەکیەکانی خۆی لە شەڕدا، واتە دەسەلات بەسەر ئەوروپای ناوەند بەبێ تێکهەڵچوونێکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەمریکادا بوو. لەم قۆناغەدا ڕۆژئاوا بە گشتی هەلۆیستێکی بەرگریکارانەی هەبوو، ئەمریکاش ئامادەبوونی سەربازی خۆی لە ژاپۆن و ئەڵمانیا پاراست.[٦٤]

٢- ڕاگەیاندنی جەنگ( ١٩٥٣-١٩٧٠)

٣- بەرزبوونەوە و هەڵکشانی جەنگ ( ١٩٧٠-١٩٩١) ــ

سیاسەتی ئیحتیوا( دەوردان) بنکۆڵکردن

لەپاش تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی لە ساڵی ١٩٤٥، سیاسەتێکی نوێ هاتەکایەوە ئەویش سیاسەتی دەوردان بوو، چەمکێکی تازەبوو لەمیانەی جەنگی سارددا.[٦٥]

سیاسەتی دەوردان یان ڕادەبۆدانان کە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پیادەکرا لە ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا ڕێگەگرتن لە بەرامبەر هەر فراوانبوونێك چ جوگرافی یان ئایدۆلۆجی لەلایەن سۆڤیەتەوە.[٦٦]

ترس لەیەکێتی سۆڤیەت لای ئەمەریکیەکان وایکرد هەڵمەتێکی دژ بگرێتەبەر، وە بەکارهێنانی چەکی ناوەکیش لەبەرچاو گیرابوو، وە سیاسەتی

ئەمەریکا ئەوکاتە وەستابوو لەسەر سیاسەتی ئیحتیوا( policy of containment) کە جۆرج کینان گەورە ڕاوێژکاری ئەمەریکی لە کاروباری سۆڤیەت داڕێژەری بوو.[٦٧]

ئامانج لەم سیاسەتە لەناوبردنی یەکجارەکی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی نەبوو، بەڵکو ئامانج بەرگری و پاراستنی ئەمەریکا بوو وە سنووردانان و بەرتەسککردنەوەی فراوانخوازی سۆڤیەتی بوو لە داهاتوو.[٦٨]

ئەم سیاسەتە کە دژی یەکێتی سۆڤیەت ئەمەریکا گرتیە بەر لەپاش تیۆریەکەی کینان بوو چونکە کینان لە درێژەی وتارەکەیدا ئامۆژگاری ئەمەریکای دەکرد کە ڕاستەوخۆ بە جەنگ ڕووبەڕووی سۆڤیەت نەبێتەوە، بەڵکو لەگەڵ حەزە فراوانخوازیەکانی سۆڤیەت سیاسەتێکی درێژخایەن و تایبەتمەند و ژیرانە پیادە بکات، کینان پێیوابوو ئەو حەزانەی سۆڤیەت و نەبوونی یەکێتی ناوەخۆیی وردەوردە زەمینە سازدەکات بۆ ڕووخاندن.[٦٩]

ئەمەریکا ئامانج و ویستی لە جەنگی سارد ئیحتیواکردنی سۆڤیەت بوو، ئەم سیاسەتە پشتی دەبەست یان پەیوەست بوون بە (غایە) ئامانج، ئیحتیواکردنی سۆڤیەت یان شیوعیەت لەڕێگای هۆکارەکانی ماڵی و دارایی بۆ نەهێشتنی فراوانخوازی سۆڤیەتی.[٧٠]

سیاسەتی ئیحتیوا لەسەر دوو کۆڵەگەی بنەڕەتی دامەزرابوو:

١- ئابووری: ئەویش پرۆژەی مارشاڵ بوو بۆ دەربازکردنی وڵاتانی ئەورووپا لە کارەسات و قەیرانی ئابووری.

٢- سەربازی: کە خۆی دەبینیەوە لە دامەزراندنی پەیمانی ناتۆ بۆ ئەوەی ببێتە کەمەربەندێکی بەهێز بۆ وڵاتانی ئەورووپا لە بەرەنگاربوونەوەی سەربازگەی شیوعیەت.[٧١]

وتارەکەی( کینان) و( بنەمای ترومان):

گرنگیدان بە سوپا و چەك لەلایەن ستالین زەنگی مەترسی لێدا بۆ( جۆرج کینان) پسپۆڕ لە کاروباری سۆڤیەت لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ، لە تەلەگرافێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای ناردووە لە تەمموزی ١٩٤٧ کە لەچوارچێوەی وتارێکدا چاپکرا، لەو باوەڕەدا بوو کە بەرزەفڕی و فراوانخوازی سۆڤیەتی هەڕەشەیەکی جدیە بۆ سەر ئەمریکا و جیهان، کینان پێشنیاری سیاسەتێکی کرد کە بە( سیاسەتی بەربەست کردن ـ جڵەوکردن) ناسرا.(٧٢)

جۆرج کینان لە وتارێکدا لە گۆڤاری foreign affairs لە ساڵی ١٩٤٧ خستیەڕوو کە تیایدا وتبووی داوا و خواست ئەوەیە بە وریایی و لێزانیەوە کۆمەڵێك لە هێزەکان بۆ بەرگری و بەرەنگاری دوژمن لەو ناوچانەی کە خاوەن گرنگی و جیۆستراتیجی و جیۆپۆلەتیکن نمایش بکرێن، پیشانی یەکێتی سۆڤیەتی بدەن، بەڵام کینان لەگەڵ ئەوەدا نەبوو چەکی ئەتۆمی بەکاربێت دژ بە سۆڤیەت، چونکە ئەو یەکێتی سۆڤیەتی وادەبینی دوژمنێك نیە بە مانا و هاوشێوەی هیتلەر, وە نەخشە و خشتەیەکی زەمەنی کاتیان نیە بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکانیان، چونکە ئەوان لەو باوەڕەدان سەرمایەداری ڕۆژئاوا لەناخی خۆیدا ڕەگ و ناوکی لەناوچوونی خۆی هەڵگرتووە بۆیە سۆڤیەت وایدەبینی پێویست ناکات بەرەنگاری ڕۆژئاوا ببنەوە مادام کۆتاییەکەی حەتمیە.(٧٣)

سیاسەتی دەوردان کە لە دوای جەنگ پیادەکرا لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا بەرهەمی عەقڵی سەردەم بوو پاش ئەوەی سیاسەتمەداران کەلێنێکیان بەدیکرد لەنێوان دیالۆگی دبلۆماسی سیاسی و بەرەنگاربوونەوەی سەربازی کە خۆی لەخۆیدا ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی نادیار و شەڕێکی ڕاستەقینەی

شاراوەیە، ئەو لایەنەی ئەو سیاسەتە پەیڕەو دەكات بەرامبەرەكەی ناچاردەكات بە ڕازی بوون بە زۆربەی داواكاریەكان بە ئامانجی دەرچوون لە قەیرانەكان.[٧٤] وتارەكەی كینان گرنگیەكی مێژوویی هەبوو كەوایكرد سیاسەتی ئیحتیوا پیادە بكرێ لە بەرامبەر سۆڤیەت، وە جێبەجێ كەری ئەم سیاسەتە لە سەردەمی سەرۆك( هاری ترومان) و بنەما بەناوبانگەكەی(ترومان) لە ١٢ ی مارسی ١٩٤٧ كە ڕایگەیاند وایدەبینم و تێبینی دەكەم كە هیچ مەترسیەكی سەربازی نیە لەلایەن سۆڤیەتەوە كە ڕۆژنامەگەری ئەمەریكی وا وێنای كردووە، بەڵام مەترسی لە پەیوەندی و سیستەمی ئابووری كۆمۆنیستیەوە هەیە لە سۆڤیەت، ئەویش قۆرغی بازرگانی و كاری ئابووری كردووە لە ڕوسیا، ترومان ڕایگەیاند كە ئازادی ووشە و بیروڕا و ئازادی پەرستن و ئازادی ئابووری و بازرگانی وادەكات ئەمەریكا ڕەگەزی مانەوەی تیادا بەردەوام بێت، لە بەرامبەریشدا كۆت و بەندی ئابووری و ئازادی بەرەو نەمان دەچێت.[٧٥] ڕۆبەرت دانیلز لە شیكردنەوەی وتارەكەی كینان چەند سەرنجێك دەخاتەڕوو لە مەسەلەی بەربەستكردن( ئیحتیوا) لەگەڵ بەدگومانی ماركسیزم لەبارەی هێرشی سەرمایەداری و ترسی لەمێژینەی ڕوسەكان لە جیهانی دەرەوە( ڕووانینێكی نەخۆش ئاسا بۆ كاروباری جیهان) پتـر تین و تاوی دەسەند ئاڕاستەیەكی گەڵاڵەكرد بۆ زیادكردنی هێزی پۆلیس و سوپای سۆڤیەتی بەرەو جیاكردنەوەی خەڵكی ڕوسیا لە دونیای دەرەوە.[٧٦]

لەئاداری ساڵی ١٩٤٧ كۆنگرێسی ئەمەریكی ڕەزامەندی لەسەر پرۆژەی ترومان دەربڕی كە بریتی بوو لە یارمەتی سەربازی و ئابووری بەو وڵاتانەی مەترسی سۆڤیەتیان لەسەرە، وەكو وڵاتی یۆنان و توركیا كە بڕی ٤٠٠ ملیۆن دۆلار بۆ چارەسەری كێشەكانی ئەو دوو وڵاتە وەستان لە بەرامبەر هەڕەشەكانی سۆڤیەت تەرخان كرا. وەزیری بەرگری ئەمەریكا( فۆرسیتاڵ) ڕایگەیاند ئەو

ناوچانەی دەکەونە نێوان جەبەل تاریق و ئۆقیانووسی هیندی گرنگیەکی زۆری بۆ ئەمەریکا هەیە لەلایەنی سەربازی و ئابووری، سۆڤیەت ئەم پرۆژەیەی بە سەپاندنی هەژموونی دەسەلاتی ئەمریکا لە رۆژهەلاتی ناوەراست دادەنا. لەدوای ئەم پرۆژەیە رۆلی بەریتانیا لە نێوەندی نێودەولەتی لاواز بوو لە چارەسەرکردنی کێشە نێودەولەتیەکان وە بنەمای سێ هێزە گەورەکە بەرەو دوو جەمسەری رۆیشت وە ئەم پرۆژەیە جەختی دەکردەوە لەسەر پارێزگاری لە ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراست دژ بە هەرەشەکانی سۆڤیەت کە ئەرکی ئەمریکایە نەك بەریتانیا.[٧٧] بنەمای( ترومان*) دوو ئامانجی هەبوو، بەهێزکردنی هێزی سەربازی و دروستکردنی چەکی نوێ بۆ راوەستان دژ بە پەرەسەندنی کۆمۆنیزم، وە دەسەبەرکردنی بارودۆخ و ژینگەیەکی لەبار و خۆشگوزەران و چاککردنی باری دارایی کۆمەلگە هەژارەکان.[٧٨]

ترۆمان هۆشداری دا ئەگەر یۆنان و تورکیا بچنە باوەشی کۆمۆنیزمەوە ئەوا ولاتانی تر لە ئەوروپای رۆژئاوا و ئەفریقیا و رۆژهەلاتی ناوەراستیش رۆژێك لەرۆژان دەکەونە بەر هەرەشە، هەروەها دوو میتۆدی جیاوازی ژیانی خستەروو کە یەکێکیان سەرچاوەی لە ئازادی و سەربەخۆیی دایە ئەویتر لە دکتاتۆریدا، ئەم وتانەی ترۆمان کە تیایدا ئاماژەی بۆ جەنگی ئایدۆلۆجی نێوان ئەم دوو رکابەرە دەکرد ئەمەش لەلایەن کۆنگرێسی ئەمەریکا پەسندکرا.[٧٩]

باسی چوارەم:

پرۆژەی مارشال:

ئەمریكا پەیڕەوی لە سیاسەتێكی ئابووری و ستراتیجی كرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسی شیوعیەت لەڕێگای پێشكەشكردنی یارمەتی و كۆمەكی و قەرزدان بە وڵاتانی ئەورووپا ئەوانەی لەدوای جەنگ تووشی داڕمان و داتەپینی ژێرخانی ئابووری و مرۆیی هاتوون، ئەم پرۆژەیە لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا( جۆرج مارشال) لە ٥/یۆنیۆ/١٩٤٧ پێشكەشكرا بە مەبەستی ئاوەدانكردنەوەی ئەورووپا وە ڕایگەیاند ئەم پرۆژەیە دژی هیچ وڵات و بیروڕایەك نیە بەڵكو دژی هەژاری و برسیەتی و ئاژاوەیە، چونكە كەرتی كشتوكاڵ و پیشەسازی و بازرگانی لە ئەورووپا ڕووبەڕووی زیانی زۆر گەورە بووبۆوە وە ئەم بارودۆخەش وایدەكرد زەمینەسازی و كەشوهەوای بڵاوبوونەوەی شیوعیەتی دەرەخساند كە لە ڕاستیدا ئەم پرۆژەیە ئامانجی سەربازی و ئابووری و سیاسی خۆی هەبوو[٨٠].( جۆرج مارشاڵ) وەزیری دەوڵەتی ئەمریكی لە ساڵی ١٩٤٧ پرۆژەیەكی پێشكەش كرد بەناوی( پرۆژەی مارشاڵ) لەپێناو چارەسەركردنی قەیرانی ئابووری لە ئەورووپا و سەرلە نوێ بنیاتنانەوەی، ئەوەیان ڕاگەیاند كە ئەم پرۆژەیە دژی هیچ وڵات و بیرباوەڕێك نیە بەڵكو دژ بە برسیەتی و هەژاریە. مارشاڵ دەركی بەوە كردبوو كە بواری كشتوكاڵ و بازرگانی تووشی داتەپین هاتووە لە دوای جەنگی دووەم لە بارودۆخێكی وا ناڵەباردا لەوانەبوو سۆڤیەت و بیری كۆمۆنیستی دزەبكەن و ئەم هەلە بقۆزنەوە، پەرە بدەن بە دەسەڵات و شوێن پێی خۆیان، بۆیە پێشنیاری بۆ ئەمریكا كرد كە قەرز بدات بە وڵاتە ئەورووپیەكان بۆ ئەوەی كەرەستە و كەلوپەلی پێ بكڕن.[٨١]

ئالۆزی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا کاتێك قوولتـر بوو کە گەلالەنامەی(مارشال) بۆ بووژاندنەوەی ئەوروپا ڕاگەیەنرا، ئەم پرۆژەیە یارمـەتی دارایـی دەدایـە ولاتـە ئەوروپیەکان بـە مـەرجێك بـەم پارەیـە کـالا و شمـەکی ئـەمریکی پـێ بکـڕن کـە دەبـووە هـۆی جوولێنـەری ئـابووری ئەمـەریکاش، سـۆڤیەت خوازیـار بـوو ئـەم کۆمەکــە ئــەویش بگرێتــەوە، بــەلام ســتالین دەیگــوت ئەمــە فێلێکــە لەلایـەن(ترومـان)ەوە، ئـەوان نایانـەوێ یارمـەتیمان بـدەن بـەلکو مەبەسـتیانە کاریگەری و هەیمەنەی خۆیان بسەپێنن بەسە ئەوروپیەکان.[٨٢]

ستالین وەلامی ئەم پرۆژەیەی دایەوە و بە پرۆژەیەکی ئیمپریالیزمی ناوبرد و بەشداری نـەکرد و نەیهێـشت ولاتـانی سـەربە بلـۆکی سـۆڤیەت بەشـداری بکـەن، بـەلام شـازدە دەولــەت، لەوانــە ئــەلمانیای ڕۆژئــاوا، لــە پــاریس کۆبوونــەوە بەرنامەیـەکیان دا، ئەمـەریکا حەڤـدە ملیـار دۆلاری تیـادا دانـا، بـە گـشتی ئـەم پرۆژەیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا.[٨٣]

ستالین ڕایگەیاند، پرۆژەی( مارشال) بۆ یارمەتیدانی ئەوروپا تەنها هۆکارێکە بۆ فراوانخوازی ئابووری ئەمەریکی. ئەمریکا هەمیـشە سیاسـەتی( بـاب المفتـوح) دەرگای کراوەی لە بواری ئـابووری نێودەولەتیـدا پـەیڕەو دەکـرد، چـونکە ئەمـە ڕێگایەکە بۆ چوونەژوورەوە.[٨٤]

پەیمانی باکوری ئەتلەسی( ناتۆ) North Atlantic Treaty Organization

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی ڕێکەوتن و هاوپەیمانێتی هاوبەندی نێودەولەتی پەرەی سەند، ئەمەش لە ئەنجامی جەنگی ساردی نێوان سۆڤیەت و ولاتانی ڕۆژئاوا، ڕۆژئاوا باری سەرنجی وابوو هەندێ لە هاوپەیمانەکانی نێوان ولاتانی ئەوروپی بەس نیە بۆ بەرگری و پاراستنی کیشوەری ئەوروپا بەتایبەتی دوای پەرەسەندنی هەژموونی یەکێتی سۆڤیەت بەسەر ئەوروپای خۆرهەلات.[٨٥]

پێش باسکردنی هاوپەیمانیەتی( ناتۆ) دەبێ ئاوڕێك لە ڕابردوو بدەینەوە، ئەویش تیشك خستنەسەر( پەیمانی برۆکسل)ە لە ١٢/ئادار/١٩٤٨ بەسترا کە میساق و ڕێککەوتننامەیەکی سیاسی و سەربازی بوو بۆ ماوەی(٥٠) ساڵ، کە جەختی دەکردەوە لەسەر یارمەتیدانی یەکتر لە بواری لۆجستی و ئۆتۆماتیکی لە حاڵەتی پەلاماردانی دوژمنکاری بۆ سەر هێزە بەشداربووەکانی ئەم پەیمانە، ئەوانیش(فەڕەنسا، ئینگلتەرا، بەلجیکا، هۆڵەندا، لۆکسمبۆرگ) لە ئەورووپا کیشوەرەکانی تر وە دامەزراندنی ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری.[٨٦]

کاتێ شەڕی سارد لەنێوان سەربازگەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات گەرم بوو وە دەسەلاتی سۆڤیەت لە ئەورووپا پەرەیسەند، فەڕەنسا و بەریتانیا و بەلجیکا و هۆڵەندا و لۆکسمبۆرگ کەوتنە سەر ئەو باوەڕەی کە بەرژەوەندیان واپێویست دەکات هاوپەیمانێتیەکی سەربازی پێکبهێنن.[٨٧]

لەدوای پەرەسەندنی جەنگی سارد و گەمارۆی بەرلین لەلایەن سۆڤیەت و بڵاوبوونەوەی شیوعیەت لە ئەورووپا، وڵاتانی پەیماننامەی برۆکسل وایان بە پێویست زانی بۆ هاتنە ناوەوەی هێزی ئەمریکا بۆ ناوچەکە؛ لە دواییشدا لێرەوە بیرۆکەی پەیمانی باکوری ئەتلەسی دروست بوو.[٨٨]

لەمیانەی ئیمزاکردنی پەیمانی( برۆکسل) بیرۆکەی سیستەمێکی بەرگری لەنێوان ئەمریکا و وڵاتانی ئەورووپا دەرکەوت.[٨٩] هەروەها وڵاتانی ئەورووپاش زوو بۆیان دەرکەوت کە بەتەنیا ناتوانن لە بەرامبەر بڵاوبوونەوەی دەسەلاتی سۆڤیەت بوەستن بەبێ یارمەتیدانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.[٩٠] لە ١٧/ئادار/١٩٤٨( بیدوبیڤن) سکرتێری نهێنی دەوڵەتی ئەمریکا داوای لە جەنەڕاڵ( مارشاڵ) کرد کە گفتوگۆ و ئامادەکاری بکات سەبارەت بە گەیشتن و ئەنجامدانی ڕێکەوتنامەی فراوانتر سەبارەت بە بەرگری بەمەرجێ ڕێکەوتنی پێشوەختە

لەبارەی سیاسەتی بەرگری دژ بە هەر دوژمنکاریەك، بۆیە ئەم داواكاریە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا بۆئەوەی دەنگی لەسەر بدرێت و رێگە بە ئەمریکا بدات رێکەوتنامەیەك مۆربکات لەکاتی ئاشتیدا لە دەرەوەی سنوورەکەی. بەم جۆرە ئەمریکا ئەفسەرانی خۆی نارده لەندەن بە مەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ وڵاتانی پەیمانی( برۆکسل) و رێکەوتن لەسەر پەیماننامەی باکوری ئەتڵەسی.[91]

فەلسەفەی دامەزراندنی ئەم پەیمانە سەربازیە یەکەم: دامەزراندنی کەمەربەندێکی ئەمنی بە دەوری وڵاتە دیموکراسیەکانی رۆژئاوا. دووەم: گەمارۆدانی یەکێتی سۆڤیەت و کۆمۆنیزم و شوێنکەوتووانی.[92] دوابەدوای پرۆژەی ترومان ئەمریکا هەنگاوێکی تازەی نا بە دامەزراندنی پەیمانێکی سەربازی، ئەم پەیمانە لە بارودۆخێکی سیاسی و ئابووری وادا دامەزرا پاڵی بە وڵاتانی رۆژئاوای ئەوروپا نا بەشدار بن لەناویدا. لە مەترسی سۆڤیەت و دامەزراندنی چەند حکومەتێکی کۆمۆنیستی سەربە سۆڤیەت لە ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ئەوروپا.[93] سیناتۆری ئەمریکی( فاندبرگ) چەند بیرۆکەی بەشداربوونی ئەمریکای لەو پەیمانە دەربڕی لەسەر بنەمای یارمەتی دوو لایەنە لەنێوان ئەمریکا و وڵاتە رۆژئاواییەکانی ئەوروپا، ئەم پەیمانە خۆئامادەکردنێکیش بوو بۆ بەستنی دوو پەیمانی دیکە، یەکێکیان لە رۆژهەڵاتی دوور بۆ ئابلۆقەدانی چین و بزوتنەوە نیشتمانیەکانی ئەندەنووسیا و کۆریا و ڤێتنام( پەیمانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا - سیاتۆ) یەکێکی تریان لە رۆژهەڵاتی عەرەبی و دەوروبەرەکەی وەك( پەیمانی بەغدا) لەدواییدا( سنتۆ)، هەروەها پەیمانی( ئەنزۆس) لەگەڵ ئوسترالیا و نیوزیلەندا.[94]

دوای ئەوەی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا لە ١١/حوزەیران/١٩٤٨ بە زۆرینەی دەنگ پێشنیاری لیژنەی کاروباری دەرەوەی ئەمریکای پەسندکرد و ڕێگەی دا بە حکومەت بۆ بەشداری کردن و بەستنی ڕێکەتننامەی نێودەوڵەتی و هەرێمی. گفتوگۆی تایبەت لە واشنتۆن لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپای خۆرهەلات( کە پێنج وڵات بوون) لەگەڵ کەنەدا دەستی پێکرد بە مەبەستی دامەزراندنی ڕێکخراوی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی.[٩٥]

لە ٤/أبريل/١٩٤٩ وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسە، حەوت وڵاتی تری بەڵگەنامەی دامەزراندنی( پەیمانی باکوری ئەتڵەسی) یان مۆرکردن. کە تیایدا هاتبوو( هەموو ئەم لایەنانە ڕێککەوتوون کەوا هەر دەست درێژیەکی چەکدارانە بۆ سەر هەر یەکێکیان ئەوا دەست درێژی و پەلامارە بۆ سەر هەمووان)[٩٦].

سەرەتا پانزە وڵاتی ئەوروپی تیا بەشداربوون( بەلجیکا، کەنەدا، فەرەنسا، ئایسلەند، ئیتالیا، لۆکسمبۆرگ، هۆڵەندا، نەرویج، پورتوغال، بەریتانیا، ئەمریکا، لەدواییدا یۆنان و تورکیا بوونە ئەندام) وە ئەڵمانیای ڕۆژئاواش ساڵی ١٩٥٤ هاتە ناویەوە. بارەگای سەرەکی ئەم پەیمانە لە( برۆکسل)ی پایتەختی بەلجیکایە.[٩٧]

لەڕاستیدا هۆکاری دروستبوونی ئەم پەیمانە بوونی سەربازی سۆڤیەتی لە وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ئەوروپا و بوونی مەترسی و هەڕەشە لەسەر وڵاتانی ئەندامی پەیمانەکە بەتایبەتی و پاراستنی ئەمنی و ئاسایش و سەقامگیری و بەرەنگاربوونەوەی هەر پەلامار و هەڕەشەیەك بۆ سەر ئەندامان.[٩٨]

ناتۆ لەبەر چەند هۆیەك گرنگی هەبوو، بەر لەهەموو شتێك مایەی دڵساردی و نارەزایی و سۆڤیەتیەکان بوو،و بۆ ڕێبەرانی سۆڤیەت ڕوون و ئاشکرابوو کە ئامانجی شەڕخوازانەی ئەم یەکێتیە عەسکەریە — سیاسیە کە لە کاتی ئاشتیدا

دامەزراوە یەکێتی سۆڤیەتە، وە یارمەتی بەهێزکردنی پێوەندی سیاسی و ئابووری و سەربازی و کۆمەڵایەتی نێوان ئەندامەکانی دەدا، بە وتەی مێژووناس(مایکل کۆرت) تەنیا هەبوونی ئەم پەیمانە هەنگاوێکی سەرەکی بوو بە ئاراستەی جێگیرکردنی جەنگی سارد. وە سەرەتای دەستپێکرنی سیاسەتی ئیحتیوا پێکهێنانی گەورەترین هێزی ووشکانیە لە جیهان.[٩٩]

لەبەرامبەردا سۆڤیەت بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم هەنگاوەی بلۆکی سەرمایەداری ساڵی ١٤/ئایار/١٩٥٥ یەکێتیەکی سەربازی پێکهێنا لەگەڵ وڵاتەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات کە ناسرابوو بە( پەیمانی وارشۆ)( ئەلبانیا، بولگاریا، چیکۆسلۆڤاکیا، ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، مەجەر، پۆڵەندا، ڕۆمانیا، یەکێتی سۆڤیەت)

دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت بە سەرکەوتوویی بۆمبی ئەتۆمی تەقاندەوە بووە مایەی نیگەرانی لای ئەمریکیەکان و وڵاتانی ئەندام لە ناتۆ، چونکە زانیان ئێستا ئیتر ئەوان لەپێشتر نین لە بواری چەك و چۆل لە سۆڤیەت. لە بەرامبەردا ئەمریکا بڕیاریدا بە دارشتن و بەرهەم هێنانی بۆمبی هایدرۆجینی( بالآتر). بەم جۆرە سەردەمی خراپ تێگەیشتن و بەدگومانی و ترس دروستبوو، جیهان دابەش بووبوو بەسەر دوو بلۆك، هەر وڵاتێك باوەڕی بە پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی هەبوو، وە ماف و شەرعیەتی ئەوەیان بەخۆیاندا بە مەبەستی پێشگرتن لە مەترسیەکان دەست وەربدەنە وڵاتانی تر، هەر کامێکیان بەدوای ڕێبەرایەتی کردن و نوێکردنەوەی سیستەمی جیهانیدا بوون، بەدوای جێگیرکردن و چوارچێوەی کاریگەری خۆیاندابوون، جووڵێنەری هەر کامێکیشیان ئایدۆلۆژی و جۆرێك دەست هەبوو کە وای لێکدەدایەوە حەق لەلای ئەوە

ئامانج لەودیوی دامەزراندنی پەیمانی ناتۆ دانانی سیستەمێکی تاکی و کۆمەڵی بوو بۆ پارێزگاری لە هەر پەلامارێك، لە سەرەتادا ترسێك هەبوو کە پەیمانی ناتۆ گۆڕانی بەسەردا بێت و ببێتە ئامرازێك بۆ پاراستنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تەنها، نەك ئەوروپا، ئەمەش لەلایەن جەنەڕاڵ دیگۆڵ بەتایبەت باس دەکرا.

سەرچاوە بەکارهاتووەکان

یەکەم: سەرچاوە عەرەبییەکان:
١- أحمد نوري نعيمي، تركيا و حلف الشمال الأطلسي، أردن، ١٩٨١
٢- الأن نيفيس هنري ستيلكوماجر، موجز تأريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ت: محمد بدرالدين خليل، دار دولية للنشر و التوزيع، قاهرة، ١٩٩٥
٣- بوني ف. ساوندرز، الولايات المتحدة و القومية العربية، ت: سامر خليل كلاس، دار نينوى للدراسات و النشر و التوزيع، سوريا، ٢٠٠١
٤- حسين شريف، السياسة الخارجية الأمريكية إتجاهاتها و تطبيقاتها و تحدياتها من الحرب العالمية الثانية إلى نظام الدولي الجديد، هيئة مصرية العامة للكتاب، مصر، ج٢، ١٩٩٤
٥- حسين شريف، ينابيع المعرفة في السياسة الدولية المعاصرة(١٩٤٥-٢٠٠٣)، مصر، ٢٠٠٣
٦- دروزيل، التأريخ الدبلوماسي، ت: نورالدين حاطوم، دمشق، ١٩٦٢
٧- ديب علي حسن، الولايات المتحدة الأمريكية من الخيمة إلى الإمبراتورية، الأوائل للنشر و التوزيع، ديمشق، ط٢، ٢٠٠٤
٨- رأفت غنيمي الشيخ، أمريكا و العالم في تأريخ الحديث و المعاصر، مصر، ٢٠٠٦
٩- عبدالعظيم رمضان، تأريخ أوروبا و العالم الحديث، مصر، ١٩٩٧
١٠- عبدالوهاب كيالي، الموسوعة السياسية، مؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٩٥
١١- محمد إحسان، الصراعات الدولية في القرن العشرين، أربيل، ٢٠٠٠
١٢- ناهد إبراهيم دسوقي، دراسات في التأريخ الأمريكي، دار المعرفة الجامعية للنشر، مصر، ١٩٩٨
١٣- يواخم فرناو، صفحات مجهولة من تأريخ ولايات المتحدة الأمريكية، لبنان، ٢٠٠٣

دووەم: سەرچاوە کوردییەکان
١- ئاراس فەریق زەینەڵ، مێژووی ئەمریکا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، چاپی یەکەم، چاپخانەی پێوەند، سلێمانی، ٢٠١٠
٢- بریتا بجورنۆلد، جەنگی سارد، وەرگێڕانی هەژار ڕەحیمی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٠

٣- جـان ڕ. مـاتیۆز، سـەرهەڵدان و ڕووخـانی یـەکێتی سـۆڤیەت، وەرگێرانـی: ئەبوبـەکر صـالح، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەولێر، ٢٠١٠

٤- سەلیم حسنی، ڕێبازی سەرۆکەکانی ئەمریکا، وەرگێرانی: سەردار ئەحمەد، سلێمانی، ٢٠٠٩

٥- عەونی عبدالرحمن سبعاوی، مێژووی ئەمریکا، وەرگێرانی: محمد عبدالله کاکەسوور، هەولێر، ٢٠١٠

٦- فریشتە نورائی، مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەمریکا، وەرگێرانی: هەورامان فـەریق کریم، چاپی یەکەم، دهۆك

٧- مەسعود عبدالخالق، مەوسوعەی جودی، هەولێر، ٢٠٠٨

٨- یاسین حاجی زادە و زاهیر محمدی، فەرهەنگی سیاسی ئارەش، هەولێر، ٢٠٠٩

٩- یاسین صابر صالح، ئینسکلۆپیدیای گشتی، سلێمانی، ٢٠٠٥

١٠- کۆمەڵێ نووسەر، چەردەیەك لە کلتووری دیموکراسی ئەمریکا، وەرگێرانی حسن حسین و سـەلام عبدالکریم، سلێمانی ٢٠٠٩

سێیەم: هەفتەنامە:

هەفتەنامەی بەڕوو( پاشکۆی ڕۆژنامەی هەولێر) ژمارە ٣٤ ی ساڵی ٢٠١٠

(١) رأفت غنيمي الشيخ، أمريكا و العالم في التأريخ الحديث و المعاصر، مصر، ٢٠٠٦، ص ١٨٠

(٢) الموقع www.trumanlibrary.org

(٣) جواد قادر،(٣٣)مین سەرۆکی ویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا(هـاری ترومـان)، هەفتەنامـەی بەڕوو، ژ٣٤ ساڵی ٢٠١٠، ل٢٤

(٤) ديب علي حسين، الولايات المتحدة الأمريكية من الخيمة إلى الإمبراتورية، طبعة الثانية، الأوائل للنشر و التوزيع، دمشق، ٢٠٠٤، ص ٢٨٨

(٥) جواد قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤

(٦) یاسین صابر صالح، ئینسکلۆپیدیای گشتی، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٣٣٦

(٧) الموقع www.trumanlibrary.org

(٨) ديب علي حسين، المصدر السابق، ص ٢٨٨

(٩) يواخم فرناو، صفحات مجهولة من تأريخ ولايات المتحدة الأمريكية، لبنان ٢٠٠٣، ص٣١٧

(١٠) آلان نيفنس و هنري ستيل كوماجر، موجز تأريخ ولايات المتحدة، ترجمة: محمد بدرالدين خليـل، دار المعارف، مصر، د.ت. ج٣، ص ٤٣٦

(١١) آلان نيفنس و هنري ستيل كوماجر. المصدر السابق. ص ٤٣٦

(١٢) حسين كنعان، مسقبل علاقات العربية الأمريكية، لبنان، ٢٠٠٥، ص ١٥

(١٣) سليم حسني، سردار عزيز. ڕێبازی سەرۆکەکانی ئەمریکا، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٢٥

(١٤) عونی عبدالرحمن سبعاوی، مێژووی ئەمریکا، وەرگێرانی: محمد عبدالله کاکەسوور، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٢٧٤

(١٥) الموقع www.trumanlibrary.org

(١٦) یاسین صابر صالح، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٦

(١٧) کۆمەڵێ نووسەر، چەردەیەک لە کلتووری دیموکراسی ئەمریکا، حەسەن حسین، سەلام عبدالکریم، ٢٠٠٩، ل ١٦٧

(١٨) بكر أحمد يعقوب، ظهور أمريكا كقوة عظمى و دورها في بلدان شرق الأوسط، أربيل، ٢٠٠٨، ص ١٦٢

(١٩) حسين شريف، ينابيع المعرفة في السياسة الدولية المعاصرة من الحرب العالمية الثانية إلى غزو العراق ١٩٤٥-٢٠٠٣، مصر، ٢٠٠٣، ص ١١٤

(٢٠) بونی ف. ساوندرز، الولايات المتحدة و القومية ا لعربية، ترجمة: سامر خليل كلاس، دار نينوى للدراسات و النشر، سورية، ٢٠٠١، ص ٢١

(٢١) حسين شريف، السياسة الخارجية الأمريكية إتجاهاتها و تطبيقاتها و تحدياتها، مصر، ١٩٩٤، ج٢، ص ٥٧

(٢٢) ئاراز فەریق زەینەڵ، مێژووی ئەمریکا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٢٥٠

(٢٣) عەونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٢

(٢٤) مەسعود عبدالخالق، مەوسوعەی جودی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٧٢٣

(٢٥) محمد إحسان، الصراعات الدولية في قرن العشرين، أربيل، ٢٠٠٠، ص ١٢٩

(٢٦) رأفت غنيمي الشيخ، المصدر السابق، ص ١١٨

(٢٧) عبدالوهاب الكيالي، الموسوعة السياسي، مؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٩٥، ص ١٨٦

(٢٨) عبدالعظيم رمضان، تأريخ أوروبا و العالم الحديث، ج٣، مصر، ١٩٩٧، ص ٢٧٥.

(٢٩) ناهد إبراهيم و دسوقي، دراسات في التأريخ الأمريكي، مصر، ١٩٩٨، ص ١٧٧

(٣٠) عبدالعظيم رمضان، المصدر السابق، ص

(٣١) عوني عبدالرحمن سبعاوي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٢.

(٣٢) فریشتە نورائی، مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەمریکا، وەرگێڕانی: هەورامان فەریق کەریم، چاپی یەکەم، دهۆک، ل

(٣٣) محمد إحسان، المصدر السابق، ص ١٤٠.

(٣٤) عوني عبدالرحمن سبعاوی، سەرضاوةی ثێشوو، ل ٢٧٣.

(٣٥) محمد إحسان، المصدر السابق، ص ١٤٠.

* کۆنگرەی سان فرانسیسکۆ، لە ٢٥/أبریل/١٩٤٥ بە مەبەستی دروستکردنی ڕێکخراوی( نەتەوە یەکگرتووەکان)

(٣٦) محمد إحسان، المصدر السابق، ص ١٤٣.

(٣٧) حسن شريف، ينابيع المعرفة في السياسة الدولية المعاصرة من الحرب العالمية الثانية إلى غز العراق، مصر، ٢٠٠٣،ص ١٣٧

(٣٨) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٥

(٣٩) بریتا بجورنۆڵد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢

(٤٠) جان ئار ماتیوز، سەرهەڵدان و ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، وەرگێڕانی: أبوبکر صالح، هەولێر، ٢٠١٠، ل

(٤١) هەمان سەرچاوە، ل

(٤٢) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٥

(٤٣) عبدالعظيم رمضان، المصدر السابق، ص ٢٨٠.

(٤٤) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٦.

(٤٥) بریتا بجورنۆڵد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦.

(٤٦) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٢.

(٤٧) محمد إحسان، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٠.

(٤٨) بریتا بجورنۆڵد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥.

(٤٩) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٣.

(٥٠) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٧

(٥١) عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٣

(٥٢) عبدالعظيم رمضان، المصدر السابق، ص ٢٧٥

(٥٣) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٦

(٥٤) عبدالعظيم رمضان، المصدر السابق، ص ١٧٥.

(٥٥) نفس المصدر: ص ١٧٦.

(٥٦) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو: ل ٣٦٢.

(٥٧) سایتی ویکی پیدیا.

(٥٨) جان ر. ماتیۆز: سەرهەڵدان و ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، وەرگێڕانی: أبوبکر صالح، هەولێر، ٢٠١٠: ل ٦٥.

(٥٩) محمد إحسان، المصدر السابق، ص ١٣١.

(٦٠) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو

(٦١) یاسین حاجی زادە زاهیر محمدی: فەرهەنگی سیاسی ئارش، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٤٦١.

(٦٢) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٨

(٦٣) عونی عبدالرحمن سبعاوی: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤

(٦٤) عبدالعظیم رمضان، المصدر السابق، ص ١٩٠.

(٦٥) نفس المصدر، ص ١٩١.

(٦٦) نفس المصدر، ص ١٩٢.

(٦٧) محمد إحسان، المصدر السابق، ص ١٤٤.

(٦٨) حسن شریف: المصدر السابق، ص ١٤٢

(٦٩) جان ر. ماتیۆز، سەرچاوەی پێشوو: ل ٦٧.

(٧٠) عبدالعظیم رمضان، المصدر السابق، ص

(٧١) ئاراس فەریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل

(٧٢) عبدالعظیم رمضان، المصدر السابق، ص

(٧٣) جان ر. ماتیۆز، سەرچاوەی پێشوو: ل ٦٧.

(٧٤) عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤

(٧٥) فریشتە نورائی، سەرچاوەی پێشوو، ل

(٧٦) بریتا بجۆرنۆڵد، سەرچاوەی پێشوو: ل ٤٠

* لە ٢٦/یۆلیۆ/١٩٤٧ ترومان بڕیارێکی دەرکرد بە یەکخستنی سوپا و هێزی دەریایی و هێزی ئاسمانی لە چوارچێوەی وەزارەتی بەرگری، وە دامەزراندنی( ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) بۆ دیراسەکردن و هەڵوێست وەرگرتن لە ڕووداو و پێشهاتە سیاسیەکانی دەرەوە، وە دامەزراندنی دەزگای هەواڵگری ناوەندی(C.I.A)

(٧٧) رأفت غنيمى الشيخ، المصدر السابق. ص ١٢٠

(٧٨) عونى عبدالرحمن سبعاوى. سەرچاوەی پێشوو

(٧٩) بریتا بجورنۆڵد، سەرچاوەی پێشوو، ل

(٨٠) عونى عبدالرحمن سبعاوى. سەرچاوەی پێشوو

(٨١) محمد إحسان، المصدر السابق، ص

(٨٢) أحمد نوري النعيمي، تركيا و حلف شمال الأطلسي، الأردن، ١٩٨١، ص ١٥

(٨٣) دروزيل، التأريخ الدبلوماسي، ترجمة: نورالدين حاطوم، دمشق، ١٩٦٢، ص ١٩٣

(٨٤) عەونی عبدالرحمن سەبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٧

(٨٥) أحمد نوري النعيمي، المصدر السابق، ص ١٧

(٨٦) دروزيل، المصدر السابق، ص ١٩٤

(٨٧) عونى عبدالرحمن سەبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٧

(٨٨) دروزيل، المصدر السابق، ص ١٩٤

(٨٩) ئاراس فریق زەینەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٣

(٩٠) عەونی عبدالرحمن سەبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٦

(٩١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٧٧

(٩٢) أحمد نوری النعيمی، المصدر السابق، ص ١٧

(٩٣) الآن نفينز هنري كوماجر، المصدر السابق. ص ٣١٢

(٩٤) عەونی عبدالرحمن سەبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٣

(٩٥) سایتی www.wikipedia.org

(٩٦) بریتا بجورنلۆند، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦

(٩٧) عەونی عبدالرحمن سەبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٢

(٩٨) أحمد نوری النعيمی، المصدر السابق، ص ١٨

(٩٩) حسن شريف، السياسة الخارجية الأمريكية، المصدر السابق، ص ١٣٧

* لە مایۆ/١٩٤٩ ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا ڕێککەوتن دامەزراندنی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی لە بەشی ڕۆژئاوای ئەڵمانیا، لە بەرامبەردا سۆڤیەت کۆماری میللی ئەڵمانیای دامەزراند لە هەمان ساڵدا.

# شازادێکی ناکام و میرێکی جوامێر
# ئەلقاسب میرزای سەفەوی و سورخاب بەگی ئەردەڵان

ئاوێستا رەوەند

**پێشەکی :**

زۆر جار بۆ نووسین ناچار دەبین پەنا ببەینە بەر ژێدەر و ووتار، کە ئاستی نرخیان کەمترە لە سەرچاوەکان.ئەم بابەتە لەو ڕووە گرنگە، سەرچاوەی رەسەن تیایدا بەکارهاتووە.هەر دوو لایەنیش (سەفەوی و ئەردەڵان) گرنگی ڕووداوەکانیان بە هەند وەرگرتووە.لایەنی ئەلقاسب میرزا، شا تەهماسبی سەفەویە (١٥٢٤-١٥٧٦)، کە برای ناوبراوە، بیرەوەریەکانی خۆی نووسیووە.لایەنی سورخاب بەگی ئەردەڵانیش (٩٤٥-٩٧٥ک).کە مەئمون بەگی دووەم برازای ناوبراوە، بیرەوەریەکانی خۆی نووسیووە.ئەم ڕووداوە بۆ بنەماڵەی ئەردەڵان زۆر گرنگە و هەر بۆیەش لە گشت سەرچاوەکانیان ئەم بابەتەیان نرخاندووە.

دوو ئمپراتوریەتی جیهانی ئیسلامی، عوسمانی بە سەرکردایەتی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠ ـ ١٥٦٦ ز)، کە ئارەزووی فراوانخوازی لە ڕادەبەدەری هەبووە.سەفەویەکانیش لە دوای تێک شکان لە چاڵدێران لە ساڵی١٥١٤ز خاوەن پادشایێکی لیهاتوو، داناو ئازایە، کە شا تەهماسبی یەکەمە (١٥٢٤-١٥٧٦ ز).هەردووفەرمانڕەوا بۆ ماوەیێکی درێژ دەسەڵاتدار بووینە.سەردەمی ئەوان پڕە لە کێشە و شەڕ.

هەڵاتنی ئەلقاسب میرزا بۆ لای عوسمانی ئومێدی لیک ترازانی دەوڵەتی سەفەوی خستەبەردەم عوسمانیەکان، ئەوەش هیوایکی دوور لە ڕاستی نە بوو، یاخی بوونەکانی ناو هێزی قزڵباش گەواهی ئەم ڕاستیەیەن، لە لایکی تر شای سەفەوی تەختی کەوتە مەترسی لە لایەن برای.هەڵاتنی شازادەکان هەر لە سەردەمی سوڵتان بایەزیدی دووم
(١٤٨١ـ١٥١٢ ز) دەستی پێکردبوو.بەڵام سەیر لەوە دایە، کە هەموو ئەم هەڵگەڕاوانانە سەرەنجامیان ناکامی بوو.

**بەر لە دەسپێک:ـ**

هەندی ناو لە زمان، سەردەم و شوێنێک دەگۆڕی و دەنووسرێ، کە ئەمەش گرفت بۆ لێکوڵەر دروست دەکا.فەرهەنگی تایبەتی واش لە بەردەست نیە، کە لە کاتی پیویست لە مێژووی میرنشینە کوردیەکان یارمەتیمان بدات.بە ناچاری و بۆ زیاتر ڕوون کردنی هەندی ناو و زاراوە لێکدانەوەیان بۆ دەکەم، کە لە کاتی ڕەخنە گرتنی مێژوویی هاوکارمان بێت.
لە بیرەوەریەکانی شای سەفەوی، کە برای شازادەی هەڵاتوو و لادەرە، بە پێچەوانەی نووسینەکانی دوای سەردەمی سەفەویەیە.شازادە بە ناوی (القاسب میرزا) ناو دەبا و هاوسەردەمی ڕوداوەکانیشە.[1] لە سەرچاوەی تری فارسی سەردەمی شا تەهماسب، کە لە١٠٠٧ کۆچی نووسراوە، لە ڕووداوەکەش نێزیکە و نووسەری دەرباری شازادە بەهرام میرزای برای شا تەهماسبە، هەر بە ئەلقاسب میرزا ناوی تۆمار دەکا.[2] بەڵام لە سەرچاوە یە کی فارسی، کە هاوسەردەمی ڕوداوەکانە، بەڵام لە قەڵەمڕەوی عوسمانی نووسراوە، بە (القاص میرزا) ناوبراوە[3] لە سەرچاوە عوسمانیەکانیش، هەر بە (القاص میرزا) ناوی هاتووە.[4] کە لە وانەیە ئەم ناوە لەلایەن فارسی زانە عوسمانیەکان ولە ژێر

کارێگەری تورکی وایان تۆمار کردبی.بەڵام سەیر لەوە دایە،کە سەرچاوە ئەردەڵانیەکانی فارسیش هەر بە (القاص میرزا) ناوی دەبەن.[٥] چونکە شا تەهماسبی سەفەوی باس لە ناوی برای خۆی دەکاتن، من لە سەر ئەوە رایەم بە ئەلقاسب میرزا ناوی تۆمار بکری.بەدواداچوونم هەبوو لەسەر زیاد بوونی پاشگر (ب) لە فارسی، بەڵام هیچ نیشانەیە ک نیە کە ئەم پاشگرە بۆ بچوک کردن بێت.

قارەمانی دووەمیش ناوەکەی بە دەر نیە لە ئاریشە.برازاکەی بە (سهراب وسهراب بیگ) ناوی دباتن.[٦] شا تەهماسب سەفەوی کە میری ئەردەڵان لە نێزیکەوە دەناسێ بە (سلگان سرخاب) ناوی دەباتن.[٧] پلەی سوڵتان لەلایەن سەفەویەکان بەو میرە نیمچە سەربەخۆیانەی سەر سنووری عوسمانی گوتراوە و بۆ کەم کردنی پلەو پایە و شکۆداری سوڵتانی عوسمانیش بە کاریان هێناوە.[٨] لە شەرەفنامەش بە (سرخاب بیگ) ناوی هاتووە.[٩] لە سەرچاوەکانی ئەردەڵانیش هەر بە (سرخاب بیگ) ناوی هاتووە.[١٠] تەنیا لە سەرچاوە یک کە لە دوای ڕوخانی ئەردەڵانەکان و لە١٢٨٨کۆچی سەبارەت بە ئەردەڵانەکان نووسراوە بە (سرخاب خان) ناو براوە.[١١] چونکە ئەم نازناوەی (خان) کە نازناوێکی فەرمی یە، کە دواتر بە میرتەیمورخان کوڕی سوڵتان عەلی بەگی کوڕی سورخاب بەگ دراوە، بە راستی نازانم کە سورخاب نازناوی خانی هەبوو بێت.[١٢] لە هەندی سەرچاوەی عوسمانی هەر بە (سهراب) ناوی هاتووە.[١٣]، کە نیشانەی تورەیی ئەوان لەم میرە کوردە بە ڕۆنی بەدەر دەکەوێ.وانەبی کە ناوی سورخاب لە ئێران نامۆ بێت، لە ساڵی ٣١٠ کۆچی سەردارێکی سامانی بە ناوی (سرخاب بن وهسودان) هەبووە.[١٤] لە ساڵی ٧١٠ کۆچی (سرخاب) ناوی کێویک بووە لە نێزیک شاری تەوریز.[١٥] لە ساڵی ٩٨٨ کۆچی ئەم ناوە بە قەڵایک گوتراوە، کە لەسەر کێوی سورخاب بووە.[١٦]

منارەی سورخاب لە شاری تەوریز دەیڕوانیە سەر گۆڕستانی تەیمورییەکان.[17]
لە ناوەڕاستی سەدەی نۆی کۆچی لە سەردەمی جهانشای قەرە قوینلو (٨٤١-٨٧٢ کۆچی) گەڕەکی (محلە سرخاب) لە شاری تەوریز هەبووە.[18]
ئەوەنیشانەیە ئەم ناوە نامۆ نەبووە. هەروەها لە ناو ئەردەڵانەکان بۆ جارێکی تر چاومان بە ناوی سورخاب بەگی دووەمی ئەردەڵان دەکەوێ من سورخاب بە ڕاستتر دەزانم، هەرچەند سوهرابیش بە ڕاست دەزانم.

## پەیوەندیەکانی سەفەوی و ئەردەڵان:-

هێرشی سوپای سوڵتان سلێمان خان قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦) بۆ سەر قەڵەمڕوی ئەردەڵان لە ساڵی ١٥٤٠ز بە سوپایەکی ٢٠،٠٠٠ کەسی بە سەرداری ڕۆستەم پاشا. لەوکاتەدا هێزی ئەردەڵان پێکدەهات لە ٨٠٠٠کەسی سوارە و پیادە. ئەردەڵانەکان توانیان بۆ ماوەی دوو ساڵ بەرگری لەخۆیان بکەن. کە دواتر سورخاب بەگ داوای هاوکاری لە شا تەهماسب دەکا، ئەویش سوپایێکی ١٥٠٠٠ سەرباز بە سەرکردایەتی حسێن بەگ ڕەوانەی شارەزوور دەکا و ئەردەڵانەکان بە سەر عوسمانیەکان سەردەکەون.[19] ئەم شەڕە لە ڕۆژی پێنجشەممەی ڕێکەوتی ٢٤ ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٩٤٧ کۆچی (١٥٤٠ز) ڕوویداوە. ٧٠٠٠ لەسوپای عوسمانی و ٣٠٠٠ لە سوپای هاوبەشی سەفەوی - ئەردەڵان دەبنە قوربانی.[20] ئالێرە ئاڵۆزی پەیوەندیەکانی سورخاب بەگ لەگەڵ عوسمانییەکان نیشان دەداتن.

غازی خان برادۆست کاتێک بەرەی سەفەوی بەردەدا و پەنا دەباتە بەر عوسمانی، بە هاندەری سەرەکی شاڵاوی سوپای عوسمانی بۆ سەر شارەزوور دادەنرێ. چونکە برادۆستەکان بە ڕەچەڵەک گۆرانن وپێش دەسەڵاتداری ئەردەڵانەکان لە شارەزوور ئاکنجی بووینە دوژمنایەتی کردنیان دەگەڕێتەوە

سەر قەڵەمڕەوی کۆن.[21] غازی خان دەڤەری مەریوان داگیر دەکا، کە بەشێک بوو لە ئەردەڵان.بەڵام کە دووبارە بە خۆی و هۆزەکەی هەواداری لە سەفەویە دەکا، هێرش دەکاتە سەر حاجی شێخ بەگی بابان، کە لە فەرماندەکانی بن دەستی ئەردەڵان بوو، دووبارە کێشە لە گەڵ ئەردەڵانەکان دورست دەکاتن.دواتر غازی خان لە لایەن (القاسب میرزا) و بە فەرمانی شا تەهماسب سەری دێتە بڕین.[22] ئەوە ش دەستکەوتێکی گەورە بوو، کە ئەردەڵانەکان چاوەڕیان نەدەکرد کە دوژمنێکی دێرین و دراوسی ئەوهایان لە ناوبچی.ئەڵبەتە ئەوەش ڕێ خوشکەر بوو، کە سورخاب بەگ و ئەلقاسب میرزا وەک دوست بڕوانە یەکتر.وا باوە کە دۆژمنی دۆژمنم دوستمە.شایانی باسە لەو سەردەمە بەرە گۆڕین کارێکی باو بووە، هەر وەک چوون موکریەکان لە ١٥٤١ ز لایەنی عوسمانیان بەجی دەهێڵن و روو دەکەنە شا تەهماسب و لە شەرێکی خۆێناویدا لەگەڵ سوڵتان حسێن بەگی بادینان هەر سێ کوڕەکەی رۆستەم کوڕی بابا عومەری موکریان دەکوژرین.[23] گشت هێزەکان بە دوای بەرژەوەندی خۆیان بووینە.

بیگە بەگ ئەردەڵان بەشداری شەڕی چالدیرانی نە کرد و دواتر بەشداری هیچ لە شاڵاوەکانی شا و سوڵتانی نە کرد.بوونی شەڕ لەم دەڤەرە لە نێوان عوسمانی و سەفەوی، رێگای ئەوریشمی خستە مەترسی و ئەورویا بە دوای دۆزینەوەکانی دەریایی بوو تا کەل و پەل بگوازیتە ئەورویا.کوردستان بیبەش بوو لە قازانجەکانی رێی ئاوریشم وباری ئابووری تێکچوو.ئەردەڵانەکان و لەبەر ناچاری لە نێوان هەردوو زل هێز یاریان دەکرد، هەر جارە و پشتگیری یەکیکیان دەکرد.[24] لە ساڵی ١٥٣٣زسوڵتان سلێمان خان هێرش دەکاتە سەر عێراق.زۆربەی سەردارەکانی هۆزی تەکلوی قزڵباش هەڵگەڕاوە لە شا هاوکاریان کرد، بیجگە لە محەمەد خانی تەکلو هاوکاری شا بوو.[25] هەرچەند

هۆزی تەکلو ڕۆڵێکی سەرەکیان هەبوو لە جێگر کردنی شا تەهماسب لەسەر دەسەڵات، بەڵام دواتر هەر ئەو بوو کوشتاری کردن.ئولامە تکلو فەرمانداری ئازەربایجان بە مەبەستی وەرگرتنی پلەی سەرۆکایەتی هۆز ڕوو دەکاتە قەزوینی پایتەخت، لە زەنجان بەر هێرشی سوپای شا دەکەوی.بە ناچاری بەرەوو تەورێز دەکشێ و دواتر پەنا دەباتە بەر سوڵتان سلێمان خان[٢٦] کە هۆزێکی قزڵباش لە سەفەویە هەڵگەڕی جیا کورد چیکردووە و چوون جوڵاوەتەوە.هێرشە کەی سوڵتان کە بە مەبەستی کەم کردنی گوشارە لەسەر ئوزبەک خان سەرکەوتوو نەبوو.[٢٧] لە ساڵی ١٥٣٧ ز سوڵتان حسێن میری بادینان لەسەر فەرمانی سوڵتان هێرش دەکاتە سەر ئەردەڵان و شارە قەڵای زەڵم پایتەختی ئەردەڵان گەمارۆ دەدا ودواتر بەسەر مەئمون بەگی دووەمی ئەردەڵان کوڕی بیگە بەگ سەردەکەوێ و بە بارمەتە ناو براو لای خۆی گل دەداتن.[٢٨] سوڵتان بۆ تەنبی کردنی موکریەکان، کە بەرەیان گوڕی بوو و چو بوونە ژێر چەتری شا تەهماسب.هێزێکی کوردی رادەسپێری بۆ شەڕ.سەرەنجام هێزەکانی توانیان صارم موکری کوڕی سەیفە ددین بکوژن.[٢٩] ئەوە وا نیشان دەداتن کە تەپڵی جەنگ پێش لە هەڵاتنی ئەلقاسب میرزا لێدرا بوو.

## هەڵاتنی شازادە بەرەوو عوسمانی :ـ

بارودوخی ئەوروپا لە ساڵی ١٥٤٥ ئاڵوز بوو، کێشە لە نیوان لایەنگیرانی پروتستان بە بەشی لوتری و تسوینگلی.هەروەها لوتر و پاپا، گەیشتبووە ئاستی لێکدان وە شەڕ.شەڕی نیوان شارلی پێنجەم ئمپراتوری ڕومانی پیرۆز و شا فرانسوای یەکەم شای فەرانسە دوو هێزی ئەوروپای بە خۆی مژول کردبوو.بەستنی رێککەوتنامە لە نیوان سلێمانی قانونی و فرانسوای یەکەم مەودای دابووە سلێمان خان، کە بەرەی ڕۆژئاوا بۆ ماوەیە ک فراموش بکا.لە

ساڵی ١٥٤٧- ١٥٤٨ پاپا پاولوس سێ یەم پشتگیری خوی لە ئمپراتور شارلی هەڵپسارد.بە بیانوی دەست تیوەردانی ناوبراو بۆ ناو کاروباری کەلیسا.[٣٠] هەر بوویە سوڵتان سلێمان بە دڵنیاییەوە رووی کردە بەرەی رۆژهەڵات.

لەساڵی ١٥٤٤زبۆ جاری یەکەم ئەلقاسب میرزا یاخی دەبی، دواتر لەبەر دایک و کورەکەی شا دەیبەخشی و لە دەسەڵاتداری شیروان دەیهیڵی.[٣١] لە ساڵی ١٥٤٧زبۆ جاری دووەم ئەلقاسب میرزا، هەرێمی شیروان بە جێ دەهێڵی، لە شا تەهماسبی برای جودا دەبێت، ئاڵای یاخی بوون هەڵدەکا.[٣٢] ئەلقاسب میرزا لە شیروان لە رێ دەشتی قەپچاق خۆی دەگەیێنێتە نیمچە دۆرگەی کریمە و لەوێش بۆ ئەدرنەی بن دەستی عوسمانی و دواتر رێی پێدەدری لە ئەستامبول چاوی بە سوڵتان بکەوی.[٣٣] لە ساتە وەختێک ئەم یاخی بوونە روو دەدا، کە شا تەهماسب حەیران دەمێنی لە بەرامبەر ئەم یاخی بوونە بێ هۆیە دا.خۆدی شا تەنیا هۆکارێک، کە بە گرنگ دەزانی و دانی پێدەنی، کە برا خۆشەویست و ئازێزەکەی بۆ یاخی بووە.ئەویش ئەوەیە چەندین جار سەرکونەی کردوە لە بەر زیادە رەوی لە مەی نوشین.شایانی باسە شا تەهماسب شکەستی سوپای قزڵباش لە چاڵدێران لە١٥١٤ز لە بەر زیادە رەوی مەی نوشین دەزانی و ئەم کردەوەی قەدەغە کردبوو[٣٤] نابی ئەوەش لە بیر بکەین کە شا تەهماسب زۆر دەمارگیر بووە لە رووی ئایینی.ئەلقاسب میرزا بە هاوکاری عوسمانیەکان قەڵای وان دەگرێ، کە سەنگەری پتەوی بەر شاڵاوی هێزی عوسمانی بۆ سەر ئازەربایجان بوو.پەنا بردنی قزڵباشە ناڕازیەکان بۆ لای ئەلقاسب میرزاش پڕ مەترسی بوو بۆ سەفەویە، کە تاقە هێزی سەربازیان لەو کاتە دا قزڵباشەکان بوون.[٣٥] لە مانگی رەجەبی ساڵی ٩٥٤ کۆچی (١٥٤٧ز) لە دوای تیکشکانی هێرشی ئولامە تەکلو بۆ سەر قەڵای وان، فەرماندەی قەڵا ئەمین بەگی مەحموودی شەوانە بە گوریس لە شورەی دیوار

دێتـە خـوار و خـۆی رادەسـتی ئـەلقاسب دەکـا و کلیلـی قـەڵای دەخاتـە بـەر دەستی،دواتر قەڵاکانی سوڵتان کیپاینی، ئامیق، سێ ئاوان، جـرم، بیـدکار، بارگر، روسنی، چل و تەنوزە خۆیان رادەست دا، سـەرەنجام ٤٣ قـەڵا خۆیـان بە دەستەوە دا.[٣٦] بە مەش ئازەربایجان واڵا بوو بەرامبـەر هـەر هـەڵمـەتێکی سەربازی، هەر بۆیەش دواتـر شـا تـەهماسب بڕیـاری دا پایتـەخت بۆ شـاری قەزوین رابگوێزێ.ئەلقاسب میرزا هەتا لەگەڵ ئولامە تەکلوی قزڵباشـی کـە لـە ساڵی ١٥٣٤ لە شا تەهماسب هەڵگەڕا بوو، کە لە پەنای عوسمانیەکـان دەژیـا رێکدەکەوێ.[٣٧] شـاڵاوێکی خۆینـاوی دەباتـە سـەر عێراقـی عـەجـەم، لـەوێـش شێراز و شوشتەر ڕادەماڵی.کـوڕی بـەهـرام میـرزا، کـە برازایـەتـی بـە ئـەسـیر دەگری و ڕاپێچی دەکا بۆ بەغدا.[٣٨] ئەلقاسب میرزا ئەسفەهان، قوم و کاشـان بەر شـاڵاو دەدا و تاڵانیـەکـان هـەنـاردەی دەربـاری عوسـمانی دەکـاتن.[٣٩] لـە ساڵی ١٥٤٨ ئسکەندەر پاشا بە هاوکاری حەسـەن بـەگـی مـەحـموودی بـورای حاجی بەگی کوڕی بەهلول بەگی دۆنبەلی، کە سەرداری خـۆی بـوو و یـەکێـک لـە سـەردارە ئازاکـانی شـا تـەهماسـب دەهاتـە ژمـاردن، لـە دوای خیانـەتـی هــاوســـەرەکـــەی کـــە دەروازەی قـــەڵای خـــۆی لـــەبـــەرامبـــەر بـــە بـــرای دەکاتەوە.سەرەنجام عوسمانیەکان دەست بەسەر قەڵا دەگرن و سـەری حـاجی بەگی دۆنبـەلـی دەبـڕن و بـۆ لای سـوڵتـانی رەوانـە دەکـەن.[٤٠] شـاتەهماسب لەبەرامبەر بە سوپای عوسمانی سیاسەتی زەویە سووتاوەکە بەکار دەباتن، بـە فەرمانی ئەو گشت کاریزەکانی تەوریز پڕ دەکری، تا ئەو ئەندازەیە ئاو بـەشـی خواردنی خەڵکەکەش ناکاتن.لەبەر بی ئاوی لە مـاوەی چـوار ڕۆژ پێـنج هـەزار ئەسب و حوشتر لـەنـاو دەچـن.سـوڵتان ناچـار دەبـی شـار بـەجـی بهێڵـی.[٤١] شکەستی شاڵاوەکانی شازادە بۆ سەر ئێران لـە سـاڵی١٥٤٨ز، ڕۆسـتەم پاشـا وەزێری عوسمانی دەگەێنێتە ئەو ڕایە،کـە نـاوبراو هـیچ سـوودێک بـە دەربـاری

عوسمانی ناگەیێنی.[42] ڕۆستەم پاشا (صدر اعظم) و زاوای سوڵتان، کە مێردی کچی سوڵتانە لە هاوسەرە خۆشەویستەکەی، کە بە (خورەم یا روکسانا) ناسراوە.شایانی باسە ئەم سەرۆک وەزیرە و هاوسەری سوڵتان پێشتر گومانیان خستە دڵی سوڵتان سلێمانی قانونی، کە گوایا شازادە مستەفای کوڕی سوڵتان، لە دژی باوکی پیلان دەگێڕی.توانیان وا لە سوڵتان بکەن شازادە، کە پیاوێکی ئازا، لیهاتوو، خۆشەویست لەلای سوپا و خوێندەوار بوو.بە فەرمانی سوڵتان بکوژرێ.[43] جا هەر ئەم سەرۆک وەزیرە دڵی سوڵتان لە شازادە زویر دەکا.فەرمان دەداتە محەمەد پاشا والی بەغدا،کە ئەلقاسب میرزا دەبێ سنووری عوسمانی بە جێ بهێڵێ وئەگەر قایل نەبوو دەبێ بکوژرێ.

ئەلقاسب میرزا بە ئاگادار بوون لەم پیلانە، هێزەکانی بەرەوو ئەردەڵان دەکێشی و خۆی لە پیلانی عوسمانی رزگار دەکا.[44] وەک باس کرا سوڵتان لەژێر کاریگەری پیاوانی دەربار هەڵویست دەگۆڕی.سەید میر عەزیز نوێنەری ئەلقاسب میرزا کە تالانیەکانی هێرش بۆ سەر ئێران بۆ ئاستانەی بردبوو.سوڵتانیش ناوبراوی بە شەمشیر و خەفتان خەلات کردبوو و ڕەوانی لای شازادەی کردبوو، بەڵام لە ڕەها (ئورفا) بەند و تالان دەکرێ.سوڵتان بەوەش نەوەستا وفەرمانی خنکاندنی نەزەر عەلی بەگ و کوڕەکەی کە سەرداریکی شازادەبوو و حوکمداری سیوەرک بوو دەداتن.[45] دەگوترێ هۆکاری کوژرانی باڵیوزی ئەلقاسب میرزا، هەرچەند تالانییەکانی ئەسفەهانیشی پێبووە، لەبەر حەسوودی کاربەدەستانی دەربار بووە.گومان دەخەنە ناو دڵی سوڵتان، ئەویش فەرمانی کوشتنی باڵیوزدەداتن.[46] بەڵام ئەوە خوی سوڵتان سلێمان بوو.لە دوای هەڵمەتە سەرنەکەوتووەکەی لە ساڵی ١٥٣٣ ز، ئسکەندەر چەلەبی دەفتەردار و ئیبراهیم پاشا والی حەلەب، کە بە هاندەری

ئەم هەڵمەتە سەرنەکەوتووەی سەر تەوریز دەزانی لەناو دەباتن.[47] سلێمان خان ئوباڵی هەر سەرنەکەوتنێکی خۆی دەخستە شانی یەکیک.

**گەمارۆی ئەلقاسب میرزا و هێرش کردنە سەری :**

هەواڵانەکانی پشتگیر نەکردنی لەلایەن سوڵتان گەیشتە ئەلقاسب میرزا، ڕاوێژ بە قایتمز برای سورخاب بەگ دەکا،کە سەرداری سەنجەقی قەرەتەپە و بابیلان بوو، لە هەڵمەتی سەر ئێرانیش شان بە شانی شازادە شەڕی کردبوو، کە پەنا ببەنە بەر سورخاب بەگی برای.قایتمز[48] سورخاب بەگ دەسەڵاتداری دەڤەرەکانی نوی، مەریوان، تنورە، هەورەمان، کلو، کلاس و نشکاف بوو لە میرنشینی ئەردەڵان.[49] متمانە بوونی شازادە بە ڕای ئەردەڵانیەکان دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندییە کی دوور و درێژە کە پێشتریش باسی لێکرا، هەروەها ناچار بووە پەنایان بۆ بباتن.

هێزەکانی عوسمانی هێزەکانی ئەلقاسب میرزایان گەمارۆ دا، هێزەکانی میر میرانی ئامەد لە هەولێر دادەبەزن، هێزەکانی محەحەد پاشا میر میرانی روملی لە مووسل دامەزرابوون.بۆداق بەگ باشی ئاجق لە کەرکوک سەنگەری گرتبوو.والی بەغدا بە هێزەکانی کەوتنە ڕێ.لەشکری بیگە بەگی ئەردەڵان لە قەڵای نۆی، کە بە سەر دەربەندی بەگ باسانی دەیڕوانی سەنگەری گرتبوو.ئومیدی دەرباز بوونیان لە شازادەیان گرتبوو.[50] لە ئاستانە قەرە عەلی چاوش قونیەلی بە مەبەستی دانوستاندن سەردانی شازادەی گەمارۆ دراو دەکاتن.شازادەش (ئای دوغمش) لە سەردارەکانی لەگەڵ ناوبراو ڕەوانی ئاستان دەکاتن، بەڵام سوڵتان فەرمانی رووت کردن و هەڵواسینی باڵیوز دەداتن، کە وانیشان دەدرێ کە دوو را هەبووە لە دەرباری عوسمانی.یەکەمیان لەگەڵ شەڕ و ئەوی تر لەگەڵ ئاشتی بووە کە سەر ناکەون.[51] بەمەش تەنیا شەڕ لە

چاوەڕوانی شازادەی ناکام دەبێ.لەنامەیەک کە ئاراستەی بیگە بەگی ئەردەڵان دەکاتن، کە پەنای پیبداتن، ناوبراو ڕەتی دەکاتن.شازادە بۆ دەرباز بوون لەم کارەساتە بە نیاز بوو لە ڕێی دەربەندی دەرتەنگ ڕوو بکاتە لووڕستان.بەڵام وەزیر محەمەد پاشا بە هێزێکی برۆسکە ئاسا لە ڕێ قەرەداغ و لە ئاقف توت کەلوپەلەکانی شازادە دەگرێ و بەشێک لە سۆپاکەی لەناو دەباتن.ئەلقاسب میرزا بە ناچاری ڕوودەکاتە چغان لە نێزیک قەڵای قزڵجە.[٥٢] بیگە بەگیش بە هێزەکانی (علم الدین)ی کوڕی میری قەڵای نوی، لە دەربەندی بەگ باسان زەبرێکی کوشەندەی لە هێزە ماندوەکەی شازادە دەوەشێنێ.ئەلقاسب میرزا ئازایانە خۆی لەم بوسەیە ڕزگار دەکاتن و ڕوو لە قەڵای مهرەبان (مەریوان) دەکات، بە نیازی گۆڕێنی نەخشەی کشانەوەی بۆ دەڤەری شیروان، لە ڕێ (لواء) بابان، ورمێ،قەڵای کوکرچینلیک،چقورسو و قەرەباغ خۆی بگەینیتە دەڤەری شیروان.[٥٣] بە بەڕێ کەوتنی شا تەهماسب لە تەورێز بەرەوو شارەزوور و دابەزینی لە مێرگەکانی تەخت سلێمان، ئەم نەخشەیەش پوچەڵ دەبێت.[٥٤] بە دەرکەوتنی هێزێکی ٢٠٠٠٠ سەربازی بەهرام میرزا، کە قین لە دڵیشە لە ئەلقاب میرزای برای، لە بەر بە ئەسیر بردنی کوڕی.ئەم نەخشەیە سەر ناگری.پەلەماردانی قەڵای مەریوانی لەلایەن هێزەکانی بەهرام میرزا.ژمارەیێکی کەم لە یاران لەگەڵ ئەلقاسب میرزا دەمێنین.گشت نەخشەکانی شازادە شکەست دەهێنن لە گەیشتن بە شوێنیکی ئارام، بە ناچاری پەنا دەباتە ناوچەی سۆرانی ژێر دەسەڵاتی سورخاب بەگ.پێشتر سورخاب بەگ لە نامەیێکی نەهێنی دا بە شازادەی داماو ڕادەگەێنی، کە تاکە ڕێگای ڕزگاری ئەوەیە کە ئەو تکاکار بێت لە لای شا تەهماسب، کە کەسێکی متمانە کراوئامادە بێت و بەڵینی بەخشین بداتن لە

سەر زمانی شا و سوێندی شا دووبارە بکاتن لە سەر بەخشینەکە تا ئەلقاسب میرزا رزگاری ببێ.[55]

سورخاب بەگ قەڵای مەریوان لە دەست دەدا و قەڵا دەکەوێتە بن دەستی بەهرام میرزا و ئەم قەڵایە ویران دەکرێ.[56] قەلەمرەوی سورخاب بەگ بە گشتی لە دەستی دەچێ، لە بەرامبەر شاڵاوی بەهێزی بیگە بەگی ئەردەڵان.سورخاب بەگ و ئەلقاسب میرزا پەنا دەبەنە شورەی بڵندی قەڵای(مشعلە یان شبلە) زیانی مادی و گیانی لە خەڵکی قەلەمرەوی سورخاب بەگ دەکەوێ.کە زۆر قورس بووە.ئەم ڕوداوە دەبێتە هۆی تێک چوونی پەیوەندیەکانی کوڕانی مەئمون بەگی یەکەمی ئەردەڵانیش.بیگە بەگ نامەیێک ئاراستەی سورخاب بەگ دەکاتن بۆ ڕادەسدانی شازادە، لە وەڵامدا سورخاب بەگ دەڵێ : من سوێندم خواردووە کە بیپاریزم و خیانەتی لێ نەکەم و ڕێگری نەبم لە چوونی.[57] ئازایەتی و جوامیری سورخاب بەگ لەم ڕوداوانە دیارە و جێگای هێچ گومانیک نییە.دانوستاندنی لەگەڵ دەرباری سەفەوی توانا و کارامەیی ئەو نیشان دەدا.بەڵام ئازایەتی و بیباکی ئەلقاسب میرزاش لەم نەهامەتیەش بەدەر دەکەوێ، کە چوون نەخشەی کێشاوە و دڵسارد نەبووە، خۆی نەسپاردووتە سەرنوشت و نا ئومید بێت.خاڵی هاوبەشی ئەم دوو سەرکردیە، لە دانوستاندن، شەڕکردن، نائومید نەبوون وبیباکانە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ڕووداوەکان بەر چاوە.

وا نەبێ ئەلقاسب میرزا بیری لە دانوستاندنی نەکردبێ.چونکە هێزەکەی لەلایەن عوسمانی و سەفەوی بە تەواوی گەمارۆ درابوو.نامەیە ک بە ناوەڕۆکی خۆ بە دەست دانەوە و تکا کاری لە بەخشێنی ڕادەستی (بدیع الزمان) کورە ئەسیرەکەی بەهرام میرزا دەکا، لەگەڵ میرزا باقری هاوڕێی دێرینی ڕەوانەی دەرباری شا تەهماسب دەکاتن، بەڵام شا هێچ وەڵامێک ناداتن و بێ دەنگ

دەبێ.لە کاتێک کە هێزەکانی ئەلقاسب میرزا هێشتا لە ئامادەیی و شەڕ دان.[58] سورخاب بەگ لە نامەی تکا کاری بۆبەخشێنی شازادەی یاخی، داوای هاتنی شا نعمەت ئەڵڵای قەهستانی، کە زاوای شایە دەکاتن، بە مەرجێک کە شا سوێند بخواتن، کە ئەلقاسب میرزا نەکوژێ.ئەوجا ئەو شازادە ڕادەستی ئەوان دەکا.شاش بە هاتنی نامەی میرزادەی ئەردەڵان کڕنوش بۆ خوا دەباتن بۆ ئەم سەرکەوتنە.وەڵامی سورخاب بەگ دەداتن کە شازادە گیانی پارێزراوە ئەگەر خۆی رادەست بداتن.[59]

پرسیارێک لە خومان دەکەین بۆ شا تەهماسب لە وەڵامی تکا کاری سورخاب بەگ، بەڵێنی بەخشین دەدا، پێم وایە بڕوای تەواوی بە وەفاداری سورخاب بەگی هەبووە، بەباش نەزانیوە سەردارێکی وا لە خۆی نائومید بکا و ئەلقاسب میرزای نائومید بخاتە بەر دەستی چارەنووسی نادیار.سورخاب بەگ بەم کارەی توانی ئاسایش بۆ هەرێمەکە بە دەست بهێنێ و ببێ بە خاوەن متمانەی شا تەهماسب.بە ڕادەستدانی ئەلقاسب میرزا بە دەرباری سەفەوی.

هێزەکانی عوسمانیش دەستیان دایە کشانەوەی و مەئمون بەگی دووەم کوڕی بیگە بەگ، کە توانای بەرگری لە بەرامبەر سورخاب بەگی نەبووە.بە ناوی بەخشێنی پلە بانگهێشتی ئستامبول دەکەن، هێزەکانی عوسمانیش ئارەزووی شەڕیان لەگەڵ سەفەویە نامێنی چ لەبەر کەمی هێز یا هەر هۆکارێکی تر بێت.[60] سورخاب بەگ دەست دەخاتە سەر قەڵەمڕەوی مەئمون بەگی دووەم و محەمەد بەگی برای و بەمە جارێکی تر میرنشینی ئەردەڵان یەک دەخا.[61]

باس لەوەش دەکرێ دەرباری سەفەوی ساڵانە بڕی هەزار تومان وەک خەڵات بە سورخاب بەگیان داوە.[62] وەک لە شەرەفنامە هاتووە هەر سەد تۆمان بەرامبەر دوو سەد هەزار ئاقچەی عوسمانی بووە،کە بڕی هەزار تومان دەکاتە بڕی دوو مێلیۆن ئاقچەی عوسمانی.([63] کە پارە یە کی زۆر بووە لەو سەردەمەدا.

**کۆتایی دوو قارەمان:ـ**

سەرەنجام ئەم ڕووداوە زۆر خوێناوی بوو.سەرچاوەکان هاوڕان، کە بە گەیشتنی ئەلقاسب میرزا بۆ لای شا

تەهماسب بەند دەکرێ و لە بەندیخانەی(قەهقەهە) بەند دەکرێ و لە دوای ساڵێک لە سەر دیوار فڕێ دەدرێتە خوارەوە و دەکوژرێ.[٦٤] بەڵام ئەگەر سەیری بیرەوەریەکانی شا بکەین کوژرانی شازادە و شوێنەکەی جودایە و نووسیوویەتی: ((دوای چەند ڕۆژ، بە ئەلقاسب میرزام گوت: خوا گەورەترە لە خوانکاری تۆ، لە ژێر چاودێری پاسەوانەکان وبە بەند کراوی ڕەوانەی قەڵای ئەلەموتم کرد و لە دوای چەند ڕۆژێک چەند پاسەوانێکی داخ لە دڵ لە بەرامبەر خوێنی ڕژاوی باوکیان کە لەسەر دەستی ئەلقاسب میرزا ڕژا بوو، لە دیواری قەڵای ئەلەموت هەڵی دەهاوێنە خوار)).[٦٥] ئالێرە پیلانگێڕی شا و بێ وەفایی ئەو لە بەرامبەر بە سوێندی نیشان دەداتن.

میرنشینی ئەردەڵان وا بە ئاسانی لە ژێر سەرکردایەتی سورخاب بەگ یەکناگرێ.سوڵتان سلێمانی قانونی لەساڵی ١٥٥٠ز، پەیام دەداتە بیگە بەگ بۆ لەناو بردنی سورخاب بەگ.سێ مانگ سورخاب گەمارۆ دەدرێ و تا هێزەکانی سەفەوی دەگەنە لای.بیگە بەگ لەدوای شەڕێکی خوێناوی پاشەکشی دەکا.لە ساڵی ١٥٥٤زهێزەکانی عوسمان پاشا هەڵمەت دەباتە سەری، دووبارە بە هاوکاری هێزەکانی سەفەوی ڕزگاری دەبێت لە لەناوچوون.دواتر مەئمون بەگی دووەم کوڕی بیگە بەگ، بە هاوکاری هێزەکانی دیاربەکر،حەلەب، قەرەمان، مەرعەش، سیواس و بەغدا هێرش دەکەنە سەری و سەرناکەون.[٦٦] لە سەر دەستی سورخاب میرنشینەکە یک دەگرێ

شایانی باسە لە ساڵی ١٥٥٥ز لە ڕێکەوتنامەی ئەماسیا سەفەوی و عوسمانی ڕێکدەکەون.[٦٧] سورخاب بەگ قەڵاکانی (مشعله و شمع ایران " شمیران")

لەدەست دەدا، نۆ سەرۆک هۆز و قەڵاکانیان سورخاب بەگ بەجێ دەهێڵن و ڕوودەکەنە عوسمانی.یان بە واتەیە کی تر قەڵاکانیان بەر بەشی عوسمانی دەکەون.تەنیا قەڵای مهرەبان بۆ دەمێنێ.ئاشتی بۆ ماوەیەک باڵ دەکێشی بە سەرناوچەکە.[٦٨] بەڵام جوامێری لەبەرامبەر بە بەرژەوەندی دوو زلهێز مانای نیە.قەلەمڕەوی میر نشینی ئەردەڵان بەر تەسک دەبێ و ئەردەڵانەکان توانای خۆیان بۆ ماوەیک لە دەست دەدەن.

**پەراویزەکان:**

١ـ صفوی شاه طهماسب بن اسماعیل، تذکره شاه طهماسب، بامقدمه امر الله صفری، انتشارات شرق ، چاپ دوم ،تهران،١٣٦٣هـ.ش،ص٢١.

٢ـ افوشتەای نطنزی محمود بن هدایت الله، نقاوة الاثار في ذكر الاخيار در تاریخ صفویه ، به اهتمام دكتر احسان اشراقی، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی،چاپ دوم،تهران، ١٣٧٣ ش،ص ٩٦.

٣ـ بدلیسی امیر شرف خان، شرفنامه، بامقدمه محمد عباسی،نشر حدیث، چاپ سوم،تهران١٣٧٣ش،ص١٢١.

٤ـ پچوی ابراهیم ، تاریخ پچوی ،مطبعه عامره ، اسلامبول ، ١٢٨٣ ، جلد اول ، ص ٢٧٦ .

٥ـ قاضی ملا محمد شریف، زبده التواریخ سنندجی،به کوشش محمد رئوف توکلی،انتشارات توکلی،تهران،١٣٧٩ش،ص١٦.

٦ـ مأمون بك بن بیگه بك ، مذكرات مأمون بك بن بیگه بك ، ترجمه محمد جمیل الروژبیانی و شكور مصطفى،المجمع العلمي العراقي الهيئة الكردية، بغداد، ١٩٨٠ م ، صص٦٤ ـ٧٣ـ٦٦.

٧ـ همان ، صفوی شاه طهماسب بن اسماعیل ، ص ٦٢ .

٨ـ میراحمدی دکترمریم،تاریخ سیاسی واجتماعی ایران در عصر صفویه، موسسه انتشارات امیر کبیر،تهران،١٣٧١ش،ص١٤٣.

٩ـ همان، بدلیسی امیر شرف خان،ص١٢١.

١٠ـ همان، قاضی ملا محمد شریف، ص١٦؛ ناشناس، تاریخ کرد، کتابخانه ملی ایران،تهران، شماره ف/٢٢١٣، برگ١ ؛وقایع نگار کردستانی علی اکبر، حدیقه ناصریه،بامقدمه محمد رئوف توکلی، تهران،١٣٦٤ش،ص١٢٠.

١١ـ بابانی عبدالقادر ابن رستم،سیر الاکراد،بکوشش محمد رئوف توکلی،تهران، ١٣٦٦ ش،ص٤٠.

١٢- اردلان مستوره ، تاريخ الاكراد ، ويرايش جما ل احمدى آيين ، انتشارات اراس ، اربيل ، ٢٠٠٥ م ، ص ٤٣ .

١٣ بچوى ابراهيم افندى بن عبد الله دفتردار رومى ، تاريخ پچوى ، جلد اول ، ص ٢٧٦.

١٤ــ محمد بن جعفر الزشخى ابوبكر،تاريخ بخارا،ترجمه ابو نصر احمد بن محمد بن نصر القبادى،انتشارات توس،ص٣٦٩.

١٥ــابوالقاسم عبدالله بن محمد القاشانى،تاريخ اولجايتو،به اهتمام مهين همبلى،شركت انتشارات علمى و فرهنگى،چاپ دوم ،تهران،١٣٨٤،ص١١٦.

١٦ ـ تركمان اسكندر بيگ ، تاريخ عالم آراى عباسى ، موسسه انتشارات امير كبير ، چاپ چهارم ، تهران ، ١٣٧٨ ، جلد دوم ، ص ٨٢٦ .

١٧ــ نادر ميرزا قاجار،تاريخ و جغرافى دار السلطنه تبريز، مقدمه و تصحيح و تحشيه غلامرضا طباطبانى،انتشارات ستوده، تهران،١٣٧٣،ص٩٩.

١٨ ـ دكتر حسين مير جعفرى، تاريخ تحولات سياسى،اجتماعى، اقتصادى و فرهنگى ايران در دوره تيموريان و تركمانان،سازمان مطا لعه و تدوين سمت ،چاپ پنجم، اصفهآن، ١٣٨٥ ،ص٢٥٥.

١٩ــ سنندجى ميرزا شكر الله، تحفه ناصرى، مقابله دكترحشمت الله طبيبى،موسسه انتشارات امير كبير،تهران،١٣٦٦ش،صص٩٧ـ٩٨.

٢٠ـ مردوخ كردستانى محمد ، تاريخ مردوخ ، انتشارات غريقى ، چاپ دوم ، سنندج ، ١٣٥١ ، جلد اول ، صص ٩٥،٩٦ .

٢١ـ همان ، بدليسى امير شرف خان ، ص ٣٨٢ .

٢٢ـ المصدر السابق،مأمون بك بن بيگه بك،صص ٢٤ـ٢٩ـ٣٤ـ٣٥.

٢٣ـ همان، بدليسى امير شرف خان، صص٣٧٥،٣٧٤.

٢٤ـ اردلان شيرين ، خاندان كرد اردلان ، مترجم مرتضى اردلان ، نشر تاريخ ايران ، تهران ، ١٣٨٧ ، صص ٤٥ ، ٤٦ .

٢٥ـ روملو حسن بيگ ، احسن التواريخ ، تصحيح عبد الحسين نوايى ، نشر بابك ، تهران ، ١٣٥٧ ، صص ٣٣٠ و ٣٣١ .

٢٦ـ نويدى زين العابدين على بن عبدالمومن ، تكمله الاخبار ، به كوشش عبد الحسين نوايى ، تهران ، ١٣٦٩ صص ٧١ ، ٧٢ .

٢٧ـ مينورسكى ولاديمير ، تاريخ تبريز ، ترجمه عبد العلى كارنگ ، تبريز ، ١٣٤٦ ص ٥١ .

٢٨ـ عماد عبد السلام رووف ، السلطان حسين الولى ، الجمعيه الثقافيه التاريخيه لكردستان ، رقم ٣ ، اربيل ، ٢٠٠٩ ،ص٤٧ .

٢٩ـ نفس المصدر ،ص ٤١ .

٣٠ـ دورانت ويل ، تاريخ تمدن ، مترجم فريدون بدرەای و ... ، انتشارات علمی و فرهنگی ، چاپ یازدهم ، تهران ، ١٣٨٥ ، جلد ششم ، صص ٥٣١ ، ٥٣٢ ، ٥٣٧ .

٣١ـ پيرنيا مشير الدوله حسن ، تاريخ ايران،كتابفروشی خيام ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٦٢ ، ص ٦٧٠ .

٣٢ـ همان،بدليسی امير شرف خان،ص١٢١ .

٣٣ـ چەلەبی نەوليا،كورد لە مێژووی دراوسێكانيدا، كوری زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٩،ل ١٦١ .

٣٤ـ همان، صفوی شاه طهماسب بن اسماعيل، صص٢٩ـ٤٣ .

٣٥ـ المصدر السابق،مأمون بك بيگه بك،صص٣٧ـ٤١ .

٣٦ـ راجر سێيڤری ، ئێرانی سەردەمی سەفەوی ، وەرگێرانی سەلاحەددین ئاشتی ، بنكەی ژین ، سلێمانی ، ٢٠٠٦ ، ل ١١٥ .

٣٧ـ سەرچاوەی پێشوو ، چەلەبی نەوليا ، ل١٦٢ ، ١٩١ .

٣٨ـ همان،صفوی شاه طهماسب بن اسماعيل، صص٥٥ـ٥٨ـ٦٠ـ٦١ ؛ تركمان اسكندر بيگ، تاريخ عالم آرای عباسی، زير نظر ايرج ميرزا، موسسه انتشارات امير كبير ، چاپ چهارم ، تهران ، ١٣٨٧ش، جلداول ،ص ٧٣ .

٣٩ ـ پچوی ابراهيم افندی بن عبد الله دفتردار رومی ، صص ٢٧٦ ، ٢٧٨ .

٤٠ـ قمی قاضی احمد ، خلاصه التواريخ ، بە كوشش دكتر احسان اشراقی ، انتشارات دانشگاه تهران ، تهران ، ١٣٥٩ ،جلد اول ، ص ٣٣٦ .

٤١ـ روملو حسن بيگ ، احسن التواريخ ، تصحيح عبد الحسين نوايی ، انتشارات بابك ، تهران ، ١٣٥٧ ، صص ٤٢٤ ، ٤٢٦

٤٢ـ بدليسی شەرف خان، شەرەفنامە، وەرگێرانی سەلاحەدین ئاشتی ، بنكەی ژين، سلێمانی،٢٠٠٧ ز ،بەرگی دووەم، ل٢٢٤ .

٤٣ـ ارسلان شكيب ، تاريخ الدولة العثمانية ، دار ابن كثير ، دمشق ، ٢٠٠١ ، ص ١٦٣ .

٤٤ـ همان، صفوی شاه طهماسب بن اسماعيل، صص٦٢ ، ٦٣ .

٤٥ـ المصدر السابق ، مامون بك بن بيگه بك ، صص ٥٣ ، ٥٤ .

٤٦ـ لطفی پاشا احمد ،تواريخ آل عثمان ، مطبعه عامره ، اسلامبول ، ١٢٩٢ ، ص ٤٤٣ .

٤٧ـ پچوی ابراهيم افندی بن عبد الله دفتر دار رومی ، صص ١٨٧ ، ١٩١ .

٤٨ـ پچوی ابراهيم افندی بن عبد الله دفتر دار رومی، ص ٥٣ .

٤٩ـ اردلان مستوره ، تاريخ الاكراد، اراس ، اربيل ، ٢٠٠٥ ،ص٣٤ .

٥٠ـ المصدر السابق ، مامون بك بن بيگه بك،صص٥٤ـ٥٥ـ٥٦ـ٥٧ .

٥١ـ نفس المصدر ، ص ٥٤ .

٥٢ـ نفس المصدر ، ص ٥٦ .

٥٣ـ نفس المصدر ، صص ٥٦ ، ٥٧ .

٥٤ـ نفس المصدر ، ص ٥٥ .

٥٥ـ نفس المصدر ، ص ٥٨؛ همان ، ترکمان اسکندر بیگ ، ص٧٤.

٥٦ـ همان، سنندجی میرزا شکر الله ، ص٩٨.

٥٧ـ المصدر السابق،مأمون بك بن بیگه بك،ص٥٨.

٥٨ـ همان،صفوی شاه طهماسب بن اسماعیل،ص٦٢.

٥٩ـهمان، بدلیسی امیر شریف خان،ص١٢١.

٦٠ـ المصدر السابق، مأمون بك بن بیگه بك،ص٥٩.

٦١ـ همان، سنندجی میرزا شکر الله،ص٩٦.

٦٢ـ همان، قاضی ملا محمد شریف، ص١٢١ ؛ اردلان مستوره ، ص ٣٨؛ همو، سنندجی میرزا شکر الله ، ص٩٨.

٦٣ـ همان، بدلیسی شرف خان، ص٥٧١.

٦٤ـ همو، بدلیسی امیر شرف خان، ص١٢١: همان،قاضی ملا محمد شریف،ص١٧.

٦٥ـهمان،صفوی شاه طهماسب بن اسماعیل،ص٦٤.

٦٦ـ المصدر السابق ، مامون بگ بن بیگه بك ، صص ٦٢ ، ٦٣ ، ٦٦، ٦٧ .

٦٧ـ همان، ترکمان اسکندر بیگ،ص٧٥.

٦٨ـ المصدر السابق ، مامون بك بن بیگه بك ، ص ٨٠ .

**سەرچاوەکان**

دەستنووسە چاپ نەکراوەکان

فارسی

١ـ ناشناس، تاریخ کرد،کتابخانه ملی ایران،تهران،شماره ف/٢٢١٣.

**سەرچاوە**

A- فارسی

١ـاردلان مستوره،تاریخ الاکراد،اراس،اربیل،٢٠٠٥م.

٢ـ افوشتەای نطنزی محمود بن هدایت الله ، نقاوة الاثار في ذكر الاخيار در تاریخ صفویه،به اهتمام دکتر احسان اشراقی،شرکت انتشارات علمی و فرهنگی،چاپ دوم،تهران،١٣٧٣ش.

٣- الزخشي ابو بكر محمد بن جعفر ، تاريخ بخارا ، ترجمة ابو نصر احمد بن محمد بن نصر القبادي ، تلخيص محمد بن زفر بن عمر ،تصحيح و تحشية مدرس رضوى ، انتشارات توس ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٨٧ هـ . ش .

٤- القاشى ابو القاسم عبد الله بن محمد ، تاريخ اولجايتو ، به اهتمام مهين همبلى ، شركت انتشارات علمى و فرهنگى ،چاپ دوم ، تهران ، ١٣٨٤ .

٥- باباني عبدالقادر ابن رستم، سير الاكراد،بكوشش محمد رئوف توكلى،تهران،١٣٦٦ش.

٦- بدليسى امير شرف خان، شرفنامه، بامقدمه محمد عباسى،نشر حديث،چاپ سوم،تهران،١٣٧٣ش.

٧- پيرنيا مشير الدوله حسن ، تاريخ ايران ، كتابفروشى خيام ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٦٢ .

٨- تركمان اسكندر بيگ، تاريخ عالم آراى عباسى،زير نظرايرج افشار،مؤسسه انتشارات امير كبير،تهران، ١٣٨٧ش.

٩- سنندجى ميرزا شكر الله، تحفه ناصرى، مقابله دكتر حشمت الله طبيبى، مؤسسه انتشارات امير كبير،تهران،١٣٦٦ش.

١٠- صفوى شاه طهماسب بن اسماعيل، تذكره شاه طهماسب، بامقدمه امر الله صفرى، انتشارات شرق،چاپ دوم،تهران،١٣٦٣ش.

١١- قاجار نادر ميرزا ، تاريخ و جغرافى دار السلطنه تبريز ، مقدمه، تصحيح و تحشيه غلامرضا طباطبائى ، انتشارات ستوده ، تهران ، ١٣٧٣ .

١٢- قاضى ملا محمد شريف، زبده التواريخ سنندجى،به كوشش محمد رئوف توكلى،انتشارات توكلى،تهران،١٣٧٩ش.

١٣- وقايع نگار كردستانى على اكبر،حديقه ناصريه، بامقدمه محمد رئوف توكلى،تهران،١٣٦٤ش.

١٤ - قمى قاضى احمد ، خلاصه التواريخ ، به كوشش دكتر احسان اشراقى ، انتشارات دانشگاه تهران ، ١٣٥٩ .

١٥ - نويدى زين العابدين على بن عبد المؤمن ، تكمله الاخبار ، به كوشش عبد الحسين نوائى ، تهران ، ١٣٦٩ .

B-كوردى

١- بدليسى شەرف خان، شەرەفنامە، وەرگێرانى سەلاحەدین ئاشتى ، بنكەى ژین، سلێمانى،٢٠٠٧ز.

٢- چەلەبى ئەولیا ، كورد لە مێژووى دراوسێكانیدا ، وەرگێرانى سەعید ناكام ، كۆرى زانیارى كورد ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

C- عەرەبى

١ـ مأمون بك بن بيگه بك،مذكرات مأمون بك بن بيگه بك، ترجمه محمد جميل الروژبياني و شكور مصطفى،المجمع العلمي العراقي الهيئة الكردية، بغداد، ١٩٨٠م.

d- توركی

١ـ پچوی ابراهيم افندی عبدالله دفترداری رومی، تاريخ پچوی ، مطبعه عامره ، اسلامبول ، ١٢٨٣

٢ ـ لطفی پاشا احمد ، تواريخ آل عثمان ، مطبعه عامره ، اسلامبول ، ١٢٩٢ .

ژێدەر:

A-فارسی

١ـ مير احمدی دكتر مريم، تاريخ سياسی و اجتماعی ايران در عصر صفويه، مؤسسه انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٧١ش.

٢ـ مير جعفری حسين ، تاريخ تحولات سياسی، اجتماعی، اقتصادی و فرهنگی ايران در دوره تيموريان و تركمانان ، سازمان مطالعه و تدوين سمت ،چاپ پنجم ، اصفهان ، ١٣٨٥ .

٣ـ مردوخ كردستانی محمد ، تاريخ مردوخ ، انتشارات غريقی ،چاپ دوم،سنندج،١٣٥١

٤ ـ دورانت ويل ، تاريخ تمدن ، مترجم فريدون بدرەای و .... ، انتشارات علمی و فرهنگی ، چاپ يازدهم ، تهران ، ١٣٨٥

٥ ـ مينورسكی ولاديمير ، تاريخ تبريز ، ترجمه عبد العلی كارنگ . تبريز ، ١٣٤٦ .

٧ ـ زرين كوب عبد الحسين ، روزگاران ، انتشارات سخن ، چاپ پنجم ، تهران ، ١٣٨٣.

٨ـ پير نيا مشير الدوله حسن ، تاريخ ايران ، كتابفروشی خيام ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٦٢ .

B- عەرەبی

١ـارسلان شكيب ، تاريخ الدولة العثمانية ، دار ابن كثير ، دمشق ،٢٠٠١ .

٢ـعماد عبد السلام رووف ، السلطان حسين الولي ، الجمعية الثقافية لكردستان ، رقم ٣ ، اربيل ، ٢٠٠٩ .

C-كوردی

١ـسنيڤڕی راجر ، ئێرانی سەردەمی سەفەوی ، وەرگێرانی سەلاحەددین ئاشتی ، بنکەی ئاشتی ، سلێمانی ، ٢٠٠٦ .

یانوکە دکەڤندا هەمی دەستێ مالا محێ دابون وەك هوزا ئێکێ وسەروکێ دەڤەرێ دهاتە نیاسین دوی دەمیدا وتانوکەژی.

مالا محێ چ رامان ددەت ؟

محێ بێ کومان ژ بجویکرنا ناڤێ محمد هاتیە وەرکرتن دسەردەمێن هەرە دێرین وکەڤناردا ناڤێ سەروکێ بنەمالێ دکوتنێ محمد ئەفجا بنەمال ژی هەر ب ناڤێ وی ئانکو محمد دهاتە ناسکرن بەلێ ببورینا دەم وسالێن درێژ ژ بەرەبابك بو بابکی ناڤێ محمد لسەر ئەزمانێ خەلکێ بنەمالێ وخەلکێ دەڤەرێ هاتیە کوهرین وسفککرن ژ محمد تابویە( محێ) وەکی نوکە دهێتە کوتن. لیەی بێزانینێن بەردەست وەها هاتیە زانینن کو کەسایەتیا محمد( محێ) سەروکێ بنەمالێ یێ بەژن بلند و هێزەکا ئنتیکە هەبوو وهزرو بیروبوچون وئاقلمەندیەکێ بەرنیاس بوو وشەهرەزایەکا باش سەرسورمان ومەندەهوش هەبویە دهەمی بوارێن ژیانێدا وکارو بزاڤ د بێدڤیێن روژانە دا، وئاکنجیبویێن دەوروبەرێن کوندێ بامەرنێ هەمیان بێزانینێن کاری ژ کەسایەتیا محمدی وەرکرتنن، بەلکو کەسایەتیا محی ئانکو محمد دهاتە نیاسین ب سەروکێ بنەمالاخو بنەمالا محێ وسەروکێ کوندێ بامەرنێ.

بابیرێن مالا محێ

مالا محێ دهاتە نیاسین ب بنەمالەکا بوش وسەروکێن دەڤەرێو بێکدهات ژ کەلە سەروك خێزانان وهەر خێزانەکێ عەیالەکێ زور هەبویە جونکە دوان سەردەماندا خێزانێ دڤیان کەلەك عەیال هەبن ژبەر بێدڤی وپێداویستیێن ژیانا روژانە و

نـەمازە بنەمالـەکا وەکـی بنـەمالا محـیێ ل کونـدێ بامـەرنێ کـو هـەمی ئـەردێ بامەرنێ ددەستی دابویە مـژویلی چـاندنا هـشکاتی ویـا ئـاڤی وخودانکرنـا تـەرش تەوالی بهەمی جورێن خوڤە، وهەمی سنورێ بامەرنێ ڤـەدکرت بـابیرێ مـەزن یـێ بنەمالا محی دکوتنێ ئەبابەکر تنێ دوو کور هەبون یـێ ئێکـێ دکـوتنێ جبرائیـل ئەڤەژی کورەك هەبوویە بناڤێ محمد یێ بەرنیاس ب محمـدێ جبـێ دوی دەمیـدا بهەر ئەکەرەك هەبیت محمدێ جبـێ ژبامـەرنێ قەسـتا کونـدێ کانیکـا دکـەتن ول وێرێ جهواردبیتن وخێزانەکێ ئاڤاکەتن هەربناڤێ خێزانا بنەمالا محیێ بڤێ چەندێ دیاردبیتن بنەمالامحیێ بەلاڤـدبیتن ودیـسان محمـدێ جبـێ نـەژادێ خـو ژبیرنـەکر ئانکو هـەر نـاڤێ بنـەمالاخو بامـەرنێ ل کونـدێ کانیکـاژی ئاڤـاکر کـو دکەڤیتـە باشورێ کونـدێ بامـەرنێ، وتانوکـەژی نـەڤیێت بنـەمالا محمـدێ جبـێ ل کانیکـا بەرنیاسن وپـەیوەندیێن هێز وموکم هەنە ناڤبەرا هەردو بنـەمالێن محـیێ ل کونـدێ بامەرنێ ول کوندێ کانیکا. وهەژی کوتنێ یە کـو عبـدالایێ جبـێ دوو کورهـەبون ئەوژی محمدسالح وسالح، ئەفجا محمدسالحی سێ کورهەنە ئەوژی موراد وسەعید وئەحمەد. ومورادی کورەك هەیە ناڤێ وی نیجیرڤانم، وسەعیدی سـێ کورهـەبون ئەوژی سالح ومستەفا ویوسف، وئەحمەدی دوکورهەنە ئەوژی ئیبراهیم وئسماعیل . دیسان محمدێ عبدللییێ جبرائیلی سێ کورهەنە ئەوژی عەلی وعبدللـە وعومـەر، ئەفجا عەلی سێ کور هەنە ناڤێت وان( کاهین وکاوار وکاروژ) وکـورێ ئەبابـەکری یێ دوێ دکوتنێ( تەها) ئەڤیژی دوو کور هەبون یێ ئێکێ ناڤێ وی(عبـدالرحمن یان عبداللـە) بـوو ئـەڤی چـو زوریـەت نەبوینـە لـدویف ژێـدەرێن دیروکـی، بـەلێ بـدیتنامن یاکەسـایەتی عەبـدولرەحمانی زوریـەت هەبویـە لێ بێـزانین بدروسـتی نەکەهـشتینە مێژونڤێسان ودبـیتن زوریـەتا عەبـدولرەحمانی یـان عبداللـە وەکـی زوریەتا محمدێ جبـێ ژ بامـەرنێ قەسـتا جهـەکێ دی کـربیتن جونکـە ل کەلـەك

دەڤـەرێن سـنورێ پارێزکـەها دهـوکێ وەکـی کونـدێ شوشـێ ل قـەزا ئـاکرێ بنەمالـەك هاتیـە ناسـنافکرن ب بنـەمالا محـێ ودبێـژن بـابیرێ مـە دسـەردەمێن کەڤندا ژ بنەمالا محێ بویە ل بامەرنێ وقەستا دەڤەرا مەکریە ول کوندێ شوشـێ روژئاڤایێ ئاکرێ ئاکنجیبویە، وعبدالرحمنی یان عبدالله ل شوشـێ کـورەك هـەبو دکوتنێ محمد ومحمدیژی کورەك هەبویە ناڤێ وی شوکری بوو، وئـەڤێ دومـاهیێ زوریەتەکا باش لێ دەرچویە وبێنج کور هەبون(حسێن، حەسەن، محمد، ئیدریس، زرار)، وحسێنی شەش کورهەنە ئەوژی ئەڤەنە(بـارزان، رێـزان، نێجیرڤان،برهـان، صابر، شێروان، وئەڤێ دوماهیێ کورەك هەیە بناڤێ محمد.) وحەسـەنی حـەفت کورهەنە بناڤێ(موسەدەق وزێرەڤان وهـشیار وعەبدوللـەتیف وعاصـف وسـیابەند ومشتاق وئەڤێ دوماهیێ سێ کورهەنە ئەوژی محمد وئەحمەد وشوکری).ومحمدی سێ کورهەنە بناڤێ(هەوار وبەختیار ومێهڤان) ، وئیدریسی دیسان سـێ کورهەنـە بناڤێ(بەندی وعزیـز وعەبدللـە)، وزراری هەروەسـان سـێ کورهەنـە ئـەوژی(زهێـر وزیرەك وزریان) نوکـە هـەمی ئاکنجینـە ل کونـدێ شوشـێ قـەزا ئـاکرێ بـەلکو دهێنە نیاسین ببنەمالا سـەرەکی ل کونـدی وسـەرکردایەتی ودەسـتهەلاتا کونـدێ شوشێ نوکە ددەستێ ریهسپی ماقویل ودانعەمرێن بنەمالا محێ ئەوا ژنەژادڤە ل کونـدێ بامـەرنێ قەسـتا کونـدێ شوشـێ کـری ولێ ئـاکنجیبوین. وروژ بـو روژێ پەیوەندی هاتنە کرێدان دکەل خەلکێ کوندێ شوشێ وشیاینە ژیانا خویا روژانە ببەنە سەری ب مژویلی چاندنێ وخودانکرنا تەرش وتەوالی وهـژمارا مـالا محـێ ل شوشێ بەرەف زێدەبونێ چوینە ژ زوریەتا عەبـدولرەحمانی یـان عبدللـە شـیاینە ئەردەکێ بەرفرە ھ دەستخوڤەبینن وبنە خودان مولك وئاقار وزەڤی وبیـستان ل کوندێ شوشێ، وبڤی گروڤێ دیاربیتن کو نەڤیێت بنەمالا محێ ل کوندێ بامەرنێ ل کوندێ شوشێ وکوندێ کانیکا هاتینە بەلافکرن وتانوکە پەیوەنـدیێن زور هێـز

و دبەردەوامن ناڤبەرا بنەمالا محێ یاسەرەکی ل هەرسێ کوندان ئەوژی بامەرنێ و کانیکا و شوشێ.

وژلایەکێ دیڤە برایێ عەبدولرەحمانی دکوتنێ ئیبراهیم دوو کورهەبون(محمد و عەبدولرەحمان) ئەڤێ دوماهیێ ئانکو عەبدولرەحمان زوریەتا وی یابێ سەروشینە وەسا دیارە چویە بەردلوڤانیا خودێ بەری ژنێ بینیتن یانژی یێ عەیال بویە، بەلێ ئەکەر عەیالژی نەبویە هەرچاوابیت دا ناڤێ ژنکا وی زانین لدویف بێزانینێن باب وباپیران، یانژی دبیتن بەرەف دەڤەرەکادی چویە ولێ جهواربویە وخێزانەك ئاڤاکریە، وەکی مامێ خو عەبدولرەحمانی چویە شوشێ ومامێ بابێ وی محمدێ جبێ چویە کانیکا، هەرچاوابیتن بدیتنامن یاکەسایەتی وەسا دیاردبیتن کو عەبدولرەحمان کورێ ئیبراهیمی قەستا دەڤەرەکادی کریە ولێ ئاکنجیبویە وب تایبەتی دەڤەرا دوسکیا جونکە لڤێ دوماهیێ هاتیە ئاشکراکرن کو بنەمالەك ل دەڤەرا دوسکیا هەیە تایبەتی ل کوندێ کەمەکا دبێژن بابیرێ مە ژمالا محێ ل بامەرنێ قەستا دەڤەرامە یا دوسکیا کریە ودبێژن ئەم ژی دهێنە ناسکرن ب بنەمالا محێ یان بنەمالا گرمانجا جونکە بنەمالا محێ ژی ل بامەرنێ دهێنە نیاسین ب بنەمالا کرمانجا، لەورا وەکهەڤیەك هەیە ژلایێ ناسناڤ ناڤبەرا کرمانجێن مالا محێ بامەرنێ وبنەمالا کرمانجا کوندێ کەمەکا، جونکەمالا محێ بامەرنێ کارێ وان یێ سەرەکی رێنجبەری بو ئانکو چاندن وخودانکرناتەرش وتەوالی لەورا هاتنە نیاسین ببنەمالا کرمانجا هەروەسان کارێ سەرەکی یێ بنەمالا کرمانجا ل کەمەکا هەر رێنجبەری واتە چاندن وخودانکرناتەرش وتەوالی لەوراهاتنە ب بنەمالا کرمانجا بڤێ چەندێ دیاربیتن کو بنەمالا کرمانجا ژ بامەرنێ چویە کوندێ کەمەکا، ئەڤجا دورنابیتن بدیتنامن کو بابیرێ بنەمالا کرمانجێن کەمەکا ناڤێ وی عەبدولرەحمان کورێ ئیبراهیمی بویە

دوی دەمیدا ب هەر چ ئەکەرەك بیت کونەچاربیتن ژ بامەرنێ چویە دەڤەرا دوسکیا و کوندێ جهواربویە کەمەکا ونوکە زوریەتا وی ب بنەمالا محێ هاتیە ناسنافکرن، بڤێ چەندێ بومە دیاربیتن کو هەرسێ بابێن بنەمالا محێ ل بامەرنێ دکەڤندا دەمێ ژ بامەرنێ دویرکەفتین وهەرئیك ل وارەکی جهواربویە مینا( محمدێ جبێ ل کانیکا _ وعەبدولرەحمان یان عبداللە ل شوشێ _ وعەبدولرەحمان برایێ محێ ل دەڤەرا دوسکیا) وەسا بومە هاتیە رونکرن کو هەرسێکا بو عەیالێ خو ونەڤیێت خو نەژادێ باب وبابیرێن خو داینە نیاسین وڤیاینە نیاسینا نەژادێ بنەمالا وی( محی) ل وێ دەڤەا لێ ئاکنجی بهێتە پاراستن نەکو بهێتە بەرزەکرن، ئەڤەژی دبیتە باشترین گروڤە وبەلکەنامە کو هەرسێك ئەوێن( محمدێ جبێ _عبدارحمن مامێ محێ _عبدالرحمن برایێ محێ) ب ئارەزویاخو وب خوشی ژ بامەرنێ قەستا وارەکی بکەن وزوریەتەکێ پەیدابکەن جونکە بو عەیال ونەڤیێت خو نەژاد ورەسەنەتیا باب وبابیرێن خود داینە خویاکرن.

ئەوا ژهەمیێ کرنکتر دڤی بابەتی دا کەسایەتیا محێ ئانکو(محمد) کو ئەف بنەمالە ب ناڤێ وی هاتیە ناسنافکرن ول ڤیرێ ئەم کەهشتینە ناڤێ محێ ئانکو محمد کو دبیتە کورێ ئیبراهیمی کورێ تاها کورێ ئەبابەکر ومحێ بێنج خیشك هەبون( سەدیقا، عەیش، گورج، خەجیجا، حەوا)، ومحێ بتنێ برایەك هەبوو ناڤێ وی عبدالرحمن ئەوێ چویە دەڤەرا دوسکیا وبتایبەتی کوندێ کەمەکا، بەلێ محێ ئانکو محمد مایە ل کوندێ خو بامەرنێ و هەتا مریێژی هەرمایە ل بامەرێ مژیلی ژیانا وی سەردەمی بویە خودانکرنا تەرش تە والی و کشتوکالی وچاندنا هەمی دەرامەتێن ئاڤێ وهەشکاتیێ، ومحێ سێ کورهەبون ئەوژی( احمد _حجی_رشید) وئەحمەدی بێنج گور هەبون( عبدالرحمن، عمر، معروف، محمد،

قاسم). کورێ ئێکێ ئانکو عبدارحمن کورەك هەبو بناڤێ حافز. وکورێ دوێ ئانکو عومەری دوو کورهەبون ئەوژی(ئیبراهیم، حسین) وحسێنی دوو کور هەبون( حسن، نائیف)، نائیفی سێ کورهەنە سیروان وسیپان وحسین.وحەسەنێ چار کورهەنە(ئیبراهیم ئالان وعمەر وبەنکین) وئبراهیمی برایێ حەسێنی کورەك هەبو دکوتنێ صائیب. ومەعروفی دوو کورهەبون (سالح وسەبری). ومەلامحمدی چار کور هەبون (مەلا ئەنوەر،مەلا نوری، عەبدوللە ومەلا محمدسعید)، ومەلائەنوەری پێنج کورهەنە بەهجەت وشەوکەت ونشئەت وحکمەت وئیحسان،وشەوکەت چارکورهەنە (هەیمەن، هیوار، نیوار، دیار). ونەشئەتی کورەك هەیە ناڤێ وی محەمەدد. وعەبدوللە سێ کورهەنە عەدنان ومێهڤان وشڤان، ومەلانوری سێ کورهەنە ئەوژی عەلی وئەحمەد ومحمد. ومەلامحمد سعیدی کورەك هەیە ناڤێ وی ئەنەسە وئەنەسی ژی دوو کورهەنە ئەوژی مالك ویوسف . وڤا سمی کورەك هەبوو دکوتنێ ئەحمەد و ئەحمەدیژی چار کور پێت هەین بناڤێ( محمد و ئیبراهیم وعبدالرحمن ومحمود ). ومحمدی دوکورهەنە ئەحمەد و عمەر.

وحەجی کورێ محێ( محمد) دوو کورهەبون عو سمان وعبداللە. عەبدوللە حەفت کور هەبون بناڤێ(سعید ومجید واحمد و حمید ومحمد ونافع وعبدالکریم). ئەفجا سەعیدی دو کورهەبون بشار ونزار، وبشاری دوکورهەنە ئەحمەد ومحمد، ونزاری دوکورهەنە بشار ورەیان . ومجیدی چارکورهەنە تارق وزیادوماجدوکامیران، ئەفجا تارقی کورەك هەیە ناڤێ وی زیادە، دیسان برایێ تارقی زیادی کورەك هەیە بناڤێ تارق، دیسان کامیرانی دوکورهەنە ئەوژی ئەحمەد ومستەفا.

**وئەحمەدی چارکورهەنە فۆاد وفەرهاد وعبداللە وماجد، ئەفجا فوئادی دوو کورهەنە بناڤێ ئەحمەد وئیسماعیل، وفەرهادی سێ کور هەنە یوسف ویاسر**

ویونس. وحەمیدی سێ کورهەبون ئەوژی عەلی وئیبرهیم وڕێبەر، ئەفجا عەلی چار کورهەنە شڤان وکارزان حمید وماجد، وڕێبەری کورەك هەیە ناڤێ وی جودیە. ونافعی چار کورهەنە ئەوژی ژێکر وهوکر وباوەر وسیزار. وعوسمانی شەش کور هەبون(هناس و ئازاد وعەلی و محمد وعومەر وئیبراهیم). ئەفجا هەناسی دو کورهەبون کاروان وکارزان، وکاروانی کورەکێ هەی ناڤێ وی هەناسە، وئازادی سێ کورهەنە ئەوژی بەهدین و محمد ومستەفا. هەروەسان عەلی دوو گورهەنە ناڤێت وانا مستەفا وعوسمان.

رەشید کورێ محێ(محمد)سێ کور هەبون( حسێن و عەلی وحسن) یێ ئێکێ ئانکو حسێن کورەك هەبوو بناڤێ محمد و محمدی چار کورهەبون ئەوژی( مێهڤان ز ژڤان وکارزان وڕێزان) وژڤانێ کورەك هەیە ناڤێ وی لورەندە، نوکە هەمی ئاکنجینە ل بارژێرێ دهوکێ، وکورێ دوێ یێ رەشیدی دکوتنێ عەلی کورەك هەبو بناڤێ فەتاح وئەڤێ دوماهیێ سێ کورهەبون نوژدار وهشیار وکوهدار. نوژداری سێ کورهەنە شینوار وپیندار وڕێنجبەر. وهشیاری سێ کورهەنە فەتاح رەشید وعەلی، وکوهداری کوردك هەیە بناڤێ هێژا. نوکە ل هەولێرێ جهوارن ، وکورێ سێ یێ رەشیدی دکوتنێ حەسەن هێشتا یێ جەحێل هاتبو کوشتن دکەل برایێ خو عەلی بابێ فەتاحی رێکەفتی ٣ _٨_ ١٩١٩ ل روژهەلاتا بامەرنێ دڤەرا بیارەشکی دەمێ بامەرنێ هاتیە داکێرکرن ژلایێ هێزێن بەریتانیاڤە. لڤیرێ دیاردبیت کو کەنجێن بنەمالا محێ بەرکری وبەرەڤانی ژ ئاخا بامەرنێ کریە وشەهید بوینە سەخمەراتی بەرژەوەندیا گشت خەلکێ کوندی بامەرنێ بویە. هەروەسان یافەرە بێژین کو کەنجێن مالا محێ بەژداری دشورەشا ئەیلول وکولانێ داکریە وشەهیدبوینە ژوانا( ماجد حمید عبداللە و عبداللەمحمداحمد)

مالا محێ وجهێ ئاکنجیبونێ ل بامەرنێ

بێ کومان دەستبێکا ژیانا مروڤان ل جهێن ئاسێ وڤەدەر دژیان وتایبەتی ل جهێن بەرزو بلند ول ناڤەراستا جیایان لەورا دبینین کو شینوارێن مالا محێ ل ناڤەراست ودەوروبەرێن کوندێ بامەرنێ هاتینە ئاشکراکرن وەکی گەرا چقێ و تاخێ گەلی و مناسبێ وەرگێرێ و تاخێ سیکێ و ژوریا تاخێ شیڤاهرجا وتاخێ کوندی، ئەف جهێن مە ئامارژە بێ کرین دهێنە نیاسین گەڤنترین جه ژلایێ دیروکیڤە ل بامەرنێ جونکە کەرستێن دێرین وگەڤنار و بەرمایکێن شینواری لێ هاتینە دیتن کو ئەو جە بوینە مالا محێ ژین وژیارا خو لێ بوراندیە وجهێ ئاکنجیبونا مالا محێ بویە هەر ژسەردەمێن کەڤندا وتانوکەژی. هەروەسان بنەمالا محی ژیدەرێ ئێکێ بوینە بو ئاشکراکرنا مێژویا کوندێ بامەرنی وهەمی دیروکناسان وشینوارناسان وکەروکان قەستا باب وبابیرێن بنەمالا محێ کرینە دەمێ دیروکا بامەرنێ نڤێسای وبێزانین لسەر کومکرین جونکە بنەمالا محی دهێتە نیاسین ب کەڤنترین بنەمال نەك ل بامەرنێ بەلکو ل سەرانسەوێ دەڤەرا ئامێدیێ، هەروەسان ژوان بێزانینێن ڤەشارتی وبەرزە مالا حێ داینە ئاشکراکرن بو دیروکڤانان، مینا ل تاخێ کەلی شینوارێن قەسرەکێ هاتنە دیتن هاتە نیاسین ب ناسناڤێ قەسرا کافری، ئەندازیارەکێ جیولوجی یێ بامەرنی ناڤێ وی ئوسمان ئیبراهیم خالد پرتەکا کێجا قەسرا ناڤبری برە وەلاتێ ئەمریکا وکەهاندە دەستێ پروفیسور روبەرت فولك تایبەتمەندێ بواری جیولوجیدا بشتی بشکنینێن زانستی هاتینە ئەنجامدان لسە ر ڤێ پرتا کێجێ یا قەسرا کافری ئەوا ژ بامەرنی

ئینای پروفیسوریَ نافهاتی راکەهاند کو دیروکا پرتا کێجا قەسرا کافری ل بامەرنیَ دکەهیتە دەوروبەرێن ٦ هزار سالان بڤیَ بێزانینیَ بومە دیاردبیتن ک هەبونا ژیانا مروڤان ل بامەرنیَ دزڤریتن بو چەرخێن بەرێن گەڤن، هەروەسان دەمیَ حوکمیَ کافران ل بامەرنیَ دوی سەردەمیدا هەمی خانیێن بامەرنیا برەخکڤە وبێکڤە هاتبونە ئاڤاکرن ودئێك ئاستیَ بلنداهیَ بوینە ئانکو باکوردان ل سەریَ کوندی ولسەربان سەربان گرێل دبو تا کەهشتیە سەربانیَ دوماهیك مال بنیَ کوندی وبیَ راستاندن وەکی ژوردانیەکیَ دهاتە خاریَ؛ بڤیَ چەندیَ دیاربیتن دوی سەردەمیدا خەلکیَ بامەرنیَ تفاق بوینە وبراینی ناڤبەرا واندا هەبویە، یان دبیتن ل بن فشارا کافری بوینە جونکە ئاڤاهییَ قەسرا کافری دکەڤیتە لسەریَ کرەکی هنداڤی تاخیَ کەلی دایێ زالبیتن لسەر خەلکیَ کوندیَ بامەرنیَ وبریارێن کافری هە ردەملدەست بهێنە جێبە جێکرن ، وژلایەکیَ دیڤە ژنکا کافری ل بلندترین کوبتکا قەسریَ خو تێدا هاڤێت وهەر ئێکسەر هاتە کوشتن بهەر ئەکەرەکا هەبیتن ؛ بەلیَ نوکە جهیَ داخیَ یە شینوارێن قەسرا کافری هاتینە بن ئاخکرن تنیَ جهیَ ژورێن قەسری لسەر ئەردی پێش جاڤن. هەژییە بێژین کو بابکالێن مالا محیَ ئەف بێزانینە لدور قەسرا کافری کەهاندینە خەلکیَ بامەرنیَ ییَ ڤی سەردەمی.

وژلایەکیَ دیڤە وەها هاتیە زانینێن دسەردەمەکید بابکالێن مالا محیَ ل گەرا چغیَ جهواربون جهەکیَ بەرزو بلندە دکەڤیتە هنداڤی تاخیَ شیڤا هرچا وژیانەکا سروشتی لیَ بوراندییە، ئەفجا بدیتنامن جونکە ئەوجە ئانکو رەخ ورویێن گەرا چغیَ ئەردەکیَ راست وپانە ویاتێر ئاڤە چەندین کانیێن ئاڤا زەلال لیَ دزێتن دیسان ئاڤا بوش زەلال یا شکەفتا بەرقادیا ژوردا دهێتە خاریَ ول نێزیکی گەرا چغیَ دەربازبیتن لەورا خەلکیَ بنەمالا محیَ مفایەکیَ ئێکجار باش ژڤیَ دەڤەرا پر

مفا وەرکرتیە وبو دەمەکێ درێژ ماینە ل وێرێ وتانوکەژی شینوار وبەرمایکێن خانیێن مالا محێ بشێوەیەکێ رون وئاشکرا بەرچاڤن ل دەوروبەرێن گەرا چڤێ ؛ هەروەسان ئالیێ راستێ ل کەرا چڤێ خالەکا هەی دبێژنێ( بنێ خویکێ) ئانکو جهێ وەرکرتنا خویك یان باج یان( ڤریبە) جونکە جهێ گەرا چڤێ رێکەکا سەرەکی بویە یا هاتن وچونێن کاروانێن بازرکانیان ورێڤینکا دناڤبەرا کوندێ بامەرنێ و دەڤەرا بەرواریا هەر کەسەك یا کاروانەك یان رێڤینکەك دوێ رێکێرا هاتبو یان چبو دا سەروك وسەرکردێن مالا محێ خویکێ یان باج ژێ وەرکرتن جونکە دناف ئەردێ مالا محێ را هاتینە وچوینە ومفایێ بازرکانی ژ ئەردێ وان ودرکرتیە ئەڤ چەندەژی ئێك ژبریارێن وی سەردەمی بوینە، لڤێرە وەسادیاربیتن کو مالا محێ دەستهەلاداری وسەروکاتیا ل کوندێ بامەرنێ وهەمی دەڤەرێ کریە لەورا خویك وباج ژ کاروانێن بازرکانیان وەرکرتیە.

دیسان مالا محێ ل رەخ ورویێن(جێمایێ) ئاکنجیبون ئانکو ئاقارێ مەزنێ نوکە یێ بامەرنێ وکانیا مالا محێ یاسەردکی دکوتنێ کانیا حسەینی نوکە دکەڤیتە باشورێ ئاقاری خەلکێ بنەمالا محێ کەلەك مفا ژ کانیا نافهاتی وەرکرتیە بو بیدڤیێن ژیانا خویا روژانە دیسان بو کشتوکالی وخودانکرنا تەرش وتەوالی وەسا دیاربیتن کو کانیاحسەینی کەلەك یابوشبو نەوەکی نوکە یا لاوازبو هەروەسان ناڤی دەمی شینوار بەرمایك وئاڤاهیێن مالا محێ هاتینە دیتن وئاشکراکرن ل رەخ رویێن کانیاحسەینی وجهێ جیمایێ؛ هەروەسان دبیتن حسەین ئێك ژ کەنجێن مالا محێ بوویە وشیایە ڤێ کانیێ ئاشکراکەتن لەورا کانیا ئاڤی ب ناڤێ وی هاتیە نیاسین وتانوکەژی هەر بڤی ناڤی دهێتە نیاسین، وژلایەکێ دیڤە چەندین جاران جوتیارێن بامەرنیا یان خودانێن بیستانێن ئاقارێ بامەرنێ دەمێ مژویلی چاندنێ وکولانا بیستان وزەڤیێن خوبوینە ئەڤجا ژ نیشکەکێڤە گەرێن دیوارا و

شینواریٚن ئاڤ وسولینا وژوریٚن خانیان دیتینە ولسەرهەلبوینە، ئەڤەهەمی دزڤرن بو شبین دەست وتبلیٚن مروڤیٚن بنەمالا محیٚ دوی سەردەمیدا دەمیٚ ل جهیٚ ئاقاریٚ نوکە کومڤەبوین وژیاناخو ب ئازایەتی وخوشی لیٚ بوراندیە پاشان بهەر ئەکەرەك هەبویە بەریٚ خودایە سەریٚ وسەرکەفتینە سەریٚ کوندی وجهیٚ جیٚمایێ بجه هیٚلایە ول بنارا جیاییٚ مەتینی ئاکنجیبون، هەروەسان ل جهیٚ جیٚمایێ خەلکی لڤیٚ دوماهییٚ دوو پەیکەر دیتبون بەلیٚ هەر دەملدەست شکاندن وهەرپرتەك هاڤیٚتە ئەردەکی جونکە مفاییٚ دیروکییٚ وان پەیکەرا نەدزانی وئەو هەردوو پەیکەر بەریٚ وانا ل روژهەلاتیبون دیسان شینواریٚن پەرستکەهەکا ئولیٚ زەرەدەشتیا نیٚزیکی هەردو پەیکەران هاتبونە دیتن، ئەفجا ئەڤەژی دبیتە نمونەترین بەلکەنامە بو هەبونا ئاینیٚ زەرەدەشتیا ل کوندیٚ بامەرنیٚ بەری هەبونا بنەمالا محیٚ. دیسان وەك رەوشت وتیتالیٚن سەردەمیٚن کەڤندا دەمیٚ سەرکردایەتیا ئاینەکیٚ کونترول لسەر سەرکردایەتیا ئاینەکیٚ دی کربویە ئیٚکسەر دا جهیٚ پەرستنا ئاینی بەریٚ خرابکەتن وهەرفینیتن ودا ئیٚکسەر جهیٚ پەرستنا ئاینیٚ خو لسەر شینوارو بەرمایکیٚن جهیٚ پەرستنا ئاینیٚ بەریٚ ئاڤاکەتن، لەورا دەمیٚ ئاینیٚ زەرەدەشتی نەمای وهاتنا ئاینیٚ بوسلمانان ل سەدیٚ حەفتیٚ زاینی هەر ئیٚکسەر ئاینیٚ بوسلمانان پەرستکەها زەرەدەشتیا خرابکریە ومزکەفتەك لسەر بەرمایکیٚن ویٚ پەرستکەها زەرەدەشتیا ئاڤاکریە بناڤیٚ مزکەفتا( جیٚمایێ) ودوی دەمیدا بابیریٚن بنەمالا محیٚ هەبوینە ل بامەرنیٚ لسەر دەمیٚ ئیسلامەتییٚ لسەدیٚ حەفتیٚ زاینی وبابیریٚن مالا محیٚ بخو بدەستیٚن خو مزکەفت ئاڤاکریە جونکە بەری نوکە مە کوتبو کو مالا محیٚ دەستهەلاداریا دەڤەریٚ کریە دیسان خودان زانا زانین بوینە وشیٚخ ومەلا بوینە دوی سەردەمیدا وهەمی سەردەماندا وباب وبابیریٚن مالا محیٚ ب ئاشتیانە هاتینە سەردینیٚ

ئیسلامێ و هاریکاریا هێزێن بوسلمانان کریە بو ڤەکرنا دەڤەرا بەهدینان دژی ئاینێ زەردەشتییێن ساسانی.

هەروەسان سەردەمەکێ دێروکیدا بنەمالا محێ ل روژئاڤایێ بامەرنێ ئاکنجیببون وتایبەتی ل جهێ نوکە دبێژنێ( زەڤیکا)بو دەمەکێ زورێ درێژ ژیاراخو لێ بوراندییە ولدویف بێزانینێن بابو بابیران هاتیە خویاکرن کو دەمێ مالا محێ ل زەڤیکا جهواربوین ئێشەکا کەلەکا گران ونەخوش بسەر خەلکێ دەڤەرێ داکرت دکوتنێ ئێشا( وەبایێ _ تاعون) وحەکیم ونوژدارێن وی سەردەمی شیان نەبون ئەڤێ نەخوشیا کران وبیانی چارەسەربکەن لەورا بویە ئەکەرێ مرنا هزاران کەسێن وی سەردەمی وبتنێ یێن ماینە ساخ کورەك وکچەك بون ناڤێ وانا دکوتنێ( محمد و ئامینا) ئەڤجا ئەڤان هەردوکا خێزانەك بێکئینا وسەرژنوی بنەمالا محێ ئاڤاکرەڤە ودئاینەیدا وزوریەتەکا زور لێ پەیدابوو. هەروەسان ئەو گورستانا دکەڤیتە نێزیکی گەرا هەسنا ئانکو روژئاڤایێ بامەرنی دهێتەناسین بکورستانا(دارکێن قەبرا) نێزیکی مناسبێ وەرکێرێ دبێژن هەمی مریێت مالا محێ بوینە لێ هاتینە ڤەشارتن ژئەکەرێ وێ ئێشا گران(تاعون _ ودبا)؛ دیسان ژ هینکێ وەرە وتانوکە ئەڤ کوندە هاتیە نیاسین ب( بایێ مرنێ) جونکە بایەك بسەر دەڤەرێ داهاتیە بویە ئەکەرێ کوشتنا هزاران مروڤان ژزاروك وژن وبیران بتنی( محمد وئامینا) ژ ناڤدا مانە ساخ، ئەڤجا کوند هاتە ناسکرن ب(بایێ مرنێ)؛ پاشی ببورینا دەم وسالێن درێژ ناف لسەر ئەزمانێ خەلکێ دەڤەرێ هاتیە سفککرن وکوهرین ژ( بایێ مرنێ بویە بامەرنێ).

هەروەسان بنەمالا محێ دسەردەمەکیدا ل ناڤەندا کوندێ بامەرنێ جهواربیون تایبەتی ئەوجهێ نوکە دبێژنێ تاخێ سیکێ بو دەمەکێ درێژ لێ مابون پاشان

قەستا تاخێ شیڤاهرچا کربو دکەڤیتە روژهەلاتێ کوندێ بامەرنێ؛ وبەری بابیرێن مالا محێ قەستا وێ شیڤێ بکەن ولێ ئاکنجیبن رێژەکا زور ژ کیانەوەرێن درندەیێن هرچ لێ دژیان شیڤەکا ترس بوو وکەس نەدوێریا خو نێزیکی وی جهی بکەتن یان وێ رێکێرا بهێن وبچن ئانکو دهاتە هژمارتن ژ رێکێن قەدەغە ژبەر هەبونا کیانەوەرێن هرجێن درندە، بەلێ دسەر ئەڤێ هەمیێ را بابیرێن بنەمالا محێ دهاتنە نیاسین ب جورعەت ومێرخاس وکریارێن مێرانە زیرەکاتی وشەهرەزایی وپەهلەوانی لەورا قەستا وێ شیڤا ترس کریە وکیانەوەرێن هرج روژ بو روژێ کێم بون تا دوماهیێ چ کیانەوەر لێ نەماین وئەو شیف بوو تاخەکێ سەرەکی ژ تاخێن کوندێ بامەرنێ. لڤێرە بومە دیاربیتن کو مالا محێ ئەکەرەکێ سەرەکی بویە یو بەرفرەهکرنا سنورێن کوندێ بامەرنێ ئەوژی زێدەبونا تاخێ شیڤاهرجا بوسەر کوندێ بامەرنێ؛ وئەکەرێن قەستکرنا بابیرێن مالا محێ بو شیڤا هرجا جونکە کەلەکا مفابویە بو خودانکرنا تەرش وتەوالی وجهەکێ بەرفرەهـ شینکاتی وتێر ئاڤ بوویە، وتایبەتی مالا محێ ل بنارا جیادرکی ئاکنجیبون ئەوا دکەڤیتە روژهەلاتێ تاخێ شیڤاهرچا. وهەمی سەروك خێزانێن بنەمالامحێ نێزیك ئیك وبرەخئێکڤە خانیێن خو ئاڤاکرن ونوکەژی شینوارێن ئاڤاهیێن خانیێن مالامحێ لسەر رویێ ئەردی ئاشکرانە ئەڤ چەندەژی دبیتە باشترین گروڤە وبەلکەنامە بودیارکرنا راستیەکێ دناف بەرپەرێن دیروکا بامەرنێ ب کشتی ودیروکا مالامحێ تایبەتی پێشکێشی دیروکڤانان بکەتن کو دکەڤندا خێزانێن بنەمالا محێ هەمی بێکڤە ژیان ل هەرجهەکێ لێ جهواربون؛ وتفاق وئێك دەست وئێك دل بویە وخودان وسەروکێ خویێ بنەمالێ هەبویە وجڤاتەکا تایبەت هەبویە پێکدهات ژریهسبی ودانعەمرێ مالا محێ وبریارێن جڤاتێ هەردەملدەست دهاتنە جێبەجێکرن دناف بنەمالێدا و کودندیدا وکشت دەڤەرا ئامێدیێ دبەرژەوەدنیا

کشت خەلکێ دابویە، جونکە بنەمالا محێ دهاتە نیاسین ببنەمالا ئێکە وسەرەکی ل دەڤەرا بامەرنێ وجڤاتا بنەمالا ناڤبری رێزەکا تایبەت هەبویە لجەم سەروک هوزێن هەمی دەڤەرێن دویربیانی ولجەم کشت خەلکێ دەڤەرا ئامێدیی.

# پرسیار و وەڵام

ئامادەکردنی : د. محمد عبدالله کاکەسوور

پ١ – حازم شمدین ئاغا لەچ ساڵێك لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٨٩٥.

پ٢ – حازم شمدین ئاغا لەچ ساڵێك مردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٥٤.

پ٣ – ناوی تەواوی حازم شمدین ئاغا چی بوو ؟

و : حازم کوری یوسف پاشا کوری شمدین ئاغا.

پ٤ – حازم شمدین ئاغا لەکوێ لەدایك بوو ؟

و : لەزاخۆ.

پ٥ – حازم شمدین ئاغا چەندین جار بووتە نوێنەری چ شارێك لەپەرلەمانی عێراق لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ؟

و : نوێنەری شاری موسڵ.

پ٦ – حوسنی زەعیم لە چ ساڵێك لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٨٩٧.

پ٧ – حوسنی زەعیم لە چ ساڵێك مردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٤٩.

پ٨ – لە چ رێککەوتێك حوسنی زەعیم بوو بەسەرۆك کۆماری سوریا ؟

و : لە٢٦ی حوزەیرانی ١٩٤٩.

پ٩ – لە چ ڕێککەوتێك حوسنی زەعیم لەسەر دەستی هەندی لە لایەنگرانی و بەسەرکردایەتی سامی حناوی کوژرا ؟

و : لە١٤ی ئابی ١٩٤٩.

پ١٠ – حوسنی زەعیم ماوەی چەند ڕۆژ بەشێوەیەکی ڕەها فەرمانڕەوایی سوریای کرد ؟

و : ١٣٦ ڕۆژ.

پ١١ – ناوی تەواوی خالد بەکداش چی بوو ؟

و : خالد کوری محەمەد بەکداش قوترش.

پ١٢ – خالد بەگداش لەچ ساڵێك لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٩١٢.

پ١٣ – خالد بەگداش لەکوێ لەدایك بووە ؟

و : لە (حی الاکراد) گەڕەکی کوردان لەدیمەشق لەدایك بووە.

پ١٤ – خالد بەگداش لەچ ساڵێك مردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٩٥.

پ١٥ – ئەو کوردە کێ بوو بوو بەئەمینداری گشتی پارتی شیوعی سوری ؟

و : خالد بەگداش.

پ١٦ – کێ نازناوی شێخی شیوعییە عەرەبییەکانی پێدرابوو ؟

و : خالد بەگداش.

**پ١٧ – خالد بەگداش لەچ گۆرستانێك نێژراوە ؟**

**و : گۆرستانی شێخ خالدی نەقشبەندی.**

**پ١٨ – لەچ ساڵێك دواود پاشای حەیدەری لەهەولێر لەدایك بووە ؟**

و : لەساڵی ١٨٨٦.

پ١٩ –لەچ رێککەوتێك داود پاشای حەیدەری لەئەستەمبۆڵ مردووە ؟

و : لە٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٦٥.

پ٢٠ – ناوی تەواوی دوریە عەونی چییە ؟

و : دوریە محەمەد عەلی عەونی سویرکی.

پ٢١ – دوریە عەنی لەکوێ لەدایك بوود ؟

و : لەقاهیرە.

پ٢٢ – ناوی دایکی دوریە عەونی چییە ؟

و : زەینەب محەمەد رەفاعی.

پ٢٣ – دوریە عەونی چەند برای هەیە ؟

و : دووبرا کەئەوانیش سەلاحەددین عەونی , و حیسامەددین عەونی , و هەردووکیان ئەندازیارن.

پ٢٤ – ناوی مێردی یەکەمی رەبیعە خاتونی خوشکی سەلاحەددین ئەیوبی چی بوو ؟

و : سەعددین مەسعوود.

پ٢٥ – لەچ ساڵێك زوبێر بیلال ئیسماعیل لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٩٣٨.

پ٢٦ – لەچ ساڵێك زوبێر بیلال ئیسماعیل مردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٩٨.

پ٢٧ – لەچ ساڵێك سەعید نورسی لەدایك بوو ؟

و : لەساڵی ١٨٧٣.

پ٢٨ – ناوی تەواوی سەعید نورسی چی بووە ؟

و : سەعید کوری سۆفی میرزا نورسی و بە بەدیع لزەمان (بدیع الزمان) ناسراوە.

پ٢٩ – ئایا حاجی قادری کۆیی ژنی هیناوە ؟

و : نەخێر.

پ٣٠ – ئایا سەعید نورسی ژنی هێناوە ؟

و : نەخێر.

پ٣١ – سەلیم بەرەکات لەچ ساڵێك لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٩٥١.

پ٣٢ – سەلیم بەرەکات لەکوێ لەدایك بووە ؟

و : قامشلی.

پ٣٣ – عەبدولباسیت عەبدولسەمەد لەچ ساڵێك لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٩٢٧.

پ٣٤ – عەبدولباسیت عەبدولسەمەد لەچ ساڵێك مردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٨٨.

پ٣٥ – ئەو شاعیرە کێ بوو لەسەردەمی کۆماری کوردستان نازناوی شاعیری میللی لەلایەن قازی محەمەدەوە پێ بەخشرا ؟

و : هەژاری موکریانی.

پ٣٦ – لەچ رێککەوتێك مەحەمەدی مەلا کەریم لەدایك بووە ؟

و : لە ١٥ / ٨ / ١٩٣١.

پ٣٧ – ئەو ئافرەتە کوردە کێ بوو کەلەدەوروبەری ساڵی ١٩٠٩ زەوییەکی زۆری کردە وەقف لەسەر زانکۆی میسری و برێکی زۆری لە خشڵو زێری خۆی پێشکەش کرد بۆ بنیات نانی زانکۆی میسری ؟

و : فاتیمەی کچی خدێوی ئیسماعیل کوری محەمەد عەلی پاشا.

پ٣٨ – لەچ ساڵێك دكتۆر كامەران بەدرخان لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٨٩٥.

پ٣٩ – لەچ ساڵێك دكتۆر كامەران بەدرخان كۆچی دوایی كردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٧٨.

پ٤٠ – ئەو ئەندامەی بنەماڵەی بەدرخانییەكان كێ بوو كەنوێنەری مستەفا بارزانی بوو لە ئەوروپا ؟

و : دكتۆر كامەران بەدرخان.

پ٤١ – لەچ ساڵێك شێخ محەمەد عەبدە لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٨٤٩.

پ٤٢ – گۆری قازی محەمەد لەچ شارێكی كوردستانە ؟

و : لەشاری مهاباد.

پ٤٣ – هەژاری موكریانی خەڵكی چ گوندێكی كوردستان بوو ؟

و : گوندی شەرەفكەندی.

پ٤٤ – لەچ ساڵێك شێخ محەمەد عەبدە مردووە ؟

و : لەساڵی ١٩٠٣.

پ٤٥ – ناوی تەواوی شێخ محەمەد عەبدە چی بووە ؟

و : شێخ محەمەد عەبدە كوری حەسەن خەیروڵلاكوردی.

پ٤٦ – لەچ ساڵێك شێخ محەمەد عەبدە بوو بەمفتی میسر ؟

و : لەساڵی ١٨٨٩.

پ٤٧ – لەچ ساڵێك محەمەد عەلی پاشا لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٧٦٩.

پ٤٨ – لەچ ساڵێك محەمەد عەلی پاشا مردووە ؟

و : لەساڵی ١٨٤٩.

پ٤٩ — ناوی تەواوی محەمەد عەلی پاشا چی بوو ؟

و : محەمەد عەلی پاشا کوری ئیبراهیم ئاغا.

پ٥٠ — کێ بەدامەزرێنەری میسری نوێ دادەنرێ ؟

و : محەمەد عەلی پاشا.

پ٥١ — لەچ ساڵێك شافاروقی دواشای میسر لەدایك بووە ؟

و : لەساڵی ١٩٢٠.

# میرنشینی سۆران

بەیار نادر

## بەشی یەکەم

تەوەرەی یەکەم : بار و دۆخی کۆمەڵایەتی

باسی یەکەم : باری هۆزایەتی و داب و نەریتی دانیشتوان

باسی دووەم : شێوازی جل و بەرگیان

باسی سێیەم : ڕەوشی ڕۆشنبیری و خوێندن

باسی چوارەم : ڕەوشی ئایینی

**باسی یەکەم : باری هۆزایەتی و داب و نەریتی دانیشتوان**

سروشتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی میرنشینی سۆران جیا نیە لەسروشتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری. کەلەسەردەمانی کۆنەوە لەسەر بناغەی پاشماوەی بەهێزی هۆزەکی دامەزراوە. ئەو پەیوەندییە هۆزەکییەش نەك تەنیا دەستی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی کۆچەرەکان و نیمچە کۆچەرەکان داگرتبوو؛ بەڵکو دەستی بەسەر ژیانی کۆمەڵگای نیشتەجێبووەکانیش گرتبوو[1]؛ زۆر جار ئەو هۆزانە لەنێوان یەکتر کۆك و زۆر جاریش ناحەزی یەکتر بوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دۆست بوون و ئامادەبوون لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی بالادا کۆببنەوە کە سەرکردایەتیان بکات، هەر بۆیە میرەکانی سۆرانیان زۆر خۆشویستووە. ئەگەر تەماشای باری هۆزایەتی و دابەشبوونی ناوچەکە وەك دەردەکەوێت ژمارەیەکی زۆر هۆزی جیاجیا لەناوچەکە هەن، لەچاو ئەو بارە

هۆزایەتی یە کێشە و ململانێ زۆر کەمە و زیاتر بەیەکەوە ژیان و هاوکاری یەکتری[٢] کردن بووە.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە لەسەنجەقی ڕەواندز هۆزەکانی (شیوە سووری، پیرە سەنی، راوێندوك، ڕەواندی) دەژیان، عەشیرەتی ڕەواندی بەگەورەترین عەشیرەتەکانی سەنجەقی ڕەواندز دادەندرێت کە لە (١٢) تیرە پێك هاتبوو (مام گێرد، مام سام، مام ساڵ، مام باڵ، مامەکاڵ، مام سیل، مام لیس، مام سەکی، مامەخاڵ، مامویی، پیر باڵ، کەلو)[٣] جگە لەمانەش چەند تیرەیەکی تریش لەچوار چێوەی یەکێتی هۆزی ڕەواندی دابوون وەك تیرەکانی (شەیخاب، مالیباس، نوریك، گەنارای، خەیلانی، کاسان، شێخ موشەمەدی، بامامی، دەرێژکی، سەکوی، شاقوڵی، گێربوی، مەندیك، پیرازی، بای مار)، هەروەها لەسەنجەقی هەریر نزیك ڕەواندزیش ئەم هۆزانە دەژیان (هەرکی کۆڕێ، ئیسیدێرێ، بێرکێ، خەیلانی، باڵەکی بارزان، زیداری، هارونی، باوییان، فەیرۆزی)[٤].

جگە لەو هۆز و تیرانەی سنوری دەسەلاتی میرنشینی سۆران لەسەردەمی (میرمحەمەد)(٦) هۆزی تر هەبوون لەسنوری میرنشینەکە لەسەردەمی میر محەمەد کەبەو جۆرە دابەش ببوون :

١- باڵەك : دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ڕەواندز، ژمارەی ماڵەکانی (٢) هەزار ماڵ بونە، کەبە یاسای ئەو کاتی دەبێ (١٠)هەزار کەس بوبێ.

٢- سورچی : دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕەواندز، لەوبەر و ئەو بەری زێی بادینان، ژمارەی ماڵەکانی (٣)هەزار ماڵ بووە، کەئەکاتە (١٥)هەزار کەس.

٣- برادۆست : دەکەوێتە سەروی ڕەواندز، وەژمارەی ماڵەکانی هەزار ماڵ بووە، کەئەکاتە (٥) هەزار کەس.

٤- خۆشناو : دەکەوێتە خوارووی ڕەواندز، ژمارەی ماڵەکانی (٢) هەزار ماڵ بووە، کە دەکاتە (١٠)هەزار کەس.

٥- شێروانی : لەسەرووی ڕۆژئاوای ڕەواندزن، ژمارەی ماڵەکانانی (٣٣٠٠) ماڵ بووە، کەئەکاتە (١٦٥٠٠)کەس.

٦- ئاکۆ : جێگای نێوان ڕانیە و هۆزی باڵەکە، ژمارەی ماڵەکانی دەوروبەری (٣)ماڵ بووە، کەدەکاتە (١٥)هەزار کەس.

شاری ڕەواندزیش لەسەردەمی میر محەمەد ژمارەی ماڵەکانی (٢)هەزار ماڵ بووە، کەئەگەر بەرێژەی هە (٥)کەس بۆماڵێك دابندرێت ژمارەی دانیشتوانی دەکاتە (١٠) هەزار کەس، وەژمارەی گشتی هۆز و تیرەکان لەسنوری ڕەواندز نزیکەی (٤٠)هەزار ماڵ بووە[٥].

پێکهاتەی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بوو، سێ چینی جیاواز هەبوون، یەکەمیان باڵا دەست بوون کەپێك هاتبوون لە بنەماڵەی میر و دەستەیەك لەزانا و سەرۆك هۆزەکان، چینی دووەم ئەوانە بوون کەبەشێوەیەکی تایبەت لەشار دەژیان وەکو شاری ڕەواندز ئەمانەش پیشەوەرەکان و ئەو کەسانە دەگرێتەوە کەبە ئیش و کاری کرین و فرۆشتنەوە خەریك بوون ئەم چینە ژیان و گوزەرانیان لەچینی جوتیارەکان باشتر بوو کە چینی سێیەمیان پێك هێنا بوو لەمیرنشینی سۆراندا[٦].

(روس)[٧] دەربارەی خەڵکی ناوچەکە دەڵێ : "..... سڵاو لەیەك کردنیان شتێکی سەیرە، قۆڵی ڕاستی یەکتر دەگرن و دەست ماچ دەکەن، وەك هەموو چیا نشینێك باوەڕێکی بەهێزیان بە خەرافیات هەیە، کەهەرگرد و هەر لوتکەیەك خێوی خۆی هەیە، هەروەکو گوایە لەنزیك ڕەواندز ئەشکەوتێك هەیە پڕە لەخێو، هەروەها (روس) لەکاتی گەڕانەوەی بۆ هەولێر لەو ڕێگایەدا بەلای دێیەکدا

گـوزەری کردبـوو بەڕێکـەوت لادەدات و  تەماشـا دەکـات خەڵکەکـە منالـەکانیان دەهێنا بۆ لای پیرە ژنێك دەستی بەسەریاندا دەهێنـا و دوعـا و جـادووی بەسـەر دەخوێندن و موفەکی پێدەدان و [8] ئەوانیش پارەیان دەدایێ....."

ڕەشـبەڵەك وەك سـەمایەکی بـەجۆش هێنـەر وابـوو لەبۆنـە و ئاهـەنگی ژن گواستنەوە ژنـان و پیـاوان پێکـەوە هەڵدەپـەرین بـەڵام مـیر محەمـەد قەدەغـەی ڕەشـبەڵەکی ژنـان و پیـاوانی کـرد[9]، سـەبارەت بـە پلـە و پایـەی ئـافرەت لەمێرنشینی سۆراندا لەسەردەمی (مـیر محەمـەد)خـاوەنی کەسایەت و ئازادی و دەنگی خۆیان بـوون، ژنـانی کـورد لەزۆربـەی ژیـانی ڕۆژانـەی پیاوانـدا بەشـداری هاوسـەرەکانیان کـردووە چ لـەبارەی کـشتوکاڵەوە یـان بریـاری خێزانـی یـان چارەسـەری کێـشە کۆمەڵایەتیـەکان لـە کـچ بەشـوودان و مامەڵەکردنـدا، ژن لەکوردەواری ماڵ و منالّ و هـەموو ئـەرکی خێزانـداری لـەخۆی وەرگرتـوە چـەند ڕۆژهەڵاتناسێکیش باس لەپلە و پایەی ژنی کوردی

دەکەن وە هەروەها دەڵێن : کورد زۆر ڕێـزی ژن دەگـرێ بـە پێـچەوانەی گـەلانی تـری ڕۆژهـەڵات ڕێزگرتنـی پربەپێـستی خـۆی، ژنـی کـورد بـەپێی بـار و دۆخـی کۆمەڵایەتی کـورد نـەیتوانیوە ڕوو پـۆش بپۆشـێت لەبـەر ئـەوەی لەگـەڵ ئـەرکی ئابوری و سەربازی نەگونجاوە[10].

باسی دووەم : شێوازی جل و بەرگیان

دکتۆر روس لەبارەی جل و بەرگی خەڵکی میرنشینەکەدەڵێ : جـل و بـەرگی دەوڵەمەندەکان لەجل و بەرگی بەغدایـیەکان دەچـێ بـەڵام هـەژارەکان پۆشـاکی کورت و شەرواڵی خوری کورتەکی لباد دەپۆشن و کوش و کـڵاش لـەپێ دەکـەن،

ئافرەتەکانیشیان چەفتتە دەدەن بە کۆلّیان دا و لەدوو لاوە گرێی دەدەن، تاس کڵاوی بەپولەکە و لیرەی زیوو لەسەر دەکەن [11].

ئەندامانی (کۆمیتەی سەرداران) بەرگی تایبەتیان لەبەر دەکرد، لەبان سەر و پێچەکەیان دوو قەیتانی سپی و ڕەش دوورابوون لای ڕاستی سەر و پێچەکەیان کەمێك درێژتر بوو [12]. هەرچی جل و بەرگی سوپا یوو بۆ سەرهەنگان رانك و چۆغەی مەرەزی کەخەتێکی سپی و یەکی ڕەشی پێوە بوو لەبەیان دەکرد لەگەڵ کڵاوی لبادی ڕەنگ خاکی یان لەبەر دەکرد، میر و سەرهەنگی سەرهەنگان کارپەزیر شالی ئورمەیان لەسەر دەنا / میر کەوڵی سەمورو سەرهەنگ و ئەوانی تر پەستەکی درێژی هەتا سەر ئەژنۆیان لەبەردەکرد، میر چوار کەسی هەبوو بە تۆپزی زیوو لەپێش میر دەرۆیشتن لەسەرادا هەر ئەوان رێگای چونە ژوورەوەیان هەبوو پاشماوەی کۆنە جل و بەرگی میر ئەوان بوو [13].

باسی سێیەم : ڕەوشی ڕۆشنبیری و خوێندن.

حسێن حوزنی دەڵێت : میر محەمەد دەستی کرد بە دروستکردنی پرد و مزگەوت و قوتابخانە بەلاّم باس لە جۆری قوتابخانەکان ناکات، دکتور روس دەڵێ : میر محەمەد لەگەڵدا کردم دەربارەی ڕێگای فێرکردن لە (ئینگلتەرا) ئەمەش بەڵگەیە بۆ گرنگی پێدانی میر محەمەد بە ڕۆشنبیری و زانست.

پێویستە ئەوش بزانرێ میر محەمەد کەسێکی نەزان نەبوو بەڵکو ڕۆشنبیریەکی ئاینی باشی هەبوو بەلاّم سەرەرای ئەو گرنگی دانە بە ڕۆشنبیری و زانست ئاستی ڕۆشنبیری خەڵکەکە نزم بووە [14]، هەروەها میر محەمەد خۆشەویستیەکی زۆری هەبووە بەرامبەر بەزانست و زانایان، کاتێك دەستی بەسەر شاری هەولێردا گرت و چووە ناویەوە گوتی : هەکەسێك لەمزگەوت دابنیشێت بەبێ هەوڵدان بۆ

فێربوونی زانست یا لەم شارە دەربچێت چونکە من زانستم دەوێت و پێویستم بەتەریقەت نیە، ئەو مزگەوت و قوتابخانانەی لەشارەکان و گوندەکان دروستی کردبوون میر محەمەد زانایانی تێدا دامەزراند بۆ فێربوونی هەموو خێڵە موسڵمانەکان و موچەی مانگانەی بۆیان دابین کرد[15].

میر محەمەد پەیوەندی باشی هەبووە لەگەڵ شاعیران و هونەرمەندان و زانایان هەردەم هاندەر و پشتگیرییان بوو و لەدەوروپشتی کۆببونەوە [16]، لەوانە زانای گەورە (محەمەد ئیبن ئادەم)[17] کەلە سەردەمی میر محەمەد لەڕەواندز جێنشین بووە و خەریکی وانە بێژی و نوسین بووە لە هۆنینەوەی شیعریش بە توانا بووە و نازناوی شیعری [18] (واجم)ە. ئیبن ئادەم یەکێك بووە لەو زانا و مامۆستایانە کە عیلمدار و زانایانی جیهان لای ئەو فێری زانست و زانیاری بوون، وەك زانست و زانیاری وەکو زانستی گەردوون و بیرکاری [19] و ئەندازە.هەروەها (محەمەد نیگاری) شاعیری میر محەمەدی ڕەواندز بوو، ڕوودا و بەسەر هاتەکانی پاشای گەورەی بە شیعر نوسیووە بەڵام نوسراوەکان بەهۆی ڕووداوەکانی ڕەواندز وونبوون و نەماون[20].

### باسی چوارەم : ڕەوشی ئایینی

سەبارەت بەلایەنی ئاینی لەمیرنشینی سۆران لەسەردەمی میر محەمەد دا، وەدانیشتوانی میرنشینەکە موسوڵمانی سونە مەزهەب بوون[21]، میر خۆی موسوڵمانێکی و دیندار بووە[22] وەباوەڕێکی پتەوی تەواوی بە ئاینی ئیسلام هەبوو[23]، وەرێزێکی زۆر و بێ ئەندازەی لەمەلا و پیاوە ئایینیەکانیان ئەگرت[24].

لەسەردەمی میر محەمەد پیاوانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز ڕۆڵێکی بەچاویان هەبووە و خاوەن پێگەی تایبەت بوونە لەلای میر محەمەد تاکو گەیشتۆتە پلەی

دەسەڵات و فەرمان دەرکردن، میر و پیاوانی ئاینی بەیەکەوە کاروباری میرنشینیان هەڵدەسوراند بەپێی میتۆدێکی ئاینی کەبریتی بوو لەقورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ) میر محەمەد دوو راوێژکاری هەبوو کە یەکێکیان (مەلا محەمەدی خەتێ) ئەویترشیان (مەلا یەحیای مزوری) بوو. مەلامحەمەدی خەتێ موفتی میرنشین بوو[٢٥].

میر محەمەد هیچ جوڵانەوەیەکی بەبێ فتوا و رای زانایان نەئەکرد وەیاسای ئەو قورئانی پیرۆز و شەریعەت بوو، رێکخستنی ئەمن و ئاسایش لە میرنشینی سۆران بەتەواوی پێچەوانەی وولاتانی دراوسێ وەکو بەغدا بوو کەلەیاساو شەریعەت بێ بەش بوون[٢٦]، دکتۆر روس هیچ لەوبارەیەوە ناگێرێتەوە بەولام کەباس لەسزاکان دەکات وەك برینی دەست لەکاتی دزی کردن دا وەبرینی یەکێك لەقاچەکان لەکاتی هەڵاتن دا لەبەرەکانی جەنگ کەوئەم سزایانە جێ بەجێ کرابێت دەتوانین بڵێین شەریعەتی ئیسلامی لەحوکمی میردا جێ بەجێ کراوە[٢٧].

سەرچاوەکان باس دەکەن کە لەپایتەختی میرنشینی سۆران کە شاری (ڕەواندزە) پێش نوێژ بەچارەگە سەعاتێك (جۆق و مۆسیقا) لێدەدرا، لەکاتی نوێژیش تۆپچی تۆپێك دەیهاوێت و ئاگر هەڵدەکات[٢٨]، میر مزگەوتێکی گەورەی لەناوەراستی شاری ڕەواندز دروست کردووە وە زانا و لێهاتوانی تێدا کۆکردۆتەوە[٢٩]، هەروەها باس لەوە دەکرێ کە میر رەشبەڵەك و هەموو جۆرە تێکەڵ بوونێکی لەنێوان ژن و پیاو کەپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بێت قەدەغەکردهەروەها دانیشتنی لەمزگەوت قەدەغەکرد جگە لەپەرستن[٣٠].

روون و ئاشکرایە کە میر محەمەد هێرشێکی کردە سەر ناوچەی ئێزدیەکان ئەمەش کاتێك کەمەلای خەتێ فەتوای بۆدا کە خوێنی ئێزدیەکان حەڵاڵە[٣١]، بە

گوێرەی سەرچاوەکان کەباسی لێوە دەکەن کە دەمارگیری ئایینی وای لە میر محەمەد دکردووە خەڵکی ئێزدی کۆمەڵ کوژ بکات جگە لە (٥٪)یان کەرزگاریان بوو، ئەوانی تری هەمووی کوشتووە، وە باس دەکرێ کەبەهۆی دەمارگیری ئاینیەوە فەلەکانی کوشتووە[٣٢]، هەروەها مینورسکی دەڵێت : زۆر جار ئێزدیەکان دووچاری لێدان و ئەشکەنجەدان بونەتەوە و تەنانەت گەورەکەیان کە (علی بەگ) بوو لە سێدارە دراوە لەلایەن میر محەمەد لەبەر ئەوەی باوەری بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەهێناوە[٣٣].

پەیوەندی میر محەمەد لەگەڵ مەسیحیەکانیش زۆر خراپ بووە لەکاتی هێرشکردنی بۆ سەر گوندی (القوش)[٣٤] دوای تالانکردنی گوندەکە ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکەی کۆشتووە کە مەسیحی بوون لەبەر ئەوەی باوەریان نەهێناوە بەئاینی پیرۆزی ئیسلام[٣٥].

دەربارەی بار و جۆخی جەلەکەکان کەئەو کات لەسنوری میرنشینی سۆران دەژیان زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەر دەستدا نیە تەنها باس لەوە دەکرێ کە خزمەت کاری میر محەمەد جولەکە بووە و میریش زۆر رێزی لێدەگرت سەرەرای ئەوەی جولەکەکان هیچ حسابێکیان بۆ نەدەکرا[٣٦].

پەراوێزەکان

(١) ئەحمەد حەمە ئەمین ئۆمەر، س.پ، ل ١٨.

(٢) کامەران جەمال بابان زادە، س.پ، ل ١١.

(٣) ئەحمەد حەمە ئەمین ئۆمەر، س.پ، ل ١٨ " جەلیلی جەلیلی، س.پ،ل ٣٤.

(٤) جەلیلی جەلیل، س. پ، ل ٣٤.

(٥) مەمدوح مزوری، مێژووی...، ل ١٦-١٧.

(٦) جمال نبز، م.س، ص ١١٩ " سوارە قەڵادزەیی، میرایەتی سۆران چەمکی مەدەنیەت و شارستانیەتی مێژووی ئەم میرایەتیە، مەدەنیەت"گۆڤار"، ژ(٣)، ١٩٩٩، ل ٥٣.

(٧) روس : پزیشکی نشینگەی بریتانی بوو لەبەغدا. فرایزەر، گەشتەکەی فرایزەر بۆ کوردستان و میسۆپۆتامیا ١٨٣٤ز، و: ئومێد ئاشنا، چ(١)، ب.ش، ١٩٩٨، ل ٢٠.

(٨) فرایزەر، س. پ، ل ٢٠.

(٩) مەمدوح مزوری، مێژووی....، ل ٢٢٢ " سوارە قەڵادزەیی، س. پ، ل ٥٨.

(١٠) سوارە قەڵادزەیی، س. پ، ل ٥٦-٥٧.

(١١) فرایزەر، س.پ، ل ٢٦ " زبیر بیلال، أمارة سوران أو رواندز، خبات"جریدە" ع(٨٤٧)، ٢٤/تشرین الاول/١٩٩٩.

(١٢) جلیلی جەلیل، س.پ، ل١٤٢ " ئەحمەد باوەر، میرنشینی سۆران و پەیوەندی نێوان هەردوو مەحمەد پاشای کورد، کاروان"گۆڤار"، ژ(٨)، ١٩٩٣،ل٨.

(١٣) حسێن جوزنی موکریانی، س.پ، ل ٣٩ " زبیر بیلال، أمارة سوران أو رواندز، خبات"جریدە" ع(٨٤٦)، ٢٤/تشرین الاول/١٩٩٩.

(١٤) جمال نبز، م.س، ص ٨٧ " کاوس قەفتان، س.پ، ل ٥٦.

(١٥) طاهر عبدالله سلیمان، م.س، ص ١٧.

(١٦) جلیلی جەلیل، س.ث، ل ١٣٦ " تنظیمات الامیر محمد باشا العسکریة والاداریة في الامارة السوران، کاروان "مجلة"،ع(٨٧)، اربیل،١٩٩٠،ص ١٥٨.

(١٧) محەمەد ئیبن ئادەم، ناوی محەمەدی کوڕی ئادەمی کوڕی عبداللهیە لە دەوروبەری (١٧٤٧)ز لەگوندی (روستێ)سەر بەناحیەی (باڵەک) لەدایک بووە لەساڵی (١٧٧١)ز بۆ فێربوونی زمانی (فارسی)چۆتە(مەهاباد) لەساڵی (١٨٣٦)ز لە گوندی (دێڵزێ)کۆچی دوایی کردووە. ئەحمەد عوسمان، کورد و کوردستان لەکۆمەڵە وتارێکی مێژوویدا، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ١٦٨.

(١٨) هـ. س، ل ١٦٨.

(١٩) مەمدوح مزوری، بنەماڵانی بەناوبانگی ڕەواندز، چ/١، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٣.

(٢٠) هـ. س، ل ٢١٧.

(٢١) کامەران جەمال بابان، س.پ، ل ١٠.

(٢٢) ئارشاك سافراستیان، کورد و کوردستان، و: ئەمین شوان، چ(٢)، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٧٨.

(٢٣) محەمەد حەمە باقی، س.پ، ل ١٤٥ " نەوشیروان مستەفا ئەمین، س.پ،ل ١٤٢.

(٢٤) نەوشیروان مستەفا ئەمین، هـ. س، ل ١٤٣.

(٢٥) غازی حارس ڕەواندزی، کورتەیەکی مێژووی میرنشینی سۆران، کاروان "گۆڤار"، ژ(١٢٥)، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٤٣ " جمال نبز، م.س، ص ٤٥.

(٢٦) محەمەد ئەمین زەکی، س.پ، ل ٤٣ " مەلاخالید فریزی، پوختەیەك لەمێژووی کورد لەسەرەتاوە تا ئێستا، س.پ، ل ١٦٠.

(٢٧) جمال نبز، م.س، ص ٦٢ " صالح قەفتان، س.پ، ل ٢٣٢ " محەمەد فیدا، پاشای کوێرەی ڕەواندز، ڕۆژی نوێ "گۆڤار"، ژ(٩)، سلێمانی، کانونی یەکەمی ١٩٦٠، ل ١٨.

(٢٨) فرایزەر، س.پ، ل ٣٢ " بەبێ ناوی نوسەر، میری ڕەواندوز، دەنگی مامۆستا "گۆڤار"، ژ(٣)، سلێمانی، ١٩٧١، ل ٤٤ " بەدرخان سندی، کۆمەڵگای کوردی لەدیدی ڕۆژهەڵات ناسیدا، و: ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید، چ(١)، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨، ل ٣٨٥.

(٢٩) زبیر بیلال أسماعیل، أمارة سوران او رواندز، خبات"جریدة" ع(٨٣٤)، ٢٢/تموز/ ١٩٩٧.

(٣٠) حسێن حوزنی موکریانی، س.پ، ل ٢٠ " طاهر عبدالله سلیمان، م.س، ص ١٥ " کاوس قوفتان، س.پ، ل ٥٦.

(٣١) سعدی عثمان هروتی، کوردستان والأمبراطوریة العثمانیة، ط(١)، مطبعة خانی، ٢٠٠٨،ص ١٩٢.

(٣٢) سەعد بەشیر ئەسکەندەر، سیستەمی میر نشین لە کوردستان، و:جەعفەر کرمانج، چ (١)، ب.ش، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٠٠ " حسێن مەدەنی، کوردستان و ئیستراتیژی دەوڵەتان، چ(١)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ١٣٤.

(٣٣) جمال نبز، م.س، ص ٦٦.

(٣٤) القوش : گوندێکە سەر بە قەزای شێخان. ن.م، ص ٦٦.

(٣٥) جمال نبز، م.س، ص ٦٧

(٣٦) م. ن، ص ٦٨.

# ناوی نوێنەرانی لیوای هەولێر لەئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی لەسەردەمی شایەتی (١٩٢٥ — ١٩٥٨)

ئامادەکردنی : نازدار جلیل مصطفی

١ — ابراهیم یوسف
٢ — أحمد عثمان
٣ — أحمد محمد علی
٤ — اسماعیل رەواندوزی
٥ — أمین زکی
٦ — جلال بابان
٧ — جمال بابان
٨ — جمال عمر نظمی
٩ — جمیل حەوێزی
١٠ — جمیل گەردی
١١ — حسێن ی مەلا
١٢ — حمدی سلیمان
١٣ — حەوێز ئاغا
١٤ — خدر احمد

٢٢ — عبدالغنی مفتی
٢٣ — صدیق مظهر
٢٤ — عبدالله مخلص
٢٥ — عزالدین ملا
٢٦ — عطاالله رشید
٢٧ — علی حاجی احمد
٢٨ — علی حیدر سیمان
٢٩ — علی دۆغرەمەچی
٣٠ — فتاح هەرکی
٣١ — قادر خۆشناو
٣٢ — محمد باڵەك
٣٣ — محمد زیاد
٣٤ — محمد عبدالله
٣٥ — محمد علی رەواندوزی

١٥ – داود حیدری

١٦ – زید احمد عثمان

١٧ – سلیمان فتاح

١٨ – صبیح نشأة

١٩ – صدیق طه

٢٠ – صدیق قادر

٢١ – صلاح بابان

٣٦ – محمد علی محمود

٣٧ – محمود نقیب

٣٨ – محمود خەلیفه

٣٩ – مسعود محمد

٤٠ – معروف پیرداود

٤١ – معروف چیاووك

٤٢ – یحیی عبدالله

سەرچاوە :

علی صالح الكعبي , نواب الوية اربيل والسليمانية في مجلس النواب العراقي في العهد الملكي (١٩٢٥–١٩٥٨) الطبعة الاولى , ٢٠٠١ , دار الينابيع للطباعة والنشر والتوزع السويد – ستوكهولم .

ئەم وتارە لە گۆڤاری رامان- دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی گولان، ژمارە (٤١) ساڵی ١٩٩٩، پ ٢٧-٢٩ بڵاوکراوەتەوە. بەڵام لەبەر گرنگی بابەتەکە و لەبەرئەوەی چەند پرۆژەیەکی ئینسکلۆپیدیا ئەنجام دراون و هی تر کاری لێدەکرێ لە دوای پرس کردن نووسەری بەرێز بە پێویستمان زانی بڵاوی بکەینەوە.

پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین

# ئینسایکلۆپیدیای کوردستان... ئاواتێکە

تا ئێستا چەن کارێ بەناوی ئینسایکلۆپیدیایەوە کەوتوونەتە کتێبخانەی کوردییەوە[1]... ئەمانە هیچ کامێکیان بەر چەمکی ئینسایکلۆپیدیا ناکەون و هیچ لە ئامانجەکانی جێبەجێ ناکەن... هەموو ئەرکی دڵسۆزیی تاکە کەسێن و هەوڵی سەرەتایی سادەن.

ئەگەر جاران تاکە کەسێ بۆی هەبوو خۆی لە دانانی ئینسایکلۆپیدیای گشتی بدات... ئێستا کە سەردەمی تەقینەوە و لافاوی زانیارییە... تاکە کەسێ هەرچەن بلیمەت و شارەزا و بەتوانین بێ، هەرچەن کات و وزەی بۆ تەرخان بکات هەرگیز دەرەقەتی نایێ.

ئینسایکلۆپیدیای گشتی پرۆژەیەکی یەکجار فراوان و گەورە و مەزنە... بۆ وەدیهێنانی دەبێ دامودەزگای تایبەتیی بۆ تەرخان بکرێ... تێیدا بەسەدان شارەزا و پسپۆڕ بەپێی پلان و نەخشەیەکی ستراتیجیی دوورخایەن و روون و دیار و ئامانجدار کار بکەن.

ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ پێناسێن و خستنەروویەکی خێرایی مێژووی ئینسایکلۆپیدیا و پێشنیارێکە بۆ سەرنج ڕاکێشانی کاربەدەستان بەڵکو بیر لە پرۆژەی دانانی (ئینسایکلۆپیدیای کوردستان) بکەنەوە. ئەمە لەم سەردەمەی ئێستاماندا پێویستییەکی نەتەوەیی یەکجار گرنگە و بەڵگە و نیشانەی قۆناغێکی پێشکەوتووی ڕۆشنبیرییە.

ئینسایکلۆپیدیا کتێبێکە یا زنجیرە کتێبێکە زانیاریی تێدا لە بارەی زانست و خەڵک و هونەر و ئەدەب و فەلسەفە و شوێن و... تاد تۆمار دەکرێ و بەپێڕەو و هونەرێکی تایبەتی ڕیز دەکرێن و پێشکەش دەکرێن.

زاراوەی ئینسایکلۆپیدیا لە ئەژاددا لەم دوو وشە گریکییەوە Enkyklios Paideia وەرگیراوە و دارێژراوە، کە واتای (زانیاریی دەستاودەست) دەگەیەنن.

ئەوەی بیەوێ هەر زانیارییەکی لە بارەی هەر شتێ یا هەر بابەتێ دەستکەوێ... دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر ئینسایکلۆپیدیا و ئەم ویستەی خۆی زۆر بەئاسانی بێنێتە دی بۆیە ئینسایکلۆپیدیا گرنگێتییەکی یەکجار زۆری هەیە بۆ بواری ئەکادیمی و ڕۆشنبیریی گشتی. پێویستە هەر ڕۆشنبیر و زانستخوازێک لە بەکارهێنانی ڕابێ و مامۆستایانی زانکۆ سوود و گرنگێتیی لە قوتابییان بگەیەنن.

ئینسایکلۆپیدیا گەلێ جۆری هەیە... (جیهانی) (گشتی) (تایبەتی)... ئێستا

بەهەزارانی لێ و بەدەیان زمان لەژێر دەستدایە... هەر یەكە لەمانە ئاست و سوود و ئامانجی تایبەتیی خۆی هەیە و بۆ پلەیەكی تایبەتیی ڕۆشنبیری و ئەكادیمیی دەست دەدا.

هەیە بابەتەكانی زۆر بەقوولی و فراوانییەوە پێشكەش دەكات... هەشە زۆر بەكورتی و سادەیی.

ئینسایكلۆپیدیای (جیهانی) بۆی هەیە باسی هەموو شتێكی ئەم سروشتە بكات. هی (گشتی) تەرخانە بۆ بوارێك وەك (زانست)، (ئۆقیانۆس و دەریاكان) (فڕۆكە)... تاد. كەچی (تایبەتی)یەكە خۆی بەلقێكی بوارێكەوە دەبەستێتەوە... وەك (فیزیا) (فەلسەفەی یۆنانی) (جەنگی دووەمی جیهانی)... تاد.

ئینسایكلۆپیدیا چەند گشتی بێ... گشتیتری هەیە و چەن تایبەتی بێ تایبەتیتری هەیە.

چەن بەرەو گشتێتی بڕوا بابەتەكانی كورتتر و چڕتر دەبن و چەن بەرەو تایبەتێتی بڕوا فراوانتر دەبن.

مێژوونووسانی بیری مرۆڤایەتی، فەیلەسووفی گریكیی سەدەی چوارەمی پێش زایین ئەریستۆتل Aristotle (٣٨٤ - ٣٢٢پ. ز) بەباوك و دامەزرێنەری ئینسایكلۆپیدیا دادەنێن.

(ئەریستۆتل) یەكەم كەس بوو هەولی دا ئەو زانیاری و ڕاستییانەی لەو سەردەمەدا باو و پەرشوبلاو بوون كۆیان بكاتەوە و بەزنجیرەیەك كتێب پێشكەشیان بكات و بیروڕا و بۆچوونی تایبەتیی خۆشی لە بارەیانەوە تۆمار كرد.

دوای (ئەریستۆتل) بەنزیكەی دووسەد ساڵ (ماركۆس تێرینیتەس ڤارۆ Marcus Terentius Varro (١١٦-٢٧ پ.ز) كە نووسەر و زانایەكی ڕۆمانی بوو كتێبێكی نۆ بەرگی لەسەر هونەر و زانست دانا بەناوی Disciplines (بوارەكان). هیچ دانەیەكی ئەمە و ئەوەكەی (ئەریستۆتل) نەماوە و هەر لە ڕێی نووسەرانی دوای خۆیانەوە بەم كارانە زانراوە.

پلینی ئی ئێلدەر Pliny the Elder (٢٣-٧٩ز) نووسەرێكی تری ڕۆمانی بوو كتێبێكی بەناوی (مێژووی سروشتییەوە Historia Naturalis دانا تێیدا بەهەزاران لەتە زانیاری و ڕاستی لە بارەی ئاژەڵ و ڕووەك و خەڵك و شتەوە تۆمار كرد.

ئەمە زۆرتر بایەخی بەو جۆرە بابەت و زانیارییانە دەدا كە بەكەڵك ئەوانە دەهات كە

دەیانوسیست بێن بەفەرمانبەری میری.

ئایسیدۆر Isidor لە ساڵی (٦٢٣)دا ئینسایکلۆپیدیایەکی بیست بەرگی بەناوی ئەتیمۆلۆجیاوە Etymologiarum Libri XX ئامادە کرد. زانا و خوێندەوار و ڕۆشنبیرە ئەوروپاییەکان بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ ئەمەیان وەک سەرچاوەیەکی ڕەسەن و سەرەکی بەکار دەهێنا.

(ابن قتيبة البغدادي) لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا یەکەم ئینسایکلۆپیدیای بەزمانی عەرەبی بەناوی (كتاب عيون الاخبار)ەوە دانا.

لە دەوروبەری ساڵی (٩٩٠ز)دا بوو خوارزمی (مفاتيح العلوم)ی تەواو کرد. هەر لەو سەردەمەدا بوو چەن زانا و ئوتابییەک لە بەسرە (رسائل إخوان الصفا)یان تەواو کرد.

بارتۆلۆمیو دی گلانڤیل Bartholomew de Glanville مامۆستای زانستی ئایین لە پاریس ئینسایکلۆپیدیایەکی بەزمانی لاتینی بەناوی De Proprietatibus rerum لە سەرەتای سەدەی سیانزەهەمدا (لە بارەی شتەکانەوە) دانا... تێیدا زیاتر بایەخی بەبابەتی ئایینی و ڕەوشتی دەدا... زۆری بەسەردا نەچوو وەرگێردرایە سەر زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکان و بۆ سەدان ساڵ وەک سەرچاوەیەکی گرنگ و سەرەکی لە زانکۆکانی ئەوروپا بەکار دەهێنرا.

لە ساڵی (١٢٤٤)دا (ئاوێنەی گەورەتر)ەکەی Speculum maius ڤینسینت بیاوڤایسی Vincent Beauvais دەرکەوت. لە ساڵی (١٢٧٣)دا (ما - توان - لین)ی چینی ئینسایکلۆپیدیایەکی (٣٨٤) بەرگیی بەناوی (لێکۆڵینەوەی گشتیی ڕۆشنبیری)یەوە دانا...

دوای ئەمانە... بەردەوام ئینسایکلۆپیدیای باشتر و ڕێکتر و تەواوتر و بەسوودتر لە دەرچووندا بوو... بەتایبەتی دوای داهاتنی چاپ و پەرەسەندنی هونەری بڵاوکردنەوە و گەشەسەندنی زانست و زۆربوونی زانیاری و ڕاستی لە بارەی سروشتەوە... گرنگیتی و پێویستی بەئینسایکلۆپیدیا زۆرتر دەبوو.

بۆ خۆ لادان لە درێژدادڕی و[٢] پێشکەشکردنی مەبەستەکانی ئەم باسە بەشێوەیەکی ڕوون و ڕاستەوخۆ... ڕووداوە هەرە گرنگەکانی مێژووی ئینسایکلۆپیدیا بەکورتی دەلیستێنین:

| ساڵ | ڕووداوی مێژووی ئینسایکلۆپیدیا |
|---|---|
| ١٥٠٦ | (ڕافاییل مافێ) لە (زانیاریی گشتی)دا بۆ یەکەم جار سەرگوزشتەی ناودارانی خستە ئینسایکلۆپیدیاوە. |
| ١٥٤١ | (ڕینگلبێرگی باسیلی) زاراوەی ئینسایکلۆپیدیای داڕشت وەک ناوێ بۆ ئەوەی بە(کتێبی سەرچاوە) ناو دەبرا. |
| ١٧٠٤ | (جۆن هەریس) لە (فەرهەنگی هونەری)دا... یەکەم ئینسایکلۆپیدیای (کۆکەسی)[٣]ی دانا، تێیدا بۆ یەکەم جار بابەتەکانی لەسەر پێڕەوی ئەلفوبێ ڕیز کرد. |
| ١٧٣٢ | (جۆهان زێدلەر) لە (فەرهەنگی جیهانی)دا... سەرگوزشتەی ناودارانی زیندووی خستە ئینسایکلۆپیدیاوە. |
| ١٧٦٨ | یەکەم بەشی ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی دەرکەوت. |
| ١٨٢٩ | یەکەم بەشی ئینسایکلۆپیدیای ئەمریکی دەرکەوت. |
| ١٨٦٥ | (پییێر لارووس) فەرهەنگی (لوگراندی لارووس)ی دەرکرد. |
| ١٩٠٨ | ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیی منداڵان دەرکەوت. |
| ١٩١٠ | ئینسایکلۆپیدیای ئەمریکی منداڵان دەرکەوت. |
| ١٩١٧ | ئینسایکلۆپیدیای کتێبی جیهانی دەرکەوت. |
| ١٩٤٨ | ئینسایکلۆپیدیای ئۆکسفۆردی بچووک دەرکەوت. |
| ١٩٨٠ | ئینسایکلۆپیدیای ئەکادیمی ئەمریکی دەرچوو. |

ئینسایکلۆپیدیای کوردستان... کۆکردنەوەی سامانی پەرشوبڵاوی نەتەوەیی و مێژووییمانە. دەورێکی هەرە گرنگ و باڵا لە پاراستنی کەلەپوور و مێژوو دەگێڕێ. گەشە بەزمان و ئاستی ڕۆشنبیریی کوردی دەدات و ناسنامەی کوردایەتیمان پتەوتر دەکات.

ئێستا بەسایەی ئەم بارودۆخە تازەیە و ئەم جموجۆڵە گەشە پیرۆزەی جیهانی زانست و ڕۆشنبیریی کوردی کە بۆ یەکەم جارە مێژوو بەخۆوەی دەبینێ و بەسایەی پێگەیشتنی هەزاران ڕۆشنبیر و شارەزا و پسپۆڕ و زانای لێهاتووی بڕوا پتەوی خوێن گەرم... لەگەڵ

پەرەسەندنی کۆمپیوتەر و چاپەمەنیی پێشکەوتوو... بەسایەی ئەمانەوە هەموو ئەنجامدان بەئەم کارە مەزنە گەلێ لە جاران ئاسانتر و ڕێکتر و خێراتر و بەئەنجامترە.

بۆ وەدیهێنانی ئەم پرۆژەیە... دەبێ دامودەزگایەکی تایبەتیی سەربەخۆی بۆ تەرخان بکرێ. شارەزا و پسپۆڕان یاسا و پێڕەوی ناوەوەی بۆ دابنێن و بەڕێوەی ببەن بەسوود وەرگرتن لەو ئەزموونە دوورودرێژە دەوڵەمەندە بەنرخەی مێژووی ئینسایکلۆپیدیای جیهانی و بەهاوکاری لەگەڵ زانکۆکان و کۆڕی زانیاری و یەکیەتی نووسەران و هەموو دامودەزگا ڕۆشنبیرییەکاندا، پلان و نەخشەیەکی روون و دووربین (ستراتیجی) و ئامانجداری بۆ دابنێن و بکەونەکار[٤].

زۆر بەکورتی وەک پێشنیارێکی سەرەتایی سادە هەیکەلی گشتیی دەزگای ئینسایکلۆپیدیا و پلانی کارکردنی دەخەینە ڕوو هیواداریـن شارەزا و پسپۆڕان بکەونە موناقەشە و بەتێبینییەکانیان بەشداری بکەن لە تەواوکردن و پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکانی.

هەیکەلی گشتی دەزگای ئینسایکلۆپیدیاکە شتێکی لەم جۆرەی خوارەوە دەبێ:



**نەخشەی پێڕەوی کارکردن...**

لیژنەیەکی ئامادەکردن دادەمەزرێنرێ... ئەم لیژنەیە سەرەتا بابەتە گشتییەکانی ئینسایکلۆپیدیاکە دەستنیشان دەکات... کە بەشێکی، ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە...

**بابەتە گشتییەکانی ئینسایکلۆپیدیای کوردستان.**




بۆ هەر بابەتێ لێپرسراوێکی شارەزای بابەتەکە دادەنرێ... لێپرسراوەکان هەموو کۆڕی باڵای ئینسایکلۆپیدیاکە پێک دەهێنین...

**هەنگاوەکانی کارکردن بەم جۆرە دەبێ:**

١- لێپرسراوی هەر بابەتێک لیستەیەک بەناوی شارەزا و پسپۆڕانی بوارەکەی خۆی ئامادە دەکات.

٢- پێوەندییان لەگەڵدا دەکات و داوایان لێ دەکات هەریەکە لیستەیێ بەناوی بابەتەکان ئامادە بکات (بۆ نموونە ناوی چیاکانی کوردستان).

٣- لیستەکان دەکرێن بەیەک و وەک فەرهەنگ دەخرێنە کۆمپیوتەرەوە.

٤- ناوەکان بەسەر شارەزا و پسپۆڕاندا دابەش دەکرێن و داوایان لێ دەکرێ وتارێ لەسەر هەر بابەتێ ئامادە بکەن و فیکرەیەکی گشتی لە بارەیەوە پێشکەش بکەن.

٥- دوو شارەزا وتارەکە هەڵدەسەنگێنن و بەپێی پێویست بژار و دەسکاری دەکرێ و پەسندی دەکەن.

٦- دوای بڕیاردان لەسەری لە ڕووی زمانەوە سەیری دەکرێ.

٧- حەواڵەی بەشی چاپ و کۆمپیوتەر دەکرێ بۆ ئەوەی جێی خۆی بگرێ و بپارێزرێ.

بۆ ئەنجامدانی کارەکان... دەیان جۆر نامە و خشتە و فۆرمی چاپکراو ئامادە دەکرێ.

پرۆژەی ئینسایکلۆپیدیای کوردستان... ئەرکێکی نەتەوایەتی و زانستی و کۆمەڵایەتی و مێژووییە... دەبێ هەر ڕۆشنبیرێکی کورد پشگیری بکات و بەشداری تێدا بکات.

ئەمە چەن تێبینییەکی خێرا و پێشنیارێک بوو لە بارەی ئاواتێکەوە... بەڵکو دێتەدی.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

١- لەمانە:

ا- شێخ عەبدولقادر بەرزنجی (١٩٧١) فەرهەنگی زانیاریی یا ئینساکیلۆپیدیای کورد - چاپخانەی ڕاپەڕین سلێمانی.

ب- خوسرەو جاف (١٩٨٩) دائیرەتولمەعاریف چاپخانەی ئەمینداریتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان.

٢- بۆ زانیاریی زۆرتر لە بارەی مێژووی ئینسایکلۆپیدیاوە، سەیری بەرگی (E)ی ئینسایکلۆپیدیای (Britanica) لەژێر ناوی (Encychlopedia) بکە.

٣- (کۆکەسی)م بەرامبەر (تاکە کەسی) بەکارهێناوە.

٤- لە ل (٢١٨)ی بەرگی (E)ی ئینسایکلۆپیدیای (World book)ی ساڵی (١٩٨٢)دا... بەرنامە و هەنگاوەکانی دانانی ئینسایکلۆپیدیا زۆر بەوردی ڕوون کراوەتەوە.

٥- پرۆژەی دانانی ئینسایکلۆپیدیایەک بەکوردی - ئازاد عەبدولواحید ١٩٩٢ - بەدوویەش بلاوکراوەتەوە.

٦- بدرخان السندي (١٩٨٣) القاموس الكردي الموحد حاجة قومية ملحة. گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (٦٠).

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕامان- دەزگای ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندنی گوڵان، ژمارە (٤١) ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە ٢٧-٢٩ بلاوکراوەتەوە.**